

# با لە خزمەت قورئاندا بین !

**نووسینی**
عەلی باپیر

**بڵاوکردنەوەی**
نوسینگەی تەفسیر بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن

**نەخشەسازی ناوەوە و بەرگ**
نەوزاد شەهاوانی

**خەت**
نەوزاد کۆیی

**قەبارەی کتێب**
١٧×٢٤- (٢٩٢) لاپەڕە

**نۆرە و ساڵی چاپ**
دووەم ١٤٣٧ ك - ٢٠١٦ ز

**تیراژ**
٢٠٠٠ دانە

لە بەڕێوەبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان ژمارەی
سپاردنی ( ٦٤٥ ) ی ساڵی ٢٠١٥ ی پێدراوە



**نوسینگەی تەفسیر**
بۆ بڵاوکردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
/TafseerOffice
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا مَّثَانِىَ تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ الزمر.

{ خوا باشترین فەرمایشتی ناردۆتە خوار، کتێبێکە (ئایەتەکانی) وێکچوون، دووبارەبووەوەن، ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەترسێن (بەخوێندن و بیستنی) موچڕکە بە پێستیان دادێ، پاشان پێستیان و دڵیان بەرەو یادی خوا نەرم دەبێ و دەکشێ، ئا ئەوە ڕێنمایی خوایە، هەر کەسێك بیەوێ پێی ڕێنمایی دەکات، وە هەر کەسێك خوا گومڕای بکات، هیچ ڕێنمایی کارێکی نابێ }.

# پێشکەش بێ

به هەموو ئەو براو خوشكانەی كە هەوڵدەدەن بە باشترین شێوە لە قورئان بەهرەمەند بن و، بە چاكترین شێوەش لە خزمەتی دابن و، ئەركەكانی سەرشانییانی بەرانبەر جێ بەجێ بكەن.

ئەوانەی كە:

١- وەك بۆ كتێبی خوا شایستەیە، ڕێزی دەگرن.

٢- بەجوانیی دەیخوێننەوەو گوێشی بۆ دەگرن.

٣- باش لێی ورد دەبنەوەو تێی دەفكرن.

٤- كاریگەریی چاكی لەسەریان هەیەو بەهرەو پەندی لێوەردەگرن.

٥- بۆ پیادەكردنی لە ژیانی تاكیی و خێزانیی و كۆمەڵایەتییاندا، هەوڵی بێ وچان دەدەن و، هەتا بڕستیان هەیە پێ دادەگرن.





# پێشەكی

إنَّ الحَمْدَلِلّهِ نَحْمَدُهُ وَنَسْتَعِينُه وَنَسْتَغْفِره، وَنَعوذُ بِاللهِ مِن شُرورِ أَنْفُسِنا، وَمِن سَيِّئاتِ أعْمالِنا، مَن يَهدِهِ اللهُ فَلا مُضلَّ له وَمَن يُضلِل فَلا هادِيَ لَه، وَأَشهَدُ أَن لا إِلهَ إلاّ الله، وَحْدَهُ لا شَريكَ لَه، وَأَشْهدُ أنَّ مُحمَّداً عَبْدُه ورَسولُه.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ حَقَّ تُقَاتِهِۦ وَلَا تَمُوتُنَّ إِلَّا وَأَنتُم مُّسۡلِمُونَ ﴿١٠٢﴾ ﴾
آل عمران.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ ٱتَّقُواْ رَبَّكُمُ ٱلَّذِى خَلَقَكُم مِّن نَّفۡسٍ وَٰحِدَةٍ وَخَلَقَ مِنۡهَا زَوۡجَهَا وَبَثَّ مِنۡهُمَا رِجَالًا كَثِيرًا وَنِسَآءً ۚ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ ٱلَّذِى تَسَآءَلُونَ بِهِۦ وَٱلۡأَرۡحَامَ ۚ إِنَّ ٱللَّهَ كَانَ عَلَيۡكُمۡ رَقِيبًا ﴿١﴾ ﴾
النساء.

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱتَّقُواْ ٱللَّهَ وَقُولُواْ قَوۡلًا سَدِيدًا ﴿٧٠﴾ يُصۡلِحۡ لَكُمۡ أَعۡمَـٰلَكُمۡ وَيَغۡفِرۡ لَكُمۡ ذُنُوبَكُمۡ ۗ وَمَن يُطِعِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدۡ فَازَ فَوۡزًا عَظِيمًا ﴿٧١﴾ ﴾
الأحزاب.

أَمَا بَعد: فَإِنّ أَصْدقَ الَحديث كَلامُ الله وَخَيرَ الهَدْي هَديُ مُحَمَّد صَلَّى اللّه عَليهِ وَسلَم وَشَرَّ الأُمورِ مُحْدَثاتُها، وَكُلَّ مُحدثةٍ بِدْعة، وَكُلّ بِدْعةٍ ضَلالة، وَكُلَّ ضَلالةٍ فِي النّار.

## خوێنەری بەڕێز !

بێگومان دواین کتێبی خوا (سبحان وتعالی) (قورئان)، دواپین نوسخەی پەیام و ڕێنمایی خوای بەخشندەی میهرەبانە بۆ مرۆڤایەتیی و، خوای کاربەجێ و زانا بە پێویستیی نەزانیوە کە دوای قورئان، هیچ کتێب و پەیامی دیکە دابەزێنێ، چونکە زانیویەتی کە قورئانی مەزن و بەرز، لە هەموو ڕوویێکەوە، مرۆڤایەتی بێ نیاز دەکات، هەتا دوا ساتی ژیانی خڕۆکەی زەوی، وەك فەرموویەتی:

﴿..وَنَزَّلۡنَا عَلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ تِبۡيَٰنٗا لِّكُلِّ شَيۡءٖ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٗ وَبُشۡرَىٰ لِلۡمُسۡلِمِينَ ﴿٨٩﴾﴾ النحل.

واتە: وە کتێبمان دابەزاندۆتە سەرت، ڕوونکردنەوەی هەموو شتێکە -کە بۆ ژیانی ئێوە پێویستەو پەکی لەسەر وەحی کەوتوە- وە ڕێنمایی و بەزەیی موژدەیە بۆ موسڵمانان.

بۆیە پێویستە وەك بۆ ئەو کتێبە بەرزو بە پێزو خاوەن حورمەت و ڕێزە شایستەیە، لە خزمەتی دابین و گرنگیی و بایەخی پێبدەین و، هەوڵبدەین بە باشترین شێوە لێی بەهرەمەند بین.

### منیش وەک بەشێک لە ئەرکی سەرشانم بەرانبەر بە قورئان، لەم کتێبەدا هەوڵمداوە:

١- پێناسەی قورئان بکەم و تیشکی بخەمەسەر: کە چییەو چۆنەو چۆن دابەزیوە و، چۆن کۆکراوەتەوە و، سەرەنجام لە دوو توێی دوو بەرگ دا وەك (مصحف) کەوتۆتە بەردەستمان؟

### ٢- ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان بخەمە ڕوو:

هەر لە ئیمان پێهێنان و متمانە و باوەڕ (ثقة) پێبوونیەوە، هەتا چاك خوێندنی (تجوید) و تێگەیشتنی و، شوێنکەوتنی و پێوە پابەند بوونی.



**٣- ڕوونی بکەمەوە:** کە چۆن چۆنی بە شێوەیەکی باشتر لە خێرو بەرەکەت و هێزو پێزی قورئانی بەرزو بەڕێز بەهرەمەند بین و، سەرەنجام بەوهۆیە بەختەوەر و عیززەتمەندی دنیاو سەرفرازو دەربازی ڕۆژی دوایی دەبین؟!

**شایانی باسیشە ئەم کتێبە کۆی دوو کتێبە بە ناوەکانی:**

١- ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان.

٢- چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند بین.

کەکاتی خۆی هەردووکیان لەلایەن (سەنتەری حیکمەت)ەوە، چاپ و بڵاو کرانەوە،[١] بەڵام بە پێویستمان زانی کە ئەمجارە - وەك زۆربەی هەرە زۆری بەرهەمەکانم - لەلایەن نووسینگەی تەفسیرەوە چاپ بکرێنەوە و، بە چاکیشمان زانی کە هەردووکیان لە دوو توێی کتێبێك دا بە ناوونیشانی: (با لە خزمەت قورئان دا بین!) چاپ بکرێنەوە، چونکە بابەت و نێوەڕۆکی هەردووکیان، لە یەك نزیکن و تەواوکەری یەکدین.

هیواداریشم ئەم کتێبە مایەی زیاتر بەرچاو ڕوونبوونەوەی مسوڵمانان بێ لە بواری ڕاستتر و باشتر مامەڵەکردن لەگەڵ کتێبی بەرزو بە پێزو خاوەنی ئەوپەڕی حورمەت و ڕێزی خوای پەروەردگاردا، بە تایبەتیش لەم ڕۆژگارەدا کە ئیسلام و قورئان بە دەست دۆستانێکی نەزان و، ناحەزانێکی زۆرانەوە گرفتار بوون، کە **دۆستانی نەزان:** ئەو مسوڵمانە کرچ و کاڵ و سەرکێڵ و، گرووپە پەڕگیرو لادەرانەن کە خۆیان لەسەر ئیسلام و قورئان حیساب دەکەن، بەڵام ئیسلام و قورئان لەسەریان قەرزدارن، چونکە بیرو بۆچوون و ڕەفتار و هەڵوێستە کرچ و کاڵ و سەر کێل و پەڕگیرو تێپەڕێنەرەکانیان، دژو پێچەوانەی بەرزیی و مەزنیی پاکیی و چاکیی و حیکمەت و سەماحەتی ئیسلام و قورئانن.

---

(١) یەکەمیان لە ساڵی (٢٠١١ز) دا و، دووەمیان لە ساڵی (٢٠٠٨ز)دا چاپی یەکەمی کراوەو دواتریش چاپی دووەم و سێیەم لە ساڵی (٢٠٠٩ز) دا کراون، خوا پاداشتی (سەنتەری حیکمە)ی ئەوسا و (دەزگای ڕۆشنبیریی نووری حیکمە)ی ئێستا بداتەوە.



**وە ناحەزانى زۆرزان:** ئەو کەسانەن کە هەمیشە لە ئیسلام و قورئان لە بیانوون و، لە پشت پەردەی ڕەشەوە و بە چاویلکەی ڕۆژهەڵاتناسە کینە لە دڵەکان (المستشرقون الحاقدون) سەرنجیان دەدەن و، دایم لە هەوڵی ئەوەدان: ئەهلی ئیسلام بەرانبەر بە ئایین و کتێبەکەیان: (ئیسلام و قورئان) بخەنە دوو دڵیی و گومانەوە.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە بە هۆی قورئانەوە لە دنیا و دوارۆژدا بەرز و باڵا دەبن، وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

( إن الله تعالى يَرفَعُ بهذا الكتاب أقواماً، و يضَعُ به آخرين) رواه مسلم: ٨١٧.

واتە: بێگومان خوای بەرز کەسانێك بەم کتێبە بەرز دەکاتەوە و، وەکەسانێکیشی پێ نزم دەکاتەوە.

بەدڵنیاییشەوە هۆکاری پێ بەرزبوونەوە بە قورئان، مامەڵەی ڕاست و شایستەیە لەگەڵیدا و، هۆکاری پێ نزم بوونەوەشی، پێچەوانەکەیەتی.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون، وسلام على المرسلين. و
الحمدلله رب العالمين.

٢٢ شعبان ١٤٣٦ کۆچی
٩ حوزەیرانی ٢٠١٥ زایینی
هەولێر



# ڕێ خۆشكردن

خوشك و برایانی به‌ڕێز و خۆشه‌ویست ! ئه‌م بابه‌ته‌مان له‌ژێر ناوونیشانی: (پێناسه‌ی قورئان و ئه‌ركی سه‌رشانمان به‌رانبه‌ر به قورئان) دا پێشكه‌شی ئێوه‌ی به‌ڕێز ده‌كه‌ین.

**قورئان:** دوایین فه‌رمایشتی خوا (سبحانه وتعالى) بۆ به‌شه‌ر و بۆ جین، هه‌ر له‌و ڕۆژه‌وه كه خوا دایبه‌زاندوه بۆسه‌ر دڵی موباره‌كی پێغه‌مبه‌ری كۆتایی {محمد} (صلى الله عليه وسلم)، خه‌ڵكی سه‌ر زه‌وی به‌خۆیه‌وه مه‌شغووڵ كردوه، زۆربه‌ی هه‌ره زۆری خه‌ڵكی سه‌ر زه‌وی، جا چ ئه‌وانه‌ی كه ئیمانیان پێی هێناوه، كه فه‌رمایشتی خوایه، وه هه‌ڵوێستی ئیجابییان له به‌رانبه‌ری دا هه‌بووه، وه چ ئه‌وانه‌ی كه ئیمانیان پێ نه‌هێناوه‌و، هه‌ڵوێستی سه‌لبییان له به‌رانبه‌ریدا هه‌بووه، گرنگ ئه‌وه‌یه قورئان له‌و ڕۆژه‌وه كه دابه‌زێندراوه، خه‌ڵكی به‌خۆیه‌وه سه‌رگه‌رم كردوه.

به‌ڵام پێم وایه هیچ كات وه‌ك ئه‌م ڕۆژگاره‌ی ئێستای ئێمه، قورئان نه‌بۆته جێی باس و خواس و مشتومڕ، ئه‌ویش دیاره به‌هۆی ئه‌وه‌وه كه له ئه‌نجامی به‌ره‌و پێش چوونی هۆیه‌كانی ڕاگه‌یاندنه‌وه، ده‌نگی زوڵاڵی قورئان به‌هه‌موو دنیا گه‌یشتوه، به خه‌ڵكی چاك و خراپ و دۆست و دوژمنه‌وه، وه به‌ڕاستییش له‌خوا به‌زیادبێ ئیماندارانێكی باش له هه‌ڵگرانی قورئان، قۆڵی هیممه‌تیان لێ هه‌ڵماڵیوه، وه باش له‌خزمه‌تكردنی قورئان و له ڕاگه‌یاندنی ڕاستی یه‌كانی و له به‌رگریی لێكردنی، وه‌خۆ كه‌وتوون، دیاره له‌به‌رانبه‌ریشدا كه هه‌میشه هه‌روایه و، به ئه‌ندازه‌ی ئه‌وه‌ی كه كار ده‌بێ، كاردانه‌وه‌ش ده‌بێ، له‌به‌رانبه‌ریشدا ئه‌وانه‌ی كه دوژمن و ناحه‌زی قورئان و ئه‌هلی قورئانن، ئه‌وانه‌ش كه‌وتوونه‌ته خۆیان، بۆ



دژایەتی كردنی قورئان و ئەهلی قورئان و، بە حیسابی خۆیان بۆ كوژاندنەوەی ئەو چرایە كە خوای پەروەردگار بۆبەشەر هەڵی كردوە، بۆ ئەوەی كە دنیا و دوارۆژیانی پێ ڕۆشن بكاتەوە.

ئنجا ئێمە لەم بابەتەدا كە لەژێر ناوونیشانی: (ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان) دا پێشكەشی دەكەین، لە (پێنج) خاڵی سەرەكییدا باسی ئەركی سەرشانمان دەكەین بەرانبەر بە قورئان، كە ئایا ئێمە وەك خەڵكێكی مسوڵمان، كە بەشێكین لە ئۆممەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئایا ئەركی سەرشانمان چییە، بەرانبەر بە فەرمایشتی خوای بێ هاوەڵ، بەرانبەر بە دوایین كتێبی خوا، وە گەورەترین كتێبی خوا، كە قورئانە ؟! من لە (پێنج) خاڵدا وەك ئاماژەم پێدا، وەڵامی ئەم پرسیارە دەدەمەوە و، ئەركی سەرشانمان دەخەمە ڕوو، كە ئەمانەن:

١- ناسین و پێ ئاشنابوونی قورئان.

٢- ئیمان پێ هێنان و متمانە هەبوون بە قورئان.

٣- چاك خوێندنی قورئان و لەبەركردنی و تێوەڕامانی و تێگەیشتنی.

٤- شوێن كەوتنی قورئان و پێوە پابەندبوونی.

٥- ناساندنی قورئان و بڵاو كردنەوەی ڕاستییەكانی.



# خاڵی یەکەم

## ناسین و پێ ئاشنابوونی قورئـــان

خوا پشتیوان بێ ئێمە لە دە (١٠) بڕگەدا باسی ناسین و پێ ئاشنابوونی قورئان دەکەین، بۆچی؟ چونکە بەڵێ بە ئیمان هێنان بە قورئان، ئەوە کە فەرمایشتی خوایە و کتێبی خوایە و پەیامی خوایە، بە ئیمان هێنان بە قورئان، ئینسان دەبێتە مسوڵمان و دەچێتە نێو بازنەی ئیمان و ئیسلامەوە، بەڵام هیچ کاتێك ئیمان بە هیچ شتێك نایەتە دی، تاکو زانیاریی و ناسینی تەواو بەرانبەر بەو شتە نەبێ، بۆیە زانایانی ئیسلام گوتوویانە: (الحكم على شيءٍ فرع من تصوره) واتە: حوکمدان بەسەر شتێکدا، بەشێکە لە وێناکردنی و بەشێکە لە دەرککردنی، تۆ دەبێ بزانی ئەو شتە چۆنە ؟ ئەوجار دەتوانی حوکمی بەسەردا بدەی، ئنجا بە ئیجابیی یاخود بە سەلبیی، وە بەڕاستیش لەنێو ئێمەی مسوڵماندا، بەرانبەر بە قورئان نەشارەزایی زۆر هەیە، وە ئەوانەش کە ناحەزی ئیسلام و ناحەزی قورئانن، دیسان زۆریان لەبەر نەشارەزایی و بێ ئاگایی بە قورئان، جۆرێ لە تەم و مژ، یان جاری وا هەیە جۆرێ لەگومان و دوودڵییان لە بەرانبەر قورئان دا بۆ دروست دەبێ، بۆیە بەڕاستی هەنگاوی یەکەم بۆ جێبەجێ کردنی ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە کتێبی خوا، بەرانبەر بە قورئانی بەڕێز و بەپێز، ئەوەیە کە باش پێی ئاشنابین وە بیناسین، ئنجا وەك باسم کرد: من لە دە (١٠) بڕگەدا پێناسەی قورئان دەکەم.



## بڕگەی یەکەم:

## وشەی قوڕئان مانای چی یە ؟
## وە قوڕئان کێ ناردوویەتی؟
## وە بەکێ دا؟ وە بۆکێ؟
## وە بە چ زمانێك؟

دیارە ئەم پێنج پرسیارە، هەر پێنجیان خوا (سبحانه وتعالى) بە دەقی قوڕئان وەڵامی داونەوە:

### ١- قوڕئان یانی چی؟

وشەی قوڕئان کە وەك دوایی باسی دەکەین، یەکێکە لە چوار ناوە سەرەکییەکەی، ئەو کتێب و پەیام و وەحییە، کە خوا بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ناردوویەتی، بەڵام دیارە باوترین و دیارترین و زەقترین ناوی ئەو دوایین کتێبە، بریتییە لە قوڕئان.

جا خوای بەخشەر (سبحانه وتعالى) دەربارەی وشەی قوڕئان لەسوورەتی (القيامة) دا، دەفەرموێ:

﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾﴾ القيامة .



دیارە ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم) پێغەمبەری خوا لە ئەنجامی ئەوەدا، کە زۆر سووربووە لەسەر ئەوەی هەرچی (جبریل) لە فەرمایشتی خواو لە قورئان بۆی خوێندۆتەوە، دەست بەجێ لێی وەربگرێ و، جاری وا بووە پەلەی کردوە و زمانی موبارەکی زوو پێ جووڵاندوە، تاکو بزانێ کە ئایا وەك خۆی وەریگرتوە، یان نا؟ ئنجا خوا (سبحانه وتعالی) لەم ئایەتانەدا ئامۆژگاریی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکات و پێی دەفەرموێ: ﴿لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ﴾ واتە: زمانی خۆتی پێ مەجووڵێنە، بۆئەوەی بە پەلە پەل وەری بگری ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾ بێگومان کۆکردنەوەی قورئان لەسەر ئێمەیە {واتە: لەسینە و دڵی موبارەکی تۆدا ئەی موحەممەد! (صلی الله علیه وسلم)، وە دواییش لە دوو توێی [مصحف] دا، ئەوە لەسەر ئێمەیە}، هەروەها خوێندنەوەیشی ﴿فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ﴾ ئنجا هەرکاتێ خوێندمانەوە {لەڕێی جیبریلەوە} تۆش بەدوای خوێندنەوەکەی بکەوە.

کەواتە: وشەی قورئان یانی خوێندنەوە، ئەوەتا دەفەرموێ: ﴿إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ﴾ (أي: جَمْعَه و قراءَتَه) یانی: کۆکردنەوەی قورئان لەعەقڵ و دڵی تۆدا و پێ لەبەرکردنت، وە خوێندنەوەیشی، ئەوە لەسەر ئێمەیە، هەرکاتێ خوێندمانەوە تۆش بەدوای خوێندنەوەکەی بکەوە.

کەواتە: قورئان یانی خوێندنەوە، یاخود خوێندراوە، واتە: قورئان یان بەمانای: (مقروء) یان بە مانای (قراءة) دێ، یانی: خوێندراوە، یاخود خوێندنەوە، دیارە قورئان ناوو و نێوەڕۆکی وەك یەکەو، قورئان بۆیە ناوی لێ نراوە: قورئان، چونکە دەخوێندرێتەوە، وە خوێندراوەشە، ئەوە وشەی: قورئان زانیمان یانی چی؟!

## ٢- ئه‌دى قورئان له‌كوێوه‌ هاتووه‌و، له‌چ لايه‌نێكه‌وه‌ هاتوه‌؟

خوا له‌ سووره‌تی (الشعراء) ئايه‌تی (١٩٢)دا، ئه‌وه‌ش زۆر به‌ڕوون و ڕاشكاويی ده‌خاته‌ ڕوو، هه‌ڵبه‌ته‌ له‌ گه‌ڵێ شوێنی ديكه‌ش دا، به‌ڵام ئێمه‌ ئه‌م ئايه‌ته‌مان به‌س به‌ نموونه‌ هێناوه‌ته‌وه‌، ده‌فه‌رموێ:

﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴾

وه‌ بێگومان ئه‌م قورئانه‌ دابه‌زێنراوی په‌روه‌ردگاری جيهانه‌كانه‌، كه‌واته‌: قورئان له‌كوێوه‌ هاتوه‌؟ له‌ په‌روه‌ردگاری جيهانه‌كانه‌وه‌، له‌ خواوه‌ (سبحانه وتعالى)، كه‌واته‌: جبريل (عليه الصلاة والسلام) ڕۆڵی له‌گه‌ياندنی قورئاندا، ته‌نيا ئه‌وه‌بووه‌ كه‌ به‌سه‌ر پێغه‌مبه‌ردا خوێندوويه‌ته‌وه‌، چونكه‌ هه‌ندێك ڕای وا هه‌بوون له‌ مێژوودا، كه‌ گوتوويانه‌: خوا (سبحانه وتعالى) مانای قورئانی فێری جيبريل كردوه‌ و، ئه‌ويش بۆ خۆی بۆ پێغه‌مبه‌ری خوای داڕشتوه‌،كه‌ بێگومان ئه‌و جۆره‌ بيرۆكه‌يه‌ هيچ بنه‌ماو به‌ڵگه‌يه‌كی نيه‌.

به‌ڵێ جيبريل به‌س گه‌ياندنی قورئانی له‌سه‌ر بووه‌، به‌ بێژه‌ و واتاوه‌ (لفظاً و معنىً)، واته‌: قورئان داڕشتنه‌كه‌ی و ئه‌و واتايانه‌ش كه‌ گرتوونيه‌ خۆی، هه‌مووی له‌خوای په‌روه‌ردگاره‌وه‌يه‌.

## ٣ و ٤ - ئنجا ئايا كێ ئه‌و قورئانه‌ى هێناوه‌؟ وه‌ بۆ كێى هێناوه‌؟

ئه‌وه‌ش خوا (سبحانه وتعالى) هه‌ر له‌سووره‌تی (الشعراء) دا، وه‌ له‌ گه‌ڵێ شوێنـی ديكـه‌ش دا زۆر به‌ڕوونيی ده‌يخـاته‌ ڕوو، وه‌ك ده‌فه‌رموێ:

﴿ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ ﴾ الشعراء.

واته‌: گيانی ئه‌میندار دايبه‌زاندوه‌ بۆسه‌ر دڵی تۆ، تاكو تۆ له‌ ورياكه‌ره‌وان بی، كه‌واته‌: كێ له‌ خواوه‌ (سبحانه وتعالى) - كه‌ خوا له‌سه‌ر عه‌رشی خۆيه‌تی

بەو شێوەیە کە بۆ خوا شایستەیە -، کێ لە خواوە (سبحانه وتعالى) قورئانی دابەزاندوە بۆ سەر دڵی گەورەترین ئینسان و سەروەری پێغەمبەران موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ؟! دیارە جیبریل کە خوا (سبحانه وتعالى) لێرەدا بە (الروح الأمين) گیانی ئەمیندار، (روح) ناوی جیبریلە، یاخود سیفەتیەتی، لە سۆنگەی ئەوەوە کە وەحییەك دێنێ کە ڕووحە بۆ ژیانی بەشەر، وە (أمين) یش دیسان یەکێکە لە سیفەتەکانی، کە دیارە ئەمینە لەسەر وەحی خواو دەستکاریی ناکات، وە هیچ کەس توخنی ناکەوێ لە جند و شەیتانەکان.

وە لە سووڕەتی (النحل) دا خوا دەفەرموێ:

﴿ قُلْ نَزَّلَهُ رُوحُ الْقُدُسِ مِن رَّبِّكَ بِالْحَقِّ ﴾ النحل: ١٠٢.

واتە: بڵێ: گیانی پاك لە پەروەردگارتەوە بە حەق دای بەزاندوە، وەلە سووڕەتی (البقرة) دا ناوی جیبریل، هەر بەناوی خۆی دێنێ، بەناوی عەلەمی و دەفەرموێ:

﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُ نَزَّلَهُ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ اللَّهِ ﴾ البقرة: ٩٧.

جولەکەکان ئەوەیان دەکردە بیانوو کە بڕوا بە پێغەمبەری ئیسلام: موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) ناهێنن و بڕوا بە قورئان ناهێنن، چونکە جیبریل دایبەزاندوە و دەیانگوت: ئەو (عليه السلام) فەرمانی شەڕو شۆڕو وێران کردن لەخواوە دێنێ، بەڵام ئەگەر میکائیل هێنابای، کە فەرمانی ڕزق و ڕۆزیی و بەرەکەت دێنێ، ئەوە ئیمانمان پێ دەهێنا[1]، هەڵبەتە ئەوە هەر بیانووبوو، ئەگەرنا فریشتەکان بێ ئەمریی خوا ناکەن، ئنجا خوا دەفەرموێ:

---

(١) بڕوانە (لباب النقول في أسباب النزول) للسيوطي: ٢٤، ٢٥، ص١٧، کە دەڵێ: (وقد نقل ابن جرير أن سبب نزول الآية، ذلك).

وە بڕوانە: الإستيعاب في بيان الأسباب، ج١ ص٣٦،٣٧، کە گوتوویەتی: أخرجه أحمد (٢٧٤/١)، و الضياء المقدسي في (الأحاديث المختارة): ٦١، و البخاري في (تأريخ الكبير): ١٨٧٨ و الترمذي: ٣١١٧، والنسائي: ١٨٧، و الطبراني في (المعجم الكبير): ١٢٤٢٩، و ابن أبي حاتم في تفسيره: ٩٥٨، و صححه شيخنا العلامة الألباني في (الصحيحة): ١٨٧٢، ... و بالجملة: فالحديث صحيح.



﴿ قُلْ مَن كَانَ عَدُوًّا لِّجِبْرِيلَ فَإِنَّهُۥ نَزَّلَهُۥ عَلَىٰ قَلْبِكَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ﴾ البقرة: ٩٧

واته‌: بلّێ: كێ دوژمنه‌ بۆ جیبریل، ئه‌وه‌ جیبریل به‌ فه‌رمان و مۆڵه‌تی خوا، دایبه‌زاندوه‌ بۆسه‌ر دڵی تۆ، واته‌: له‌خۆوه‌ نه‌یهێناوه‌.

كه‌واته‌: ئه‌گه‌ر ڕقیان له‌ جیبریله‌ له‌به‌رئه‌وه‌ی وه‌حی بۆ تۆ هێناوه‌، یاخود له‌به‌رئه‌وه‌ی فه‌رمان له‌ خواوه‌ دێنێ به‌ وێران كردنی ئه‌و شوێنانه‌ی كه‌ موسته‌حه‌قی وێران كردنن، ده‌بێ ڕقیان له‌ خوای په‌روه‌ردگاریش بێ، چونكه‌ فه‌رمانه‌كه‌ له‌ خواوه‌ ده‌رچووه‌، هه‌روه‌ها له‌ سووره‌تی (التكوير)دا خوا سبحانه‌ وتعالی، ئه‌و په‌یكه‌[1]، ئه‌و په‌یام هێنه‌ره‌ كه‌ جیبریله‌ (عليه السلام)، باشتر پێناسه‌ ده‌كات و ده‌فه‌رمووێ:

﴿ فَلَآ أُقْسِمُ بِٱلْخُنَّسِ ﴿١٥﴾ ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ ﴿١٦﴾ وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ﴿١٧﴾ وَٱلصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴿١٨﴾ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴿١٩﴾ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ﴿٢٠﴾ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴿٢١﴾ ﴾ التكوير.

واته‌: نه‌خێر {ڕاست ناكه‌ن}، سوێند ده‌خۆم به‌و ئه‌ستێرانه‌ی كه‌ په‌نهان ده‌بن {زۆربه‌ی توێژه‌ره‌وان ده‌ڵێن: ﴿ الْخُنَّسْ ﴾ واته‌: ئه‌و ئه‌ستێرانه‌ی خۆیان په‌نهان ده‌كه‌ن، له‌ كاتێك دا كه‌ ڕۆژ هه‌ڵدێ، ئه‌ستێره‌كان دیاره‌ په‌نهان ده‌بن و شۆقیان نامێنێ} ﴿ ٱلْجَوَارِ ٱلْكُنَّسِ ﴾ ڕۆیشتووانێك كه‌ دوایی ده‌چنه‌وه‌ مه‌نزڵگاكانی خۆیان ﴿ وَٱلصُّبْحِ إِذَا تَنَفَّسَ ﴾ وه‌ سوێند به‌ به‌ره‌ به‌یان كاتێك هه‌ناسه‌ ده‌دات ﴿ وَٱلَّيْلِ إِذَا عَسْعَسَ ﴾ سوێند به‌ شه‌وگار كه‌ دێ یاخود كه‌ ده‌ڕوا، {سوێند به‌ هه‌موو ئه‌وانه‌} ﴿ إِنَّهُۥ لَقَوْلُ رَسُولٍ كَرِيمٍ ﴾ ئه‌م قورئانه‌ قسه‌ی ڕه‌وانه‌ كراوێكی به‌ڕێزه‌، {واته‌: نه‌ك ئه‌و بێژه‌ر (قائل)ه‌كه‌ی بێ، بێژه‌ر (قائل)ه‌كه‌ خوایه‌ (سبحانه‌ وتعالى)، به‌ڵام ئه‌و گه‌یه‌نه‌ره‌كه‌یه‌تی و ئه‌م قورئانه‌ ڕاده‌گه‌یه‌نرێ له‌لایه‌ن ڕه‌وانه‌ كراوێكی به‌ڕێزه‌وه‌} ﴿ ذِى قُوَّةٍ عِندَ ذِى ٱلْعَرْشِ مَكِينٍ ﴾ خاوه‌نی هێزه‌، وه‌ له‌لای خاوه‌ن عه‌رش - كه‌ خوایه‌ - زۆر به‌ڕێزه‌ و پێگه‌و پایه‌ی به‌رزی هه‌یه‌، ﴿ مُّطَاعٍ ثَمَّ أَمِينٍ ﴾وه‌ له‌وێ به‌قسه‌ی ده‌كرێ وه‌ ئه‌مینداریشه‌، واته‌: فریشته‌كان به‌ قسه‌ی ده‌كه‌ن.

---

(١) په‌یک : نامه‌به‌ر.

زۆربەی توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوە کە جیبریل (علیه السلام) سەرۆکی هەمـــوو فریشتەکانـــی خوای پەروەردگارە، کەواتە: زانیشمان کە قورئان بە کێ دا نێردراوە و بۆ کێ نێردراوە؟ دیارە کە بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) نێرراوە، وەك خوا لە ئایەتەکان دا بە ڕوونی بە پێغەمبەری خوا موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: کە بۆسەر دڵی تۆ دابەزێندراوە .

## ٥- ئایا قورئان بە چ زمانێك هاتوە ؟

بێگومان بە زمانی عەرەبیی، وەك هەر لەسووڕەتی (الشعراء) دا دەفەرموێ:

﴿ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾ الشعراء.

بە زمانێکی عەرەبیی زۆر ڕۆشن.

هەروەها لە سووڕەتی (رعد) دا، دەفەرموێ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَنزَلْنَاهُ حُكْمًا عَرَبِيًّا ﴾ الرعد: ٣٧.

واتە: وە بەم شێوەیە دامان بەزاندوە، {لێرەدا حوکم بە مانای: حیکمەت دێ} حیکمەتێکە بە زمانی عەرەبیی.

ئنجا بۆ زانیارییتان: وشەی: {عربي} لە زمانی عەرەبیی دا، بە مانای (فەصیح) و ڕۆشن و ئاشکرا دێت، عەرەب دەڵێن: (العربِي المُفْصِح) واتە: کەسێك کە باش تەعبیر لە قسەکانی خۆی بکاو لەو ماناو واتایانە بگات کە لە دڵ و مێشکی دا هەن، هەروەها: (الإعراب: البيان، يقال أَعْرَبَ عن نفسه)، (إعراب) واتە: ڕۆشن کردنەوە، دەگوترێ: (أعْرَبَ عن نَفْسِه) یانی: حاڵەتی خۆی ڕوونکردەوە، هەروەها بۆیەش بە (إعراب) گوتراوە:ئیعراب، لەبەرئەوەی کە دیاریی دەکەی (فاعل) کامەیەو (مفعول) کامەیە و (حرف) و (اسم) و (فعل) و ئەوانە، وە چۆنیەتی (ربط) یان بەیەکەوە چۆنە؟!

وە لە فەرمایشتی پێغەمبەر دا هاتوە (الثَّيِّبُ تُعْرِبُ عن نفسها بلسانها) واتە: بێوەژن بە زمانی خۆی حاڵەتی خۆی بەیان دەکات، واتە: داخۆ ڕازییە یان ڕازیی نیە، بەو شوکردنە، (والعربيُّ: الفصيح البيِّنُ من الكلام) وە عەرەبیی، واتە: قسەیەکی فەسیح و ڕوون[1].

وە لەبارەی پێناسەی قورئانەوە دکتۆر (صبحي الصالح) لە کتێبی: (مباحث في علوم القرآن) لە لاپەڕە (٢١) دا دەڵێ: ئەو پێناسەیە کە ئێستا باسی دەکەم، هەموو فەرموودە ناسان و شەرع زانان و زمان زانان لەسەری ڕێك کەوتوون: (القرآن هو الكلام المعجز المنزل على النبيِّ، المكتوب في المصاحف، المنقول عنه بالتواتر، المُتَعبَّد بتلاوته) واتە: قورئان بریتی یە لەو فەرمایشتە دەستەوسانکەرەی کە دابەزێندراوەتە سەر پێغەمبەر موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)، کە لە موصحەفەکان دا نووسراوەتەوەو، بە تەواتور لە پێغەمبەرەوە نەقڵ کراوە بۆ ئێمە، وە خوێندنەوەکەی بە عیبادەت دادەنرێ.

وەك دەبینیت لەم پێناسەیەدا کۆمەڵێك مەرج و وەسف دانراون، تاکو پێناسەیەکی (جامع و مانع)[2] بێ بۆ قورئان، چونکە: ئێمە شتی دیکەمان هەیە کە وەحی یە و لە پێغەمبەریشەوە نەقڵ کراوە و بە تەوا توریش، بەڵام بە قورئان دانانرێ، وەکو فەرموودەی صەحیحی موتەواتیر، لەبەرئەوە کە خودی خوێندنەوەکەی بە عیبادەت لەقەڵەم نادرێ، یان لەبەر ئەوە کە دەستەوسانکەر (معجز) نیە، واتە: وانیە کە کەسێك نەتوانێ قسەی وابکات و نەتوانێ شتی ئاوا بێنێ، ئەوە بە نسبەت بڕگەی یەکەمەوە: وشەی قورئان مانای چییەو، کێ ناردوویەتی و، بەکێداو، بۆکێ و وە بە چ زمانێك؟!

---

(١) مفردات ألفاظ القرآن، راغب الأصفهاني، ص٥٥٧.

(٢) جامع ومانع: واتە:سەرجەم تاکەکان کۆبکاتەوەو، نەشهێڵێ هی غەوارەو نامۆیان تێکەڵ ببێ.



## بڕگەی دووەم:

## ناوو سیفەتەکانی قورئان:
## ئەمجار با بزانین ناوەکانی قورئان و سیفەتەکانی قورئان، چی و چیین ؟!

### أ- ناوەکانی قورئـان:

قورئان چوار ناوی سەرەکیی هەن، هەڵبەتە شارەزایانی قورئان هەندێکیان بەشێك لە وەسفەکانی قورئانیش هەر بەناو دادەنێن، بەڵام من قەناعەتم وایە، قورئان ئەم چوار ناوە سەرەکییەی هەن و، ئەوانی دیکە هەموویان وەسفن:

**١- یەکەم ناوی قورئان (القرآن)ە،** واتە: خوێندنەوە یان خوێنراوە، وەك خوای بێ هاوتا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّهُۥ لَقُرۡءَانٞ كَرِيمٞ ﴾ الواقعة: ٧٧.

واتە: بێگومان ئەمە قورئانێکی بەڕێزە، یاخود قورئانێکی بەخشندەیە، وشەی (کریم) لەزمانی عەرەبیی دا هەم بە خاوەن ڕێز و حورمەت دەگوترێت و، هەم بە بەخشەر و بەخشندەو سەخییش دەگوترێ، وە (لە واقیع دا) قورئان هەم خاوەنی ڕێز و حورمەتەو، هەم سەخیی و بەخشندەشە.

**٢- ناوی دووەم (الكتاب)ە،** واتە: نووسراوە، وەك خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الحجر) دا دەفەرموێ:

﴿ الٓرۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ وَقُرۡءَانٖ مُّبِينٖ ۝١ ﴾ الحجر.

واتە: ئەلیف لام ڕا، ئەوانە ئایەتەکانی کتێب و قورئانێکی ڕۆشنن، یا خود قورئانێکی ڕۆشنکەرەوەن، (مبین) دەگونجێ بە مانای ڕوون بێ و، دەگونجێ بە مانای ڕوونکەرەوە بێ، یان لە (بانَ) ی (لازم) ە، یان لە (أَبانَ) ی (متعِّدي) یە، (بان الشَّئُ) واتە: شتەکە دەرکەوت، (أبانَ الشيءَ) واتە: شتەکەی ڕوون کردەوە و دەری خست[1]، (دیارە) قورئانیش هەم بۆخۆی ڕوونەو هەم ڕوون کەرەوەشە: ڕوونە، هەر کەسە بەشی خۆی لێی تێدەگا، وەك دوایی باسی دەکەین، وەهەم ڕوون کەرەوەشە بۆ هەموو ئەو مەبەستانەی کە بەشەر وجند پێویستییان پێیان هەیە، لە ژیانی دنیایان دا کە بیانزانن.

**٣- ناوی سێیەم (الذکر)ە**، وەك خوای بەرز و مەزن دەفەرموێ:

﴿ إِنَّا نَحْنُ نَزَّلْنَا ٱلذِّكْرَ وَإِنَّا لَهُۥ لَحَٰفِظُونَ ﴿٩﴾ ﴾ الحجر.

واتە: ئێمە خۆمان (ذکر) مان ناردۆتە خوار و، هەر خۆشمان بێگومان پارێزەرینی، (ذکر) دوو مانایان هەڵدەگرێ: یان بەمانای شەرەف و ڕێز و حورمەت دێ، وەك خوای بێ هاوەڵ دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّهُۥ لَذِكْرٌ لَّكَ وَلِقَوْمِكَ ﴾ الزخرف: ٤٤.

واتە: بێگومان ئەم قورئانە (ذکر)ە بۆخۆت و بۆ گەلەکەت {ئەی پێغەمبەر! (صلی الله علیه وسلم)} واتە: شەرەف وڕێز و حورمەتە.

هەڵبەتە عەرەب پێش دابەزینی قورئان، هیچ نەبوون، وە پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) وەك (محمد)ی کوڕی (عبدالله) پێش ئەوەی خوا قورئانی بۆ دابەزێنێ و هەڵیبژێرێ بە پێغەمبەری خۆی، کەس نەی دەناسی[2]، بەڵام لەسایەی وەحی خواوە و لەسایەی کتێبی خواوە، دیارە چۆن ناوی بەرز بۆوە، ئەوە مانای یەکەمی (ذکر).

---

(١) دیارە (أَبانَ) وەک چۆن بە (مُتعدّي) دێ، یانی: ڕوونی کردەوە، بە (لازم)یش دێ، یانی: ڕوون بۆوە.

(٢) واتە: لەسەر ئاستی نیوە دوورگەی عەرەبی و دنیادا ناسراو نەبوو، ئەگەرنا بێگومان لەنێو تیرەو هۆزی خۆیدا ناوبانگی بەرزوپاکی هەبووە.



مانایەکی دیکەی (ذکر) یانی: بیرخەرەوە، وە بەڕاستی قورئان شەرەف و ڕێز و حورمەتە بۆ هەر کەسێك کە هەڵیگرێ، وە بیرخەرەوەشە، واتە: ئەو ڕاستیيانەی کە سروشتی ئینسان و فیطرەتی ئینسان پێیان ئاشنایە دەیانخاتەوە بیری، چونکە خوا (سبحانه وتعالى) لە قورئان دا هیچی نەناردوە، وە لە شەریعەتی خۆیدا کە لە قورئان و سوننەت پێکدێ، هیچی نەناردوە، مەگەر فیطرەتی ساغی ئینسان و عەقڵی سەلیمی ئینسان، پێی ئاشنایە و هۆگریەتی و دەیناسێ، ئەگەر تەم و مژ و تەپ و تۆزی هۆکارەکانی دیکە لێی بگەڕێن، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) ئاماژەی پێکراوە، کە دەفەرموێ:

(مامِنْ مَولودٍ الاّ يُولَدُ على الفِطْرة، فأَبواهُ يُهوِّدانهِ أو يُنَصِّرانهِ أو يُمَجِّسانِه) رواه البخاري: ٤٧٧٥، ورواه مسلم بلفظ آخر.

واتە: هەموو منداڵێك لەسەر فیترەت (واتە سروشتی خوا ناسیی) لەدایك دەبێ، دوایی دایك و بابی دەیکەن بە جوولەکە، یان دەیکەن بە نەصرانیی، یاخود دەیکەن بە مەجووسیی، {کە مەبەست پێی ژینگە و دەوربەرە}.

### ٤– ناوی چوارەمی قورئان (الفرقان)ە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿تَبَارَكَ ٱلَّذِى نَزَّلَ ٱلْفُرْقَانَ عَلَىٰ عَبْدِهِۦ لِيَكُونَ لِلْعَٰلَمِينَ نَذِيرًا ۝١﴾ الفرقان.

واتە: بەرز و پایەدارە ئەو کەسەی کە (فرقان)ی ناردۆتە سەر بەندەکەی خۆی، تاکو ترسێنەربێ بۆ جیهانییان، یاخود وریا کەرەوە بێ.

ئەمانە چوار ناوە سەرەکییەکەی قورئانن و هەر چواریشیان لەگەڵ خودی قورئاندا پڕ بەپێستن، واتە خوا (سبحانه وتعالى) ئەو ناوانەی کە بۆ قورئانی بەکارهێناون، لەگەڵی دا سەداسەد (مطابق) و پڕ بەپێستن: قورئان، خوا ناوی لێ ناوە (قرآن)، چونکە دەخوێندرێتەوە، وە ناوی لێناوە (کتاب) چونکە نووسراوە و دەنووسرێتەوە، وە ناوی لێناوە (ذکر) چونکە شەرەف و ڕێز و حورمەتە، وە بیرخەرەوەیە، وە ناوی لێناوە (فرقان) واتە: جیاکەرەوە، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجْعَل لَّكُمْ فُرْقَانًا﴾ الأنفال: ٢٩.

واته‌: ئه‌ی ئه‌وانه‌ی بڕواتان هێناوه! ئه‌گه‌ر پارێز له خوا بكه‌ن فورقانتان پێ ده‌به‌خشێ، واته‌: واتان لێ ده‌كات، عه‌قڵ و دڵتان وا لێ ده‌كات كه جیاوازیی نێوان حه‌ڵاڵ و حه‌ڕام و، چاك و خراپ و، ڕاست و چه‌وت و، پاك و پیس، بكه‌ن.

## ب - سیفه‌ته‌كانی قوڕئان:

خوا عزوجل به‌زۆر وه‌سف و ئاوه‌ڵناو باسی قورئانی كردوه‌، به‌ڵام ئێمه ده‌ (١٠) سیفه‌تی سه‌ره‌كییمان لێ هه‌ڵبژاردوون:

**یه‌كه‌میان** (العظیم) مه‌زن، گه‌وره‌، وه‌ك خوا (سبحانه وتعالى) له سووره‌تی (الحجر) دا، ده‌فه‌رموێ:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الحجر.

واته‌: بێگومان حه‌وت له دووباره كراوه‌كان، وه قورئانی مه‌زنیشمان به‌تۆداوه‌.

حه‌وت دووباره كراوه‌كان (السبع المثاني)، پێغه‌مبه‌ر (صلى الله علیه وسلم) له فه‌رمووده‌ی صه‌حیحی خۆیدا فه‌رموویه‌تی، مه‌به‌ست پێی سووره‌تی فاتیحه‌یه[1]، چونكه سووره‌تی فاتیحه ئایه‌ته‌كانی زۆر دووباره ده‌كرێنه‌وه‌، كه‌واته‌: یه‌كێ له سیفه‌ته‌كانی قورئان، بریتییه له گه‌وره‌یی و مه‌زنیی (العظمة).

**سیفه‌تی دووه‌م** (الكریم) وه‌ك خوا فه‌رموویه‌تی:

﴿ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ الواقعة كه وه‌ك باسمان كرد (كریم) واته‌: به‌خشنده‌، یاخود به‌ڕێز و به حورمه‌ت.

**سێیه‌م:** یه‌كی دیكه له‌سیفه‌ته‌كانی قورئان (العليّ) یه‌، (عليّ) واته به‌رز، وه‌ك له سووره‌تی (الزخرف)دا ده‌فه‌رموێ:

﴿ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾ الزخرف.

---

(١) وه‌ك فه‌رموویه‌تی: {(الحمدُ للّهِ رَبِّ العالمين) هيَ السَبعُ المثاني والقرآن العظيم الذي أوْتيتُه)}. رواه البخاري وأبوداود والنسائي وابن ماجه.



واتە: وە بێگومان ئەم قورئانە لە ئەصلی کتێبدا { کە زۆربەی توێژەرەوان دەڵێن: مەبەست پێی (اللوح المحفوظ)ە} لەلامان بەرزە و قسە لەجێیە.

**سیفەتی چوارەمی** بریتیە لە (الحكيم)، وەك لە سوورەتی (لقمان)دا دەفەرموێ:

﴿ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْحَكِيمِ ﴿٢﴾ ﴾ لقمان.

واتە: ئا ئەو ئایەتانە هی کتێبێکی قسە لەجێن.

**پێنجەم:** سیفەتێکی دیکەی قورئان (العزیز)ە، واتە: زاڵ و باڵادەست، (عزیز) لە زمانی عەرەبیی دا دەڵێ: (من هو ممنوع الجانب)[1] واتە: کەسێك کە کەس پێی ناوێرێ و ناتوانێ لە بەرامبەری دا بوەستێ، وەك لە سوورەتی (فصلت)دا دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴾ فصلت.

واتە: وە ئەم قورئانە کتێبێکی زاڵ و باڵا دەستە، دوایی دەفەرموێ:

﴿ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ ﴾ فصلت.

واتە: هەڵەو نارێکیی ڕووی تێناکات نە لەپێشی نە لە دوایەوە، واتە: لە هیچ لایەکەوە ناحەقیی تێدا نیە و ناحەقیی ڕووی تێ ناکات، یاخود نە لە ڕابردوودا نە لە داهاتوودا هەڵەو نارێکیی ڕووی تێناکات.

**شەشەم:** سیفەتێکی دیکەی قورئان بریتیە (المبارك)، وەك لە سوورەتی (ص) دا، خوا دەفەرموێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓا۟ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُو۟لُوا۟ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ ص

واتە: ئەمە کتێبێکی بە پێزە بۆ لای تۆمان ناردوە، تاکو لە ئایەتەکانی وردبنەوە، وە بێجگە لە خاوەن عەقڵان کەس پەند وەرناگرێ.

(مبارك) واتە: بە پێز، (بُرْكة) بە گۆمێك دەڵێن ئاوی تێدا ڕاوەستابێ، وەکە دەگوترێ: ئەو شتە بەرەکەتی تێدایە، یانی: زۆر و بە پێزەو بەرگە دەگرێ و

---

(١) مختار الصحاح، ص ٣٧٨.



زۆر دەخایەنێ[1]، یەکێك لە سیفەتەکان کە خوای بێ وێنە (سبحانه وتعالى) خۆییان پێ وەسف دەکات بەرەکەتە: وەك دەفەرموێ: (تَبَارَكَ ٱلَّذِى) واتە: خوای پەروەردگار بەردەوامە و خێر و بەرەکەتی بەردەوامە، کەواتە: (المبارك) واتە: بە پیز بە بەرەکەت، هەڵبەتە زۆربەی کوردەواریی خۆمان وشەی: (مبارك) بەمانای: موتفەڕك بەکاردێنن، دەڵێن: ئەو شتە موبارەکە، یانی: موتفەڕکە، بەڵام وشەی (مقدَّس) مانایەکەی وایە، واتە پیرۆز و پاك، بەڵام وشەی: (مبارك) یانی: (کثير الخير) خێری زۆرە، بەرەکەتی زۆرە، بەپیزە، زۆر خێردەداتەوە و زۆر جێی کەڵك سوودە.

**حەوتەم:** سیفەتێکی دیکەی قورئان بریتیە لە: (المبين)، وەك لە سوورەتی (یوسف) دا دەفەرموێ:

﴿ الٓر ۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ۝١ ﴾ یوسف.

واتە: ئەلیف لام ڕا، ئەو ئایەتانە هی کتێبێکی ڕۆشنن، یاخود ڕۆشن کەرەوەن، وەك پێشتر باسمان کرد.

**هەشتەم:** سیفەتێکی دیکەی قورئان (المهيمن)ە، وەك لە سوورەتی (المائدة) دا خوای دادگەر دەفەرموێ:

﴿ وَأَنزَلۡنَآ إِلَيۡكَ ٱلۡكِتَٰبَ بِٱلۡحَقِّ مُصَدِّقٗا لِّمَا بَيۡنَ يَدَيۡهِ مِنَ ٱلۡكِتَٰبِ وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ ﴾ المائدة: ٤٨.

واتە: وە کتێبمان بە حەق ناردۆتە سەر تۆ، کە هەرچی لە پێش خۆیدا بووە، بەڕاستی دەزانێ، واتە: کتێبەکانی پێش خۆی بەڕاست دەزانێ (وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ) وە بەسەریشیانەوە چاودێرە، (مهيمن) یانی چاودێر و مشوور خۆر و بەسەر ڕاگەیشتوو، هەیمەنەتی بەسەریاندا هەیە، واتە: خستوونیە ژێر ڕکێف و چاودێریی خۆیەوە، لەبەرئەوە کە هەرچی لە کتێبەکانی دیکەدا گۆڕرابێ، یاخود لەبیر کرابێ، قورئان، ئەگەر بە پێویستی زانیبێ، وەبیر خەڵکی هێناوەتەوە، یاخود ڕاستی کردۆتەوە.

---

(١) مختار الصحاح، ص٥٧.



**نۆیه‌م:** سیفه‌تێکی دیکه‌ی قورئان بریتیه له: (المصدِّق)، وه‌ك له سووره‌تی (آل عمران) دا ده‌فه‌رمویّ :

﴿ نَزَّلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ ﴾ آل عمران: ٣.

واته: كتێبی ناردۆته سه‌ر تۆ به حه‌ق، كتێبه‌كانی پێش خۆی به‌ڕاست ده‌زانیّ، واته: ئه‌صڵه‌كه‌یان به‌ڕاست ده‌زانیّ، هه‌ر له: (صحف إبراهیم) كه ناوی هاتوه، تاكو ته‌وراتی مووسا و زه‌بووری داوود و ئینجیلی عیسا، سه‌ڵات و سه‌لامی خوا له‌سه‌ر هه‌موو پێغه‌مبه‌ران بیّ، وه هه‌موو كتێبه‌كانی دیكه‌ی خوا كه ناویان نه‌هاتوه، چونكه هیچ كام له پێغه‌مبه‌ران نه‌بوون (علیهم الصلاة والسلام) كه خوا په‌یامیان بۆ نه‌نێریّ، ئنجا ئه‌و په‌یامه چ دوایی كرابێته كتێب و نووسرابێته‌وه، وه‌ك (صحف) و (ته‌ورات) و (زه‌بوور) و (ئینجیل) و (قورئان)، وه، چ نه‌نووسرابێته‌وه، به‌ڵام هیچ پێغه‌مبه‌رێك نه‌بووه كه خوا په‌یامی بۆنه‌نێریّ، وه‌له ئه‌صڵیش دا په‌یامه‌كه به زاره‌كیی (شفهي) بووه و دوایی نووسراوه‌ته‌وه، جگه له ته‌ورات كه هه‌ندێكیان ده‌ڵێن ته‌ورات خوای په‌روه‌ردگار هه‌ر به نووسراوه‌یی له‌سه‌ر (ألواح) بۆ مووسای هێناوه (علیه الصلاة والسلام)، كه له‌وه‌ش دا مشت و مڕێك هه‌یه له نێوان زانایان دا.

كه‌واته: قورئان كتێبه‌كانی پێش خۆی، ئه‌سڵه‌كه‌یان به‌ڕاست ده‌زانیّ، كه له خواوه هاتوون، به‌ڵام نه‌ك واقیعی ئێستایان، كه بێگومان دوای ئه‌وه‌ی كه ده‌ستكاریی كراون و گۆڕدراون، قورئان تێبینی له‌سه‌ریان هه‌یه و هه‌ڵه‌كانیان ڕاست ده‌كاته‌وه، به‌ڵام ده‌فه‌رمویّ ئه‌سڵه‌كه‌یان ڕاسته و، ئه‌وانه هه‌موویان له ئه‌سڵ دا وه‌حی و په‌یامی خوا بوون و ناردوونی.

**سیفه‌تی ده‌یه‌م:** و كۆتایی كه ئێمه باسمان كردوون، (المجید)ه، وه‌ك له سووره‌تی (البروج) دا ده‌فه‌رمویّ:

﴿ بَلْ هُوَ قُرْءَانٌ مَّجِيدٌ ﴿٢١﴾ ﴾ البروج.

وشه‌ی: (مجد) واته: پایه و شكۆ و شكۆمه‌ندیی و به‌رزیی، (مجید) واته:



خاوەن شکۆ، خاوەن پایەی بەرز، (تمجید) واتە: بە بەرز دانان، بە شکۆمەند و بە بەڕێز و بەرز تەماشاکردن[1].

### جا ئایا ئەم وەسفانەی قورئان چییان لێ وەردەگیرێ؟

خوشك و برایانی بەڕێز! ئەوەیان لێ وەردەگیرێ وەك عەرەب دەڵێن: (المجاورة مؤثرة) نزیکیی کاریگەرە، لە کوردەواریی خۆشمان دا دەڵێن: (گا لە لای گا ببەستیتەوە، ئەگەر ڕەنگی نەگرێ، خووی دەگرێ). بەڵێ نزیکیی، کاریگەرە، وەك لە فەرمایشتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دا هاتوە:

[عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ: إِنَّمَا مَثَلُ الْجَلِيسِ الصَّالِحِ وَالْجَلِيسِ السُّوْءِ، كَحَامِلِ الْمِسْكِ وَنَافِخِ الْكِيرِ، فَحَامِلُ الْمِسْكِ إِمَّا أَنْ يُحْذِيَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَبْتَاعَ مِنْهُ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ مِنْهُ رِيحًا طَيِّبَةً، وَنَافِخُ الْكِيرِ إِمَّا أَنْ يُحْرِقَ ثِيَابَكَ، وَإِمَّا أَنْ تَجِدَ رِيحًا خَبِيثَةً.] رواه البخاري: ٥٥٣٤، و مسلم: ٢٦٢٨.

واتە: وێنەی هاوەڵی باش و هاوەڵی خراپ، وەك عەتر فرۆش و کوورەچیی وایە، کابرای عەترفرۆش، کە لێی نزیك بی، یان بۆنخۆشت دەکا، یان لێی دەکڕێ، یان بۆنی خۆشت بۆدێ.

وە کابرای ئاسنگەر و کوورەچییش، ئەگەر بەرگیشت نەسووتێنێ (بە تەقە تەق جاڕزت دەکاو) بۆنێکی ناخۆشی لێدەکەی.

ئەم وەسفانە ئەوە دەگەیەنن، کە ئێمە بە ئەندازەی ئەوە کە هەڵگری قورئان دەبین و لە قورئان نزیك دەبین و، لە خزمەت قورئان دا دەبین، ئەم سیفەتانە لە قورئان کەسب دەکەین: (عظمة) و (کرامة) و (علو) و (حکمة) و (عزة) و (برکة) و (بیان)و (هیمنة) و (تصدیق) و (مجد)، ئەم سیفەتانە و باقی ئەو سیفەتانەی دی کە خوا (سبحانه وتعالی) قورئانی پێ وەسف کردوون، تۆ تەماشای مێژوو بکە، تەماشای ئەو میللەتانە بکە کە دەستیان بە قورئانەوە گرتوە وهەڵگری قورئان بوون، تاك تاکیان، تەماشا دەکەی، یاخود بەکۆ تەماشایان دەکەی، دەبینی ئەم سیفەتانەیان تێدا ڕەنگدەداتەوە، بۆ نموونە: عەرەب چی بوون ؟ واتە:

---

(١) مختار الصحاح، ص٥٣١.



پێش ئەوەی قورئانیان بۆبێ، بەس دوایی بە کردەوە: (عظیم) بوون و (کریم) بوون و (علو) یان پەیدا کرد (علو) بە مانا ئیجابیی یەکەی، وە حیکمەتیان پەیدا کردو، عیززەتیان پەیداکردو، بەرەکەت لە ژیانیاندا پەیدابوو و هەتا دوایی، هەروەها لە دوای وانیش هەموو ئەو میللەتانەی دیکە کە دەستیان بە قورئانەوە گرتوە، پێی بەرز بوونەتەوە، وەك فەرمایشتەکەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

" إِنَّ اللَّهَ يَرْفَعُ بِهَذَا الْكِتَابِ أَقْوَامًا، وَيَضَعُ بِهِ آخَرِينَ " رواه مسلم: ٨١٧ .

واتە: خوا بەم قورئانە کەسانێك بەرز دەکاتەوەو، کەسانێکیش نزم دەکاتەوە، ئەوانەی دژی قورئان بن نزم دەبنەوەو، ئەوانەی لەگەڵ قورئانیش دا بن و لە خزمەتی دابن، پێی بەرز دەبنەوە، بێ ئەوەی مەبەستیان بەرزیی بێ، هەڵبەتە کەسێك مەبەستی بەرزیی بێ، بە قورئان بەرز نابێتەوە، دەبێ تۆ مەبەستت ئەوەبێ قورئان بەرز بکەیەوە و کەلامی خوا بەرزبکەیەوە، ئەوجار بێ ئەوەی خۆت بتەوێ، خوا ناوت بەرز دەکاتەوە و پایەت بەرز دەبێتەوە، وەك هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و پێشینی چاکمان لە پیاوان و لە ئافرەتان، بە ئەندازەی ئەوە کە لەقورئانەوە نزیك بوون و لە خزمەت قورئاندا، بوون، بەرزیی و هەموو سیفەتە چاکەکانی دیکە کە لەقورئان دا قورئانیان پێ وەسف کراوە، تێیاندا ڕەنگیان داوەتەوە .



## بڕگەی سێیەم:

## ئامانجی نێردرانی قورئان:

### با بزانین قورئان بۆچی نێردراوه ؟

دیاره خوا(سبحانه وتعالی) لەزۆر شوێن لە قورئان دا ڕوونی کردۆتەوە کە قورئانی بۆچی ناردوە، بۆ وێنە:

### ١- لە سـووڕەتی (ابراهیم)دا دەفـەرموێ:

بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

﴿الٓر كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ لِتُخْرِجَ ٱلنَّاسَ مِنَ ٱلظُّلُمَٰتِ إِلَى ٱلنُّورِ بِإِذْنِ رَبِّهِمْ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿١﴾﴾ إبراهيم.

واتە: بەناوی خوای بە بەزەیی بەخشندە، ئەلیف، لام، ڕا، ئەمە کتێبێکە ناردوومانە بۆلای تۆ، تاکو خەڵکی پێ لە تاریکاییەکان دەربهێنی بەرەو ڕۆشنایی، بە مۆڵەتی پەروەردگاریان، بەرەو ڕاستە شەقامی خوایەکی باڵا دەستی ستایش کراو.

کەواتە: قورئان بۆچی هاتوە و ئامانجی نێردرانی قورئان چی یە ؟ ئەوەیە کە خەڵك دەربێنێ لە تاریکاییەکان دەربێنێ بەرەو ڕۆشنایی، لەتاریکایی کوفر و ئیلحاد، بەرەو ڕۆشنایی ئیمان، لە تاریکایی زوڵم، بەرەو ڕۆشنایی عەدالەت، لە تاریکایی پەرتەوازەیی و بێ سەر و بەرەیی و ناکۆکیی و دووبەرەکیی، بەرەو



ڕۆشنایی برایەتی و تەبایی و پێکەوە گونجان، لە تاریکایی ڕەوشت نزمیی، بەرەو ڕۆشنایی ڕەوشت بەرزیی، لە تاریکایی بێ ئامانجیی لە ژیان دا، بۆ ڕۆشنایی ئامانج داریی لە ژیان دا، تا کۆتایی، لە هەموو تاریکییەکان بەرەو هەمو و ڕۆشناییەك.

## ٢- هەروەها لە سوورەتی (الإسراء) دا خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ يَهْدِى لِلَّتِى هِىَ أَقْوَمُ ﴾ الإسراء: ٩.

واتە: بێگومان ئەم قورئانە خەڵك ڕێنمایی دەكا بەرەو ڕێبازێك كە ڕاستترینە، چاكترینە، لەچ ڕوویەكەوە؟ لەهەموو ڕوویەكەوە: لەڕووی فكرەوە، لەڕووی عەقیدەوە، لەڕووی عیبادەتەوە، لەڕووی ئەخلاق و ڕەوشتەوە، لەڕووی ئەدەبی كۆمەڵایەتییەوە، وە لەڕووی حوكم و سیاسەتەوە، لەهەموو ڕوویەكەوە، قورئان خەڵكی ڕێنمایی دەكا، بەرەو چاكترین و ڕاستترین.

ئنجا ئایا بەڵگەمان چییە؟ بەڵگەمان مێژووییە، وەبەڵگەمان ئەوەیە كە هەر كەسێ بە عەقڵی سەلیم تەماشای قورئان بكا، دەبینێت و دەزانێ و دڵنیا دەبێ، كە قورئان بەرەو ڕاستترین و چاكترین و تەواو ترین ژیان، خەڵكی ڕێنمایی دەكات.

## ٣- وە لە سوورەتی (التكویر)دا خوا دەفەرموێ:

﴿ إِنْ هُوَ إِلَّا ذِكْرٌ لِّلْعَٰلَمِينَ ﴿٢٧﴾ لِمَن شَآءَ مِنكُمْ أَن يَسْتَقِيمَ ﴿٢٨﴾ ﴾ التكویر

واتە: ئەم قورئانە تەنیا بیرخەرەوەیە، یاخود شەرەف و ڕێزە، بۆجیهانییان بۆ هەر كامێك لە ئێوە كەبیەوێ ڕاست بێ.

كەواتە: قورئان بۆچی هاتوە ؟ بۆ ئەوەی خەڵك ڕاست بن و، لە هەموو جۆرە چەوتیی و لارییەك دەرباز بن، ڕاست بن لەگەڵ خوا دا، ڕاست بن لەزاتی خۆیاندا، ڕاست بن لەگەڵ خەڵك دا، وە ڕواڵەتیان ڕاست بێ و، دەروونیان ڕاست بێ و، لەهەموو لایەنەكانی ژیانیان دا ڕاست بن و، دوور بن لەلاریی و خواریی و چەوتیی، هەڵبەتە دەگونجێ زۆر لەبارەی ئەوەوە قسەبكەین، كەئامانجی نێردرانی قورئان چییە، بەڵام بەوەندە ئیكتیفا دەكەین، بۆ ئەوەی لەهەر بڕگەیەی فریای شتێ بكەوین.





## بڕگەی چوارەم:

## چۆنیەتی دابەزینی قورئان:

بەڕاستـــی ئەم بابەتە بابەتێکی گرنگە کە ئایا قورئان چـــۆن دابەزیـــوە، چۆن لەلایەن خواوە بەجیبریـــلدا (علیه السلام) دابەزێنراوە بۆســـەر دڵی موبارەکی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)؟، جـــا بەسەرنج دانی ئەم چەند ئایەتەی قورئان چەند و فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، زۆر جوان بۆ مان ڕوون دەبێتەوە کە قورئان چۆن دابەزێنراوە؟ چونکە بەڵێ ئێمە هەموومان بەکورتیی دەزانین کە قورئان لەلایەن خواوە هاتوە، بەڵام ئایا چۆن دابەزیوە ؟ ئەوە پێویستی بە ڕوونکردنەوەو تەفصیلْ دەکات، جا ئێمە ئێستا خەریکی ئەو ڕوونکردنەوەین:

### ١- خوا تبارك و تعالى فەرموویەتی:

﴿ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ﴿١٦٣﴾ ﴾ النساء.

واتە: ئێمە وەحییمان بۆتۆ ناردوە، وەك چۆن وەحییمان بۆ نووح و پێغەمبەرانی دوای ویش ناردوە، وە سرووشمان[١] بۆ ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و ئەسباط و عیساو ئەییوب و یونوس و هاڕوون و سولەیمان، کردوەو زەبووریشمان بە داوود داوە.

---

(١) وحي: سرووش.



کەواتە: بە هەمان شێوە دابەزینی وەحی و پەیام، کە بۆ نووح و پێغەمبەرانی دیکە علیهم السلام، هاتوە، بەهەمان شێوەش بۆ موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) هاتوە.

**٢- ئینجا لە سوورەتی (الشوری) دا خوا (سبحانه و تعالی) ڕوونتری دەکاتەوە، کە چۆن چۆنی وەحی بۆ پێغەمبەران ناردوە:**

﴿ ۞ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآيِٕ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِيَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِيٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾ الشوری.

واتە: وە هیچ بەشەرێك بۆی نیە خوا قسەی لەگەڵ بکا، مەگەر بە سرووش (واتە خستنە دڵ) یان لەپشت پەردەوە {خوا قسەی لەگەڵ بکا وەك مووسا (صلی الله علیه وسلم) خوا لە پشت پەردەوە قسەی لەگەڵ کرد، وە موحەممەدیش (صلی الله علیه وسلم) کە لەشەوی میعراجدا خوا لە پشت پەردەوە قسەی لەگەڵ کرد}، یان نوێنەرێك بنێرێ و ئەوەی کە دەیەوێ بیگەیەنێ بێگومان خوا بەرزی کار بەجێیە. {واتە: نوێنەرێك بنێرێ کە جیبریلە و ئەویش دەچێتە سەر شێوەی ئینسانێك، یاخود لەشێوەی دەنگی جەڕەسدا، وەك لە حەدیسەکاندا هاتوە}.

کەواتە: بەگشتی هاتنی وەحی بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام) سێ جۆر بووە: یان خرانە دڵ بووە، یاخود لە پشت پەردەوە بووە، وەك قسە لەگەڵدا کردن، یاخود فریشتەیەك خوای پەروەردگار ناردوویەتی، ئنجا ئەو فریشتەیەش چ خۆی بەرجەستە کردبێ لە شێوەی ئینسانێکدا، چ لەشێوەی دەنگی زەنگوڵەو جەڕەس دا، ئەو وەحییەی بە پێغەمبەرانی خوا گەیاندبێ.

**٣- وە لە سوورەتی (النجم) دا خوا زۆر باش بۆمان ڕوون دەکاتەوە، کە چۆن وەحی بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم) ناردوە؟ دەفەرموێ:**

﴿ بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ، وَٱلنَّجْمِ إِذَا هَوَىٰ ﴿١﴾ مَا ضَلَّ صَاحِبُكُمْ وَمَا غَوَىٰ ﴿٢﴾ وَمَا يَنطِقُ عَنِ ٱلْهَوَىٰٓ ﴿٣﴾ إِنْ هُوَ إِلَّا وَحْىٌ يُوحَىٰ ﴿٤﴾ عَلَّمَهُۥ شَدِيدُ ٱلْقُوَىٰ ﴿٥﴾ ذُو مِرَّةٍ فَٱسْتَوَىٰ ﴿٦﴾ وَهُوَ بِٱلْأُفُقِ ٱلْأَعْلَىٰ ﴿٧﴾ ثُمَّ دَنَا فَتَدَلَّىٰ ﴿٨﴾ فَكَانَ قَابَ قَوْسَيْنِ أَوْ أَدْنَىٰ ﴿٩﴾ فَأَوْحَىٰٓ



إِلَىٰ عَبْدِهِۦ مَآ أَوْحَىٰ ﴿١٠﴾ مَا كَذَبَ ٱلْفُؤَادُ مَا رَأَىٰٓ ﴿١١﴾ أَفَتُمَٰرُونَهُۥ عَلَىٰ مَا يَرَىٰ ﴿١٢﴾ وَلَقَدْ رَءَاهُ نَزْلَةً أُخْرَىٰ ﴿١٣﴾ عِندَ سِدْرَةِ ٱلْمُنتَهَىٰ ﴿١٤﴾ عِندَهَا جَنَّةُ ٱلْمَأْوَىٰٓ ﴿١٥﴾ إِذْ يَغْشَى ٱلسِّدْرَةَ مَا يَغْشَىٰ ﴿١٦﴾ مَا زَاغَ ٱلْبَصَرُ وَمَا طَغَىٰ ﴿١٧﴾ لَقَدْ رَأَىٰ مِنْ ءَايَٰتِ رَبِّهِ ٱلْكُبْرَىٰٓ ﴿١٨﴾ ﴾ النجم.

لەم هەژدە (١٨) ئایەتەدا خوا سبحانە وتعالی زۆر بە وردیی باسی چۆنیەتی وەحی هێنانی جیبریل دەکا بۆ موحەممەد (صلی اللە علیە وسلم)، سەرەتا ئایەتەکان هەر بە خێرایی تەرجەمە دەکەم، دەفەرموێ: بەناوی خوای بەبەزەیی بەخشندە، سوێند بە ئەستێرە کاتێ کە ئاوا دەبێ، (یاخود هەڵدەوەرێ،) هاوەڵەکەتان {واتە موحەممەد (صلی اللە علیە وسلم)} نە ڕێی لێ تێك چووە و نە سەرگەردان بووە، وە لە ئارەزووە وە قسە ناکات، بەڵکو ئەوەی کە دەیڵێ {واتە: ئەو قورئانەی کە دەیڵێ} سرووش و پەیامی خوایە بۆی هاتوە، فریشتەیەکی زۆر خاوەن هێز فێری دەکا، زۆر شکڵ و شێوەیەکی جوانی هەیە و زۆر ڕێك و پێکە {کە مەبەستی جیبریلە} یەکێك لەو جارانە لە ئاسۆی بەرز بوو {کە خۆی پێشانی موحەممەد (صلی اللە علیە وسلم)دا} دوایی نزیك بۆوە و شۆڕ بۆوە، هەتا ئەوەندە {لە پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)} نزیك بۆتەوە، وەك دوو کەوانەی بەرانبەریەك، ئنجا ئەو سرووشەی بۆ بەندەکەی خوا نارد، کە بۆی نارد، عەقڵی {پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم) یاخود دڵی، چونکە (فؤاد) بە مانای عەقڵ و، بە مانای دڵیش هاتوە} بەهەڵەدا نەچووە لەوە دا کە بینی {ڕاست جیبریلی بینی} جا ئایا موجادەڵەی لەگەڵ دا دەکەن {یاخود لێی لە گوماندان} لەوەدا کە دەیبینێ؟ بێگومان جارێکی دیکەش بینی {واتە: لە شێوەی خۆیدا جارێکی دیکەش جیبریلی بینی، ئەگەرنا چەندان جار لەشێوەی مرۆڤ دا بینیویەتی، ئنجا لە کوێ دا بینی؟} لە لای درەختی کۆتایی {کە وا دیارە کۆتایی دروستکراوەکانە} وە لەلای درەختی کۆتایی یە ئەو بەهەشتەی کە جێگاو ماوایە {بۆ ئیمانداران} کە ئەو درەختە دادە پۆشێ، ئەوەی کە دایدەپۆشێ، چاوی {پێغەمبەر (صلی اللە علیە وسلم)} لای نەداو بێ فەرمانییشی نەکرد، بێگومان ژمارەیەك لە نیشانە گەورەکانی پەروەردگاری خۆی بینی.



ئێستاش با سەرنجی چەند فەرموودەیەكی پێغەمبەریش بدەین لەو بارەوە كە بە وردیی تیشكمان بۆ دەخەنە سەر مەسەلەی چۆنیەتی هاتنی وەحی:

٤- عَنْ عَائِشَةَ أُمِّ الْمُؤْمِنِينَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهَا، أَنَّ الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ سَأَلَ رَسُولَ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقَالَ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، كَيْفَ يَأْتِيكَ الْوَحْيُ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " أَحْيَانًا يَأْتِينِي مِثْلَ صَلْصَلَةِ الْجَرَسِ، وَهُوَ أَشَدُّهُ عَلَيَّ فَيُفْصَمُ عَنِّي، وَقَدْ وَعَيْتُ عَنْهُ مَا قَالَ، وَأَحْيَانًا يَتَمَثَّلُ لِي الْمَلَكُ رَجُلًا فَيُكَلِّمُنِي فَأَعِي مَا يَقُولُ" .رواه البخاري:٢.

واتە: دایكی بڕواداران عائیشە دەگێڕێتەوە كە (الْحَارِثَ بْنَ هِشَامٍ) دەپرسێ: ئەی پێغەمبەری خوا ! چۆن وەحییت بۆ دێ ؟ ئەویش دەفەرموێ: هەندێك جار وەك زرینگانەوەی جەرەس بۆم دێ، كە ئەوە زۆر لەسەرم قورسە، كاتێك كۆتایی پێ دێ {واتە دەنگەكە دەبڕێ} تێی گەیشتووم ئەوەی كە گوتوویەتی، وە هەندێك جاران فریشتەكە بۆم دەچێتە سەر شێوەی پیاوێك قسەم لەگەڵ دا دەكا و، ئەوەی كە دەیڵێ لێی وەردەگرم و تێی دەگەم .

٥- عن عائشة رضى الله عنها: ( وَلَقَدْ رَأَيْتُهُ يَنْزِلُ عَلَيْهِ الْوَحْيُ فِي الْيَوْمِ الشَّدِيدِ الْبَرْدِ فَيَفْصِمُ عَنْهُ، وَإِنَّ جَبِينَهُ لَيَتَفَصَّدُ عَرَقًا ) رواه البخاري: ٢.

عائیشە خوا لێی ڕازی بێ {هاوسەری بەڕێزی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)} دەڵێ: پێغەمبەری خوام دەبینی لە ڕۆژی زۆر سارددا {كە سەرمایەكەی زۆر ساردبوو} وەحی بۆ دادەبەزی، كاتێك كە وەحی یەكە كۆتایی پێدەهات، نێوچەوانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) زەنگوڵ زەنگوڵ ئارەقەی لێ دەچۆڕایەوە .

٦- عن عبادة بن الصامت "كَانَ نَبِيُّ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، إِذَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ الْوَحْيُ، كُرِبَ لِذَلِكَ، وَتَرَبَّدَ وَجْهُهُ، وغَمَّض عينيه". رواه مسلم.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) كە وەحی بۆ دادەبەزی، زۆر ناڕەحەت دەبوو، وە دەم و چاوی دەگۆڕا و چاویشی دەنووقاندن .

**٧ – (زید بن ثابت) شتێكی دیكه‌مان بۆ ده‌گێڕێته‌وه‌ و زیاتر بۆمان وێنا ده‌كا كه‌ وه‌حی بۆ پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) دا به‌زیوه‌، چه‌ند قورس بووه‌:**

(عن زيد بن ثابت قال: فَأَنْزَلَ اللَّهُ عَلَى رَسُولِهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، كَانَ فَخِذُهُ عَلَى فَخِذِي، فَثَقُلَتْ عليَّ حتّى خِفْتُ أن تَرضَّ فخذي )،رواه البخاري:٦٨٦٦.

دیاره‌ ڕۆژێك پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) له‌ ته‌نیشتی زه‌ید دانیشتوه‌ و ڕانی پێغه‌مبه‌ر له‌سه‌ر ڕانی زه‌ید بووه‌، ده‌ڵێ: كه‌ وه‌حی بۆ دابه‌زی، ڕانی له‌سه‌ر ڕانم بوو، ڕانی هێنده‌ گران بوو، هه‌تا ترسام كه‌ ڕانم وردبێ له‌ بن ڕانی دا، {واته‌: ئه‌وه‌نده‌ قورساییم گه‌یشتێ}.

٨- عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ، قَالَ: سَأَلْتُ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، فَقُلْتُ: يَا رَسُولَ اللَّهِ، هَلْ تُحِسُّ بِالْوَحْيِ ؟ فَقَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: " نَعَمْ، أَسْمَعُ صَلَاصِلَ، ثُمَّ أَسْكُتُ عِنْدَ ذَلِكَ، فَمَا مِنْ مَرَّةٍ يُوحَى إِلَيَّ إِلَّا ظَنَنْتُ أَنَّ نَفْسِي تُقْبَضُ"، رواه احمد.

عه‌بدوڵلای كوڕی عه‌مری كوڕی عاص، خوا له‌خۆی و بابی ڕازی بێت ده‌ڵێ له‌ پێغه‌مبه‌رم پرسی: ئایا ئه‌ی پێغه‌مبه‌ری خوا ! هه‌ست به‌ وه‌حی ده‌كه‌ی كه‌ بۆت دێت؟ ئه‌ویش فه‌رمووی: به‌ڵێ، ده‌نگی زه‌نگۆڵه‌ و جه‌ڕه‌س دێته‌ به‌ر گوێم، كه‌ ئه‌وه‌هات بێ ده‌نگ ده‌بم، وه‌هیچ جارێك نیه‌ وه‌حییم بۆ بێت، مه‌گه‌ر گومان ده‌به‌م، كه‌ ئه‌وجاره‌ ڕووحم له‌گه‌ڵی ده‌ربچێت {ئه‌وه‌نده‌ قورسه‌}!.



## چەمك و واتای وشەی (وحي)[١]:

له زمانی عەرەبیی دا دەڵێت[٢]: (الوحي: الإعلام الخفيُّ السَّريع) واته: وەحی ئاگادار كردنەوەیەكی پەنهانی خێرایه، شایانی باسیشه كه وشەی (وحي) له قورئاندا به شەش مانایان بەكار هاتوه:

**١- بەمانای خورپه (إلهام) هاتوه**، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ أُمِّ مُوسَىٰٓ أَنۡ أَرۡضِعِيهِ ﴾ القصص: ٧.

واته: وە وەحییمان بۆ دایكی مووسا نارد كه شیری بدەیه، هەڵبەته دایكی مووسا علیهما السلام پێغەمبەر نەبووه و وەحییش تەنیا بۆ پێغەمبەران دێت بەمانا زاراوەییەكەی، كەواته: لێرەدا مەبەستی له (وحي) ئیلهامه، واته: خستمانه دڵی دایكی مووسا، كه شیر بده به مووسا وهەركات لێی ترسای، بیخه تابووتێكەوه و به ڕووباری دا بده.

**٢- وه (وحي) به مانای ئیلهامی غەریزەییش هاتوه**، كه خوا بۆ ژیان داران و زیندەوەرانی داناوه، وەك لەسوورەتی (النحل) دا دەفەرمویٚ:

﴿ وَأَوۡحَىٰ رَبُّكَ إِلَى ٱلنَّحۡلِ ﴾ النحل: ٦٨.

واته: وه پەروەردگارت سروشی نارد بۆ هەنگ [مێش هەنگوینه] واته: فێری كرد، كه مەبەستی ئەو حاڵەته غەریزەییەیەتی كه بەو شێوەیه ڕەفتار دەكات كه خوا خوڵقاندوویەتی.

**٣- وه به مانای ئاماژەو ڕەمزیش دێ**، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ فَخَرَجَ عَلَىٰ قَوۡمِهِۦ مِنَ ٱلۡمِحۡرَابِ فَأَوۡحَىٰٓ إِلَيۡهِمۡ أَن سَبِّحُواْ بُكۡرَةٗ وَعَشِيّٗا ١١ ﴾ مريم.

واته: زەكەریيا له میحراب چووه دەرو ئاماژەی كرد بۆ قەومەكەی كه بەیانیان و ئێواران خوا به پاك بگرن.

---

(١) شایەنی باسه ئێمه له بەرگی چوارەمی كتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) دا باسێكی تێرو تەسەلمان له بارەی (وەحی) یەوه كردووه.

(٢) (مفردات ألفاظ القرآن)،راغب الأصبهاني ص٨٥٨ ، وه (المعجم الوسيط) ، ص١٠١٩.



**٤- وە وەحی لە قورئان دا بە مانای وەسوەسەش بەکار هاتوە،** واتە: خوتخوتەی شەیتانەکان، وەك خوا دەفەرمویٚ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ جَعَلۡنَا لِكُلِّ نَبِيٍّ عَدُوّٗا شَيَٰطِينَ ٱلۡإِنسِ وَٱلۡجِنِّ يُوحِي بَعۡضُهُمۡ إِلَىٰ بَعۡضٖ زُخۡرُفَ ٱلۡقَوۡلِ غُرُورٗا ﴾ الأنعام: ١١٢.

واتە: وە بۆ هەر کام لە پێغەمبەران شەیتانەکانی مرۆڤ و جندمان کردوونە دوژمن، هەندێکیان قسەی بریقەداری فریودەر بۆ هەندێکیان دەنێرن.

کە بێگومان مەبەست پێی ئەوەیە کە شەیتانەکانی جند، شتی خراپ فێری شەیتانەکانی مرۆڤی دەکەن.

**٥- مانایەکی دیکەی وەحی فێرکردنی خوایە بۆ فریشتەکان،** وەك خوا دەفەرمویٚ:

﴿إِذۡ يُوحِي رَبُّكَ إِلَى ٱلۡمَلَٰٓئِكَةِ أَنِّي مَعَكُمۡ ﴾ الأنفال: ١٢.

واتە: کاتیٚ پەروەردگارت وەحی دەنارد بۆ فریشتەکان، کە من لەگەڵتانم... .

**٦- مانای شەشەمی وەحی ئەو مانا زاراوەییە یە کە دەیزانین و زیاتر باوە، کە بریتیە لە ناردنی پەیام بۆ پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام** وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ ۞ إِنَّآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَيۡكَ كَمَآ أَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰ نُوحٖ وَٱلنَّبِيِّـۧنَ مِنۢ بَعۡدِهِۦۚ وَأَوۡحَيۡنَآ إِلَىٰٓ إِبۡرَٰهِيمَ وَإِسۡمَٰعِيلَ وَإِسۡحَٰقَ وَيَعۡقُوبَ وَٱلۡأَسۡبَاطِ وَعِيسَىٰ وَأَيُّوبَ وَيُونُسَ وَهَٰرُونَ وَسُلَيۡمَٰنَۚ وَءَاتَيۡنَا دَاوُۥدَ زَبُورٗا ١٦٣ ﴾ النساء.

واتە: ئێمە سرووشمان بۆ لای تۆ ناردوە، وەك چۆن سرووشمان بۆلای نووح و پێغەمبەرانی دوای ئەویش ناردوە، وە وەحییمان بۆ لای ئیبراهیم و ئیسماعیل و ئیسحاق و یەعقووب و ئەسباط و عیساو ئەییوب و یونوس و هاروون و سولەیمان ناردوە، وە زەبوورمان بە داوود داوە.



ئنجا پێویسته بزانرێ كه سەرەتاو دەستپێكی دابەزینی وەحی بۆ پێغەمبەری كۆتایی لەشەوی (٢١) ڕەمەزانی یەكەم ساڵی پێغەمبەرایەتی دا بووە، ئەوشەوەش به شەوی قەدر ناونراوە:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ ﴾ القدر.

وه به شەوێكی موبارەكیش ناونراوە:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍ ﴾ الدخان: ٣.

وه ئەو مانگەش مانگی ڕەمەزانه:

﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ ﴾ البقرة: ١٨٥.[1]



---

(١) بڕوانه: (پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) و دەرس و پەندەكانی) چاپی دووەم: ٢٠١١، لاپەڕە (٨٧ تا ٧٩) {دابەزینی وەحی له چ ڕۆژو مانگێك دابووە؟!}





## بڕگەی پێنجەم:

## ژمارەی سووڕەت و ئایەت و وشە و پیتەکانی قورئان:

زانایانی ئیسلام ڕەحمەتی خوایان لێبێت، زۆر خزمەتی قورئانیان کردوە، لە هەموو ڕوویێکەوە، ئایەتەکانی قورئان ئەوە دیارە چەندن، وە سووڕەتەکانی دیارە ژمارەیان چەندە، بەڵام ئەوان وشە و پیتەکانیشیان ژماردوون !

شایانی باسیشە هەرکام لە وشەی (سورة) و وشەی (آية) لە قورئاندا هاتوون، بۆ وێنە: خوا فەرموویەتی:

﴿سُورَةٌ أَنزَلْنَاهَا وَفَرَضْنَاهَا وَأَنزَلْنَا فِيهَا آيَاتٍ بَيِّنَاتٍ لَّعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ ﴿١﴾﴾ النور.

واتە: ئەمە سووڕەتێکە ناردوومانەتە خوار و پێویستمان کردوە، وە چەندان ئایەتی ڕۆشنمان تێدا ناردوونە خوار بەڵکو پەند وەربگرن.

وشەی: (سُورَةٌ ) بەمانای پایەی بەرز دێت و بەمانای شوورەی شاریش دێت[1]، ئاشکراشە ئەو کۆمەڵە ئایەتانە کە ناویان لێنراوە (سُورَةٌ )، هەم پێگەو پایەی بەرزیان هەیە و، هەم هەر سووڕەتێکیش وەك شوورە دەورەی چەند ئایەتێکی داوە و کۆی کردونەتەوە.

وشەی (آية) یش بە مانای نیشانە (علامة) دێ[2]، وە ژمارەی سووڕەتەکانی قورئان (١١٤) یەو ئەمە یەك دەنگیی زانایانی لەسەرە، بەس ڕاجیاییەکی

---

(١) مختار الصحاح، ٢٨٧.

(٢) مختار الصحاح، ٤٦.



گچكە هەیە، هەندێكیان گوتوویانە: ژمارەیان (١١٣) سوورەتە، لەبەر ئەوەی (ألأنفال) و (التوبة) یان پێكەوە حیساب كردوون، ئەویش لەبەر ئەوەی كە ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ یان لە نێواندا نیە، بەڵام ئەوە ڕاجیاییەكی بچووكە و لە ڕاستی دا قورئان (١١٤) سوورەتە، لەو (١١٤) یەش (٨٦) یان بەڕای زۆربەی زانایان لە مەككە دابەزیون، واتە: (٣/٢) دوو لەسەر سێ ی قورئان، وە (٢٨) یشیان، كە (٣/١) یەك لەسەر سێ ی قـــورئان دەكات، لە مەدینـــە دابەزیون، وە لـــەبارەی ژمارەی ئایەتەكانی قورئانەوە، لە نێو زانایان دا تا ڕاددەیەك ڕا جیایی هەیە، دوایی بۆتان ڕوون دەكەمەوە، ڕا جیاییەكە لەبەر چی یە، ژمارەكانیش ئەمانەن: (٦٢٠٤) و (٦٢١٤) و (٦٢١٩) و (٦٢٢٥) و (٦٢٢٦)و كۆتا ژمارە (٦٢٣٦)ەو، كەمێكی زۆر كەمیش دەڵێن (٦٦٦٦) كە ئەوە پێم وایە هەر لەسەر زمان خۆشە، ئەگەرنا بەڵگەیەكی وای لەسەر نیە، ئنجا ئایا هۆكاری ڕا جیایی زانایان لە ژمارەی ئایەتەكاندا چی یە؟ ئایا هیچ كامیان گوتوویانە: ئەم ڕستەیە ئایەتەو، یەكی دیكە بڵێ: ئایەت نیە ؟! لە وەڵام دا دەڵێین نەخێر، بەڵكو مەسەلە كورتیی و درێژیی ئەو ڕستانەیە كە ئایەتەكانیان لێ پێك دێن.

بۆ وێنە: لە سوورەتی (الماعون) دا خوا دەفەرموێ:

﴿أَرَءَيۡتَ ٱلَّذِي يُكَذِّبُ بِٱلدِّينِ ١ فَذَٰلِكَ ٱلَّذِي يَدُعُّ ٱلۡيَتِيمَ ٢ وَلَا يَحُضُّ عَلَىٰ طَعَامِ ٱلۡمِسۡكِينِ ٣ فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ٥ ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ٦ وَيَمۡنَعُونَ ٱلۡمَاعُونَ ٧﴾ الماعون.

ئەگەر سەرنجی ئەم حەوت ئایەتەی سوورەتی (الماعون) بدەین، بۆمان دەردەكەوێ كە دەگونجێ ئایەتەكانی ژمارە: (٢و٣) بكرێنە ئایەتێك، هەروەها ئایەتەكانی ژمارە: (٤و٥)، وە ئایەتەكانی ژمارە: (٦و٧) لە حاڵێك دا كە ئێستا هەر كامێكیان ئایەتێكی سەر بەخۆیە، ئنجا كورتیی و درێژیی ڕستەكانی قورئان و ئایەتەكانە "كە بواری كۆشش (إجتهاد)ی زانایانی پسپۆڕی تێدایە"، بۆتە هۆی ڕاجیایی زانایان لەسەر ژمێریی ئایەتەكان داو، دیارە هەتا ڕستەكان



درێژتر بن، ژمارەی ئایەتەکان کەمتر و، هەتا کورتتریش بن، ژمارەیان زیاتر دەبێ.کەواتە: ڕاجیایی یەکە لە ژمارەی ئایەتەکان دایە، نەك لە خودی ئایەتەکان دا، کە هەموویان لەسەری یەکدەنگن، واتە: هیچ زانایەك نەیگوتوە: ئەو وشەیە زیادە، یان ئەو ئایەتە زیادە، یاخود کەمە، وە ژمارەی وشەکانی قورئان: (٧٧٤٣٩) وشەیە هەندێکیشیان گوتوویانە: کەمترە، یان زیاترە کە ئەمیش هۆکارەکەی چۆنیەتی پێکهاتە (ترکیب)ی وشەکانە، نەك کەم و زیادیی لە قورئان دا!، وە ژمارەی پیتەکان (٣٤٠٧٤٠) وەك (إبن کثیر) لە تەفسیرەکەی خۆیدا هێناویەتی[1].



---

(١) (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير) ص١٤.



## بڕگەی شەشەم:

## ڕیز بەندیی سووڕەت و ئایەتەکان چۆنە و کێ کردوویەتی ؟!

جارێ زانایان هەموو لەسەر ئەوە یەك دەنگن و یەك قسەن، کە ڕیز بەندیی ئایەتەکان بە وەحی بووە، کە زانایان زاراوەیەکیان بۆ بەکارهێناوە دەڵێن: (توقیفي) واتە: خوای پەروەردگار پێغەمبەری (صلى الله عليه وسلم) وەستاندوە: کە ئەمە سەرە ئایەتەو ئەو ئایەتە لە دوای ئەو ئایەتەو لە پێش ئەو ئایەتەوەیە، ئەمە هەمووی لە ڕێی وەحی یەوە دیاری کراوە، بەڵگەشیان زۆر شتە، یەکێ لە وانە ئەم فەرموودەیەیە:

(عن ابن عباس عن عثمان كانَ النبي يُنْزَلُ عَلَيْهِ الْآيَاتُ، فَيَقُولُ: " ضَعُوها فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا " ) رواهُ النسائي و ابو داود و الترمذي و صححه الحاكم.

واتە: (عبدالله)ی کوڕی (عباس) لە (عثمان)ەوە دەگێڕێتەوە، خوا لە هەموویان ڕازی بێ، دەڵێ: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئایەتی بۆ دادەبەزێنران، دەیفەرموو: ئەو ئایەتانە لە فڵان سووڕەتەدا، کە فڵان شتەی تێدا باس دەکرێ، دابنێن، لە ڕیوایەتی دیکەدا هاتوە، دەیفەرموو: ئەم ئایەتە بخەنە نێوان فڵان ئایەتە و فڵان ئایەت، کە شوێنی ئایەتەکان هەمووی بەدەست نیشان کردنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بووە، ئەویش دیارە خوای پەروەردگار بۆی دیاری کردوە، ئەوە بە نیسبەت ڕیز بەندیی ئایەتەکانەوە، بەڵام ڕیز بەندیی سووڕەتەکان: (الفاتحة)، دوایی (البقرة)، دوایی (آل عمران)، وە (النساء)، و

(المائدة) تا كۆتایی، ئەوە شتێكی ئاشكرایە كە ڕیزكردنیان بە پێی ڕیزبەندیی دابەزینیان نەبووە، چونكە یەكەمین ئایەتانێك كە دابەزین، ئەو پێنج ئایەتەی سوورەتی (العلق) بوون:

﴿ اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ ﴿١﴾ خَلَقَ الْإِنسَانَ مِنْ عَلَقٍ ﴿٢﴾ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الْأَكْرَمُ ﴿٣﴾ الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ ﴿٤﴾ عَلَّمَ الْإِنسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ ﴿٥﴾ ﴾ العلق.

ئنجا دوای ئەوە (المدثر) و (المزمل) و.. هتد، ئەدی چۆن ئەو ڕیز بەندییە كراون؟ زانایان لێرەدا دوو ڕایان هەیە: هەندێكیان دەڵێن: ئەوە بە ئیجتیهادی هاوەڵانی بەڕێز بووە، خوا لێیان ڕازی بێ، كە زانایان لێرەدا وەك زاراوەیەكی تایبەت وشەی (توفیقي) بەكاردێنن، بەڵام زۆر بەیان دەڵێن: ئەویش دیسان وەك هی ئایەتەكان (توقيفي) یەو هەر بە وەحی بووە، وە بەڕاستی من زۆر لەو مەسەلەیە ورد بوومەوەو، سەرەنجام گەیشتوومە ئەو قەناعەتە كە ڕیزبەندیی زۆربەی هەرە زۆری سوورەتەكان بە فەرمانی پێغەمبەر بووە و تەوقیفیی یە، بەڵام هەندێكیان وا پێدەچێ تەوفیقیی بێ و ئیجتیهادیی بێ، ئەم دەقەش دەلالەت لەسەر ئەوە دەكا كە هەندێ لە سوورەتەكان ـ ناڵێم زۆربەیان ـ هاوەڵانی بەڕێز لە كاتی كۆكردنەوەی قورئان لە دوو بەرگدا، بە ئیجتیهادی خۆیان ڕیز بەندییان كردوون:

(عن ابن عباس قلْتُ لِعُثْمَانَ بْنِ عَفَّانَ: مَا حَمَلَكُمْ عَلَى أَنْ عَمَدْتُمْ إِلَى الْأَنْفَالِ وَهِيَ مِنَ الْمَثَانِي، وَإِلَى بَرَاءَةٌ وَهِيَ مِنَ الْمِئِينَ، فَقَرَنْتُمْ بَيْنَهُمَا، وَلَمْ تَكْتُبُوا، بَيْنَهُمَا سَطْر: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، وَوَضَعْتُمُوهَا فِي السَّبْعِ الطُّوَالِ ؟ فقَالَ عُثْمَانُ : كَانَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ كَثِيراً ما تَنْزِلُ عليه السُورَة ذَات العَدَد، فإذا نَزل عليه شَيء ـ يعني منها ـ دَعا بَعْضَ مَنْ كَان يَكْتُبُ، فَيَقُولُ: "ضَعُوا هَؤُلَاءِ الْآيَاتِ فِي السُّورَةِ الَّتِي يُذْكَرُ فِيهَا كَذَا "، وَكَانَتْ الْأَنْفَالُ مِنْ أَوَائِلِ مَا نَزَلَ بِالْمَدِينَةِ، وَبَرَاءَةٌ مِنْ آخِرِ الْقُرْآنِ، وَكَانَتْ قِصَّتُهَا شَبِيهًا بِهَا فَظَنَنْتُ أَنهَا منها، فَقُبِضَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ وَلَمْ يُبَيِّنْ لَنا أَنَّهَا مِنْهَا) رواه أحمد (٥٧،٦٩/١) و أبوداود (٧٨٦، ٧٨٧) و الترمذي (٣٠٨٦) و قال هذا حديث حسن صحيح، والحاكم (٢٢١/٢، ٣٣٠)، و صحَّحه ووافقه الذهبي.



واتە: (عەبدوڵڵای کوڕی عەبباس) دەڵێ: بە (عوسمان) م گوت، خوا لێیان ڕازی بێ، چ شتێك وای لێکردن کە سوورەتی (الأنفال) کە لە جۆری (مثاني) یە، ببەنە لای سوورەتی (البراءة) کە لە جۆری (مئین) ە، وە دێڕی ﴿بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ﴾ یشیان لە نێوان دا نەنووسن، وە لە ڕیزی حەوت سوورەتە درێژەکان (السبع الطوال) دایبنێن؟ عوسمانیش گوتی: زۆر جاران پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) سوورەتێکی چەند ئایەتیی بۆ دەهاتە خوار، ئنجا ئەگەر شتێکی ـ واتە لە سوورەتەکە ـ بۆ هاتبایە خوار، هەندێك لە وانەی بانگ دەکرد کە قورئانیان دەنووسیەوە و دەیفەرموو: ئەم ئایەتانە لەو سوورەتەدا دابنێن، کە فلان شتەی تێدا باسکراوە، سوورەتی ئەنفالیش لەسەرەتای ئەو قورئانە بوو کە لەمەدینە هاتۆتە خوار، وە سوورەتی بەرائەش لەوقورئانەیە کە لە کۆتایی دا هاتۆتە خوار، وە بابەت و نێوەڕۆکەکەیشی بەو دەچوو {واتە: نێوەڕۆکی ئەنفالیش وەك هی بەرائەبوو} ئیدی پێم وابوو کە هەر بەشێکە لەوی {واتە: بەرائەش بەشێکە لە ئەنفال} پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) کۆچی دوایی کرد، بەر لەوەی بۆمان ڕوون بکاتەوە کە بەشێکە لەوی ـ یان نا؟ ..

ئنجا شایانی باسە پسپۆڕو شارەزایانی بواری قورئانناسیی، سوورەتەکانی قورئانیان لە ڕووی قەبارە و زۆریی و کەمی ئایەتەکانیانەوە بۆ چوار جۆر پۆلێنیان کردوون، کە ئەمانەن:

١- **(السبع الطوال)** حەوت سوورەتە درێژترەکان، کە (البقرة و، آل عمران و، النساء و، المائدة و، الأنعام و، الأعراف و، الأنفال و، التوبة) ن.

٢- **(المئين)** کە ئەو سوورەتانەن کە ژمارەی ئایەتەکانیان لە (١٠٠) زیاتر یان تۆزێك کەمترەو، ڕاستەوخۆ لە دوای (السبع الطوال) ەوە دەست پێ دەکەن.

٣- **(المثاني)** کە ئەو سوورەتانەن کە لە دوای (المئين) دێن و، بە هۆی بەدوای واندا هاتنیان، ئەو ناوەیان لێنراوە، یان لەبەر ئەوەی زۆر دەخوێندرێن و دووبارە دەکرێنەوە.

٤- **(المفصل)** کە ئەو سوورەتانەن کە لە دوای (المثاني) ەوە دێن، کە لە سوورەتی (ق) هەتا کۆتایی قورئانن .





## بڕگەی حەوتەم:

## چۆنیەتی نووسینەوە و کۆکردنەوەی قورئان و قۆناغەکانی:

ئێمە بۆ ئاشنابوونی زیاتر بە قورئان و شارەزایی زیاتر دەربارەی دوایین کتێبی خوا(سبحانە وتعالی)، پێویستە بەرچاومان ڕوون بێت کە قورئان دوای ئەوەی لە خوای پەروەردگارەوە بە (جیبریل) دا (علیە السلام) بۆ پێغەمبەری کۆتایی موحەممەد (صلی الله علیە وسلم) دابەزێندراوە، چۆن نووسراوەتەوە و پارێزراوە، پاشان چۆن خراوەتە نێوان دوو بەرگەوە و ناوی لێنراوە: (مصحف) واتە: پەڕاو، کتێب ؟ دەڵێین: نووسینەوەو کۆکردنەوەی قورئان، بە سێ قۆناغان دا تێپەڕیوە:

**قۆناغی یەکەم: نووسینەوەی دەست بەجێی قورئان، پاش وەرگیران و لەبەرکرانی لەلایەن پێغەمبەری خواوە (صلى الله عليه وسلم)، وە لەلایەن ژمارەیەك لە هاوەڵانی بەڕێزیەوە، لە پیاوان و ئافرەتان:**

بەڵێ قۆناغی یەکەمی کۆکردنەوەی قورئان نووسینەوەی بووە، دەست بەجێ و هەرکە خوا (سبحانە وتعالی) لە ڕێی جیبریلەوە قورئانی بەسەر پێغەمبەردا خوێندۆتەوە و دڵی موبارەکی پێغەمبەر وەری گرتوە، یەکسەر پێغەمبەر (صلى الله علیە وسلم) گەیاندوویەتی بە هاوەڵانی بەڕێزی و بۆی خوێندوونەتەوە، کە هەیان بووە هەموو قورئانی لەبەربووە و دەست بەجێ لە دەمی موبارەکی

پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وەری گرتوە و لەبەری کردوە، وە هەشیان بووە کەمتر، وە هاوکات لەگەڵ ئەوەدا نووسراویشەتەوە، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) چەند نووسەرێکی هەبوون پێیان گوتراوە: (كُتّاب الوحي) نووسەرەوانی وەحی، ئەوانەی کە قورئانیان نووسیوەتەوە، یەکسەر بانگی کردوون و ئەوەی کە بۆی دابەزێندراوە نووسیویانەتەوە.

با لەوبارەوە تەماشای ئایەتەکانی سوورەتی: (الأعلى) بکەین، خوا دەفەرموێ:

﴿ سَنُقْرِئُكَ فَلَا تَنسَىٰٓ ﴿٦﴾ إِلَّا مَا شَآءَ ٱللَّهُۚ إِنَّهُۥ يَعْلَمُ ٱلْجَهْرَ وَمَا يَخْفَىٰ ﴿٧﴾ ﴾ الأعلى.

واتە: بە تەئكید بۆت دەخوێنینەوە، {واتە: قورئانت بەسەردا دەخوێنینەوە} لەبیریشت ناچێتەوە {ئەوە بۆ دڵنیاکردنەوەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)} مەگەر ئەوەی خوا بیەوێ لەبیرت بچێتەوە، {خوا (سبحانه وتعالى) زۆرجار ئەم ڕستە موبارەکە دەفەرموێ، بۆئەوەی کە یاسا و سوننەتێکی خۆی فێری ئێمە بکات، ئەویش ئەوەیە کە خوا هەر شتێکی بیەوێ دەیکات و ئەگەر بیەوێ شتێك لەبیر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بچێتەوە، ئەوە لەبیری دەچێتەوە، بەڵام کە نەیویستوە، ئەوە لەبیری ناچێتەوە، لەبەرئەوە کە خوا نەیویستوە}، بێگومان خوا ئاشکرا و پەنهان دەزانێ. واتە: ئەوەی ئاشکرایە و ئەوەش کە پەنهانە، لە هەمووی ئاگادارە.

هەروەها لە سوورەتی (القيامة) دا خوا دەفەرموێ:

﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ لِتَعْجَلَ بِهِۦٓ ﴿١٦﴾ إِنَّ عَلَيْنَا جَمْعَهُۥ وَقُرْءَانَهُۥ ﴿١٧﴾ فَإِذَا قَرَأْنَٰهُ فَٱتَّبِعْ قُرْءَانَهُۥ ﴿١٨﴾ ثُمَّ إِنَّ عَلَيْنَا بَيَانَهُۥ ﴿١٩﴾ ﴾ القيامة.

پێشتریش ئەم ئایەتانەمان هێناو خستمانە ڕوو کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زۆر سووربوو لەسەر ئەوە کە ئەوەی (جیبریل) بۆی دەخوێنێتەوە، یەکسەر وەری بگرێ وە بەزاری موبارەکیشی بیبێژێ، واتە: لەگەڵ ئەوەدا کە وەریدەگرت یەکسەر گۆ (تلفظ) یشی پێ دەکرد، بۆ ئەوەی دڵنیابێ کە ئایا وەك خۆی وشەکان وەردەگرێ، یان نا ؟ جا خوا ئامۆژگاریی کرد و فەرمووی: ﴿ لَا تُحَرِّكْ بِهِۦ لِسَانَكَ ﴾ زمانتی پێ مەجووڵێنە بۆ ئەوەی پەلەی لێ بکەی،

واتە: پەلەی لێ بکەی کە زوو لەبەری بکەی و لە زەینت دا بیپارێزی. ﴿إِنَّ عَلَيۡنَا جَمۡعَهُۥ وَقُرۡءَانَهُۥ﴾ بێگومان لەسەر ئێمەیە کۆکردنەوە و خوێندنەوەی ﴿فَإِذَا قَرَأۡنَٰهُ فَٱتَّبِعۡ قُرۡءَانَهُۥ﴾ جا هەرکاتێ خوێندمانەوە (لەرێی جیبریلەوە) تۆش بەدوای خوێنەوەکەی بکەوە، ﴿ثُمَّ إِنَّ عَلَيۡنَا بَيَانَهُۥ﴾ ئنجا نەك هەر کۆکردنەوە و خوێندنەوەی، بەڵکو ڕوون کردنەوەیشی، کە چۆن کاری پێ بکەی و پراکتیزەی بکەی، ڕوون کردنەوەیشی لەسەر ئێمەیە.

وە لە سوورەتی (طه) شدا دەفەرموێ:

﴿وَلَا تَعۡجَلۡ بِٱلۡقُرۡءَانِ مِن قَبۡلِ أَن يُقۡضَىٰٓ إِلَيۡكَ وَحۡيُهُۥۖ وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا ١١٤﴾ طه.

واتە: وە پەلە مەکە لە وەرگرتنی قورئاندا، پێش ئەوەی وەحی یەکەی بۆتۆ تەواو بێ {جاری وا هەبوو پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەگەڵ (جیبریل) دا دەیگوتەوە و لێ ی ڕانەدەوەستا تاکو خوێندنەوەی ئایەتەکان تەواو دەکات و لەگەڵی دەگوتەوە،} جا خوا دەفەرموێ: پەلەی لێ مەکە پێش ئەوەی کە جبریل تەواوی بکا، بیلێیەوە، با تەواوی بکا، ﴿وَقُل رَّبِّ زِدۡنِي عِلۡمٗا﴾ وە بڵێ: پەروەردگارم زانیارییم بۆ زیاد بکە، واتە: ئەم دووعایە بکە تاکو هەم خوا لە قورئاندا زیاتر شارەزات بکا، وە هەم زیاتر فێری زانیارییت بکا بە گشتی.

هەروەها ئەم فەرمایشتەش زۆر جوان بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە هەر لەسەرەتای دابەزینی وەحی یەوە وەحی نووسراوەتەوە:

(عَنْ زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: "كُنَّا عِنْدَ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَآلِهِ وَسَلَّمَ نُؤَلِّفُ الْقُرْآنَ مِنَ الرِّقَاعِ" ، أخرجه الحاكم في المستدركِ هَذَا حَدِيثٌ صَحِيحٌ عَلَى شَرْطِ الشَّيْخَيْنِ وَلَمْ يُخَرِّجَاهُ).

زەیدی کوڕی سابیت کە پێشتریش باسمان کرد یەکێك بووە لە دیارترین نووسەرەوەکانی وەحی، دەڵێ: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەری خوادا (صلى الله عليه وسلم) دەبووین، قورئانمان دەنووسییەوە لەسەر ڕیقاع.



(رقاع) کۆی (رُقْعة) یەو هەر چییەك کە شتی لەسەر بنووسرێ، جا چەرم بێ، بەردی تەنك بێ، گەڵای درەخت بێ، هەر شتێك بێ، نووسینی لەسەر بکرێ، پێی دەگوترێ: (رقعة) کە کۆیەکەی (رقاع)[1]ە.

جا زەید دەڵێ: لە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا قورئانمان دەنووسییەوە و کۆ دەکردەوە، لەو شتانەدا کە لەو ڕۆژگارەدا لە جیاتی کاغەز شتیان لەسەر نووسراوە.

واتە: لە قۆناغی یەکەم دا ئایەتەکان کە بۆ پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابەزیون، بە دوو شێوە پارێزراون: یەکەم بۆخۆی لەبەری کردوون لەگەڵ ژمارەیەك لە هاوەڵانی بەڕێزی لە پیاوان و ئافرەتان ئەوە شێوەی یەکەم، شێوەی دووەم ئەوە بووە کە ئەو ئایەتانەو، ئەو سووڕەتانە نووسراونەتەوە، وەك پێشتر باسمان کردو، دواتر زیاتریش تیشك دەخەینە سەر ئەو مەسەلەیە، کە چۆنیەتی کۆکردنەوەی ئایەتەکان و سووڕەتەکانە.



---

(١) مختار الصحاح، ص٢٣١.



**قۆناغی دووەم: کۆکردنەوە و نووسینەوەی قورئان لە ڕۆژگاری خەلیفەی یەکەمی پێغەمبەری خوا (أبوبکر الصدیق) دا لەلایەن زەیدی کوڕی سابیتەوە، ئەویش بە پێشنیاری عومەری کوڕی خەتتاب:**

کە من فەرموودەکە سەرەتا دەقە عەرەبییەکەی دەخوێنمەوە، دوایی مانای دەکەم، چونکە دەقێکی زۆر گرنگە، بە تایبەت بۆ ئەم ڕۆژگارە کە کەسانێکی بێ بڕواو داخدار بەرانبەر بە ئیمان و ئیسلام و قورئان، دەیانەوێ تانە وتەشەر لەسەنەدی قورئان، بدەن و جارجار لەو بارەوە شت دەنووسن، بێ ئەوەی کە شارەزای مێژوو بن، جا ئەم فەرموودەیە وەڵامێکی ددان شکێنە بۆ ئەو جۆرە کەسانە:

(عَنْ عُبَيْدِ بْنِ السَّبَّاقِ ، أَنَّ زَيْدَ بْنَ ثَابِتٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، قَالَ: أَرْسَلَ إِلَيَّ أَبُو بَكْرٍ مَقْتَلَ أَهْلِ الْيَمَامَةِ، فَإِذَا عُمَرُ بْنُ الْخَطَّابِ عِنْدَهُ، قَالَ أَبُو بَكْرٍ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ: إِنَّ عُمَرَ أَتَانِي، فَقَالَ: " إِنَّ الْقَتْلَ قَدِ اسْتَحَرَّ يَوْمَ الْيَمَامَةِ بِقُرَّاءِ الْقُرْآنِ، وَإِنِّي أَخْشَى أَنْ يَسْتَحِرَّ الْقَتْلُ بِالْقُرَّاءِ بِالْمَوَاطِنِ فَيَذْهَبَ كَثِيرٌ مِنَ الْقُرْآنِ، وَإِنِّي أَرَى أَنْ تَأْمُرَ بِجَمْعِ الْقُرْآنِ. قُلْتُ لِعُمَرَ: كَيْفَ تَفْعَلُ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ، قَالَ عُمَرُ: هَذَا وَاللَّهِ خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ عُمَرُ يُرَاجِعُنِي حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِذَلِكَ وَرَأَيْتُ فِي ذَلِكَ الَّذِي رَأَى عُمَرُ "، قَالَ زَيْدٌ: قَالَ أَبُو بَكْرٍ: إِنَّكَ رَجُلٌ شَابٌّ عَاقِلٌ لَا نَتَّهِمُكَ وَقَدْ كُنْتَ تَكْتُبُ الْوَحْيَ لِرَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ فَتَتَبَّعِ الْقُرْآنَ فَاجْمَعْهُ، فَوَاللَّهِ لَوْ كَلَّفُونِي نَقْلَ جَبَلٍ مِنَ الْجِبَالِ مَا كَانَ أَثْقَلَ عَلَيَّ مِمَّا أَمَرَنِي بِهِ مِنْ جَمْعِ الْقُرْآنِ، قُلْتُ: كَيْفَ تَفْعَلُونَ شَيْئًا لَمْ يَفْعَلْهُ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ قَالَ: هُوَ وَاللَّهِ خَيْرٌ، فَلَمْ يَزَلْ أَبُو بَكْرٍ يُرَاجِعُنِي حَتَّى شَرَحَ اللَّهُ صَدْرِي لِلَّذِي شَرَحَ لَهُ صَدْرَ أَبِي بَكْرٍ وَعُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُمَا، فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الْعُسُبِ وَاللِّخَافِ وَصُدُورِ الرِّجَالِ حَتَّى وَجَدْتُ آخِرَ سُورَةِ التَّوْبَةِ مَعَ أَبِي خُزَيْمَةَ الْأَنْصَارِيِّ، لَمْ أَجِدْهَا مَعَ أَحَدٍ غَيْرِهِ ( لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِنْ أَنْفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ ) { سورة التوبة آية ١٢٨ } حَتَّى خَاتِمَةِ

بَرَاءَةَ فَكَانَتِ الصُّحُفُ عِنْدَ أَبِي بَكْرٍ حَتَّى تَوَفَّاهُ اللَّهُ، ثُمَّ عِنْدَ عُمَرَ حَيَاتَهُ، ثُمَّ عِنْدَ حَفْصَةَ بِنْتِ عُمَرَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُما) رواه البخاري وأحمد.

ئەمەش قۆناغی دووەمی کۆکردنەوە و نووسینەوەی قورِئانە کە هەر تەواوکەری کاری قۆناغی یەکەمە، زەیدی کورِی سابیت دەڵێ: ئەبووبەکر لەدوای جەنگی یەمامە لەدوای ناردم، کە چووم عومەری کورِی خەتتابی لەلابوو، ئەبووبەکر خوای لێ رِازی بێ گوتی: عومەر هاتەلام و گوتی: لە رِۆژی یەمامەدا {واتە: جەنگێك هەبووە بەناوی جەنگی یەمامە لە یەمەن رِوویداوە لەنێوان سوپای ئیسلام و هەڵگەرِاوەکان دا} جا قورِئـــان خوێنەکان {قورِئان لەبەرەکان} زۆریان لێ کوژراوە لە و جەنگەداو من دەترسێم کە لە شوێنەکانی دیکەش {لە جەنگەکانی دیکەش دا} قورِئان لەبەرەکان و هەڵگرانی قورِئان زۆریان لێ بکوژرێن، {چونکە هەڵگرانی قورئان سەرەرِمی سوپای ئیسلام بوون و لەپێش خەڵکی دیکەوە بوون} وە سەرەنجام زۆرێك لە قورِئان برِوا {کە ئەوان لە سینەیان دا هەڵیان گرتوە}، بۆیە من پێم وایە کە فەرمان بکەی بە کۆکردنەوەی قورِئان، منیش بە عومەرم گوت: چۆن شتێك بکەین کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەیکردوە ؟ {واتە: پێغەمبەری خوا خۆی قورِئانی لەنێو دووبەرگ دا کۆنەکردۆتەوە، بەڵێ نووسراوەتەوە لەسەر چەرم و لەسەر بەردی تەنك و لەوانەدا نووسراوەتەوە، بەڵام نەخراوەتە نێوان دوو بەرگەوە} عومەریش گوتی: بەخوا ئەمە شتێکی باشەو با بیکەین، ئیدی عومەر وتو وێژی لەگەڵ کردم، تا خوا سینەی منی گوشاد کرد بۆ ئەوەی کە پێشنیاری کرد، وە قەناعەتی منی وەك هی عومەر لێکرد، زەید دەڵێ: ئەبووبەکر پێی گوتم: تۆش پیاوێکی گەنجی عاقڵی و لەلای ئێمە تۆمەتبارنی، {واتە: متمانەمان پێتە} وە تۆ لەسەردەمی پێغەمبەری خواش (صلی الله علیه وسلم) دا وەحییت دەنووسییەوە، بۆیە دوای قورِئان بکەوە و کۆی بکەوە، {واتە: بیخە نێوان دوو بەرگەوە}، سوێند بە خوا ئەگەر پێیان گوتبام چیایەك لە چیایەکان لە شوێنی خۆی بگوازەوە، بەقەدەر ئەوە لە سەرشانم قورس نەبوو! پێم گوتن: چۆن شتێك دەکەن کە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) نەیکردوە ؟، ئەبووبەکریش

گوتی: ئاخر بەخوا ئەوە كارێكی باشە، وە هەر لەگەڵم خەریك بوو وتووێژی لەگەڵدا كردم، تاكو خوا سینەی گوشاد كردم، بۆئەوەی كە سینەی ئەبووبەكر و عومەریشی بۆ گوشاد كردبوو {واتە: هەمان قەناعەت بۆ منیش دروست بوو} وە دەستم كرد بە كۆكردنەوەی قورئان، كۆم دەكردەوە لە: ئەوەی كە لەسەر گەڵای دار خورما نووسرابوو، وە ئەوەی لەسەر بەردی تەنك نووسرابوو، وە ئەوەی كە لەسینەی پیاواندا هەبوو {لە سینەی ئیمانداران دا كە هەڵگرانی قورئان بوون} هەتا كۆتایی سوورەتی تەوبەم تەنیا لەلای ئەبوو خوزەیمەی ئەنصاریی بینی، لەلای غەیری ئەوم نەبینی:

﴿لَقَدْ جَاءَكُمْ رَسُولٌ مِّنْ أَنفُسِكُمْ عَزِيزٌ عَلَيْهِ مَا عَنِتُّمْ حَرِيصٌ عَلَيْكُم بِالْمُؤْمِنِينَ رَءُوفٌ رَّحِيمٌ ﴿١٢٨﴾ فَإِن تَوَلَّوْا فَقُلْ حَسْبِيَ اللَّهُ لَا إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَهُوَ رَبُّ الْعَرْشِ الْعَظِيمِ ﴿١٢٩﴾﴾ التوبة.

هەتا كۆتایی سوورەتی بەرائە، {واتە: ئەم دوو ئایەتە} وە ئەو پەڕانە لەلای ئەبووبەكربوون خوای لێ ڕازی بێ، تاكو خوا بردیەوەو وەفاتی كرد، دوایی لەلای عومەر بوون، تاكو لە ژیاندا بوو، لەدوای عومەریش {ئەو پەڕانە كە قورئانیان تێدا كۆكرابۆوە} برانە لای حەفصەی كچی عومەر خوا لێیان ڕازی بێ.

## ڕوونکردنەوەی سێ مەسەلە

لێرەدا پێویست دەکات سێ مەسەلە ڕوون بکەینەوە:

**یەکەم:** کە زەیدی کوڕی سابیت دەڵێ: (لم أجدها مع غیره) واتە: کۆتایی سووڕەتی بەڕائەم جگە لە ئەبوو خوزەیمەی ئەنصاریی لەلای کەسی دیکە نەبینی، ئایا مانای وایە کە تەنیا ئەو ئەم دوو ئایەتەی لەبەربوون؟ نەخێر، بەڵکو مەبەستی ئەوەیە کە لەلای غەیری ئەوم چنگ نەکەوتن بە نووسراوەیی، وەك (أبو شامة) گوتوویەتی: (لم أجدها مکتوبة مع غیره) کە (السیوطي) لە: (الإتقان في علوم القرآن)دا[1] لێی گێڕاوەتەوە، بەڵام دیـــارە لەلای چەندان هاوەڵی دیکە بەلەبەر کراویی هەبوون و، ئەم دوو ئایەتەشیان لە میان (ضمن) ی سووڕەتی (التوبة) دا لەبەربوون.

**دووەم:** لێرەشەوە دەردەکەوێ کە زەیدی کوڕی سابیت خوای لێ ڕازی بێ قورئانی کۆکردۆتەوە، دوو شتی کردوون و، لەسەر دوو بناغە قورئانی کۆکردۆتەوە:

**أ- ئەوەی کە نووسراوەتەوە.**

**ب- ئەوانەی کە لەبەریان بووە.**

چونکە بۆخۆی دەڵـــێ: (فَتَتَبَّعْتُ الْقُرْآنَ أَجْمَعُهُ مِنَ الْعُسُبِ وَاللِّخَافِ وَصُدُورِ الرِّجَالِ) واتە: شوێن قورئان کەوتم و کۆم کردەوە، ئەوەی کە نووسرابۆوە لەسەر گەڵای درەخت و چەرم و بەردی تەنك، وە ئەوەی کە لە سینەی پیاوان دابوو.

**سێیەم:** ئنجا ئایا هەرکەس هاتبێت و گوتبێتی ئایەتێکم لەبەرە، زەید لێی وەرگرتوە؟ نەخێر، بەڵگەشمان لەسەر ئەوە، ئەم دەقەیە کە (أبوداود) لە (سُنَن) ی خۆیدا هێناویەتی:(قالَ أَبُوبَکر "رَضِيَ اللهُ عَنْهُ" لِعُمرٍ وَزَید بنُ ثابِتْ: أُقْعُدوا على بابِ المَسْجِدِ، فَمَنْ جاءَکُما بِشاهِدَینِ عَلى شَيءٍ مِنْ کِتابِ اللهِ فَاکْتُباهُ) واتە: ئەبووبەکر خوای لێ ڕازی بێ بە عومەری کوڕی خەتتاب و زیدی کوڕی سابیتی

---

(١) بڕوانە، ج١ ص١٠١ .

گوت: {عومەریش دیارە هاوکاری زەید بووە} لەسەر دەرگای مزگەوت دانیشن، هەر کەسێك دوو شاهیدی هەبوون، کە فلان ئایەتە ئایەتێکی قورئانە، بینووسن. {واتە: ئەگەر دوو شاهێدی نەبوون، ئەوە مەینووسنەوە}.

جا دیارە دەگونجێ مەبەست لە دوو شایەد (شاهدین) لێرەدا مانا ڕواڵەتییەکەی بێ، واتە: دووکەسی متمانە پێکراو شایەدیی بۆ بدەن، کە ئەوەی لەبەریەتی بەشێکە لە قورئان، وە دەشگونجێ، وەك هەندێك لە زانایان گوتوویانە و منیش ڕایەکەیانم پێ پەسەندە، کە مەبەست لەو دوو شایەدە، هەرکام لە نووسین و لەبەربوون (الكتابة و الحفظ) بێ، واتە: هیچ شتێك بەناوی قورئانەوە مەنووسنەوە، تاکو بەهەرکام لە نووسین و لەبەر کردن، پشت ئەستوور نەبێ، دیارە هیچ سوورەتێکیش نەبووە کە بە سەدان هاوەڵ لەبەریان نەبووبێ خوا لێیان ڕازی بێ، چونکە ئەوان دینداریییەکەیان هەموو لەسەر بناغەی قورئان بووە و، وەك هەندێك[1] لە مسوڵمانانی ئێستا نەبوون، کە ئایەتێکی بە تەواویی لەبەرنەبێ و، بگرە فاتیحەشی ڕەوان نەبێ! کەچی گومانیشی وابێ کە مسوڵمانێکی تێروتەواوە! بەڵکو ئەوان ژیانەکەیان و دنیاداریی و دینداریی یەکەیان بە تەواویی لەسەر بناغەی قورئان بووە.



---

(١) دیارە لێرەدا مەبەستمان کەسانی خوێندەوارو شارەزایە، ئەگەرنا خەڵکی نەخوێندەوار زۆر جار عوزرو پاساویان هەیە.

## قۆناغی سێیەم: کۆکردنەوەی قورئان لە شێوەی موصحەف دا لە ڕۆژگاری خەلیفەی سێیەمدا:

سێیەم قۆناغی کۆکردنەوەی قورئان، ئەم دەقە بە ڕوونیی باسی دەکات:

(عَنْ ابن شهاب أن أَنس بْنِ مَالِكٍ حدَّثَهُ، أَنَّ حُذَيْفَةَ بْنَ الْيَمَانِ قدم على عثمان، وكان يغازي أَهْلَ الشَّامِ فِي فَتْحِ أرْمِينِيَةَ، وَأذْرَبِيجَانَ مَعَ أَهْلِ الْعِرَاقِ، فَأَفْزَعَ حذيفة اخْتِلافُهُمْ فِي الْقِراءة، فَقَالَ حذيفةُ لِعُثْمَانَ: "يَا أَمِيرَ الْمُؤْمِنِينَ، أَدْرِكْ هَذِهِ الأُمَّةَ قَبْلَ أَنْ يَخْتَلِفُوا فِي الْكِتَابِ اخْتلافَ الْيَهُودُ وَالنَّصَارَى"، فَأَرْسَلَ عُثْمَانُ إِلَى حَفْصَةَ: أَنْ أَرْسِلِي إِلَيْنَا بِالصُّحُفِ نَنْسَخُهَا فِي الْمَصَاحِفِ، ثُمَّ نَرُدُّهَا إِلَيْكِ. فَأَرْسَلَتْ بها حَفْصَةُ إِلَى عُثْمَانَ، فَأَرْسَلَ عُثْمَانُ إِلَى زَيْدِ بْنِ ثَابِتٍ، وَ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ الزُّبَيْرِ، وَسَعِيدِ بْنِ الْعَاصِ، وَعَبْدِ الرَّحْمَنِ بْنِ الْحَارِثِ بْنِ هِشَامٍ، فَنسخوها فِي الْمَصَاحِفِ، ثُمَّ قَالَ عثمان لِلرَّهْطِ الْقُرَشِيِّينَ الثَّلاثَةِ: اذا اخْتَلَفْتُمْ أَنْتُمْ وَزَيْدٌ بن ثابت فِي شيء من القرآن فَاكْتُبُوهُ بِلِسَانِ قُرَيْشٍ، فَإِنَّهُ نَزَلَ بِلِسَانِهِمْ. فَفَعَلُوا، حَتَّى إِذَا نَسَخُوا الصُّحُفَ فِي الْمَصَاحِفِ، ردَّ عثمانُ الصُّحف الى حفصة و أرسل الى كُلِّ أُفُقٍ بِمُصْحَفٍ ممّا نَسَخُوا، و أَمَرَ بِمَا سِوَاه مِنَ الْقُرْآنِ، فِي كُلِّ صَحِيفَةٍ أَوْ مُصْحَفٍ أَنْ يُحْرَق) رواه البخاري: (٤٩٨٧).

هەروەها باقی کۆکەرەوانی فەرمایشتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هێناویانە.

واتە: (ابن شهاب) لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە دەگێڕێتەوە دەڵێ: حوزەیفەی کوڕی یەمان خوا لێی ڕازی بێ، چوو بۆ لای عوسمان خوا لێی ڕازی بێ، {کە سێیەمین خەلیفەی پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)} وە حوزەیفەی کوڕی یەمان عادەتی وابوو، لەگەڵ ئەهلی شام دا دەچوو بۆ جەنگ بۆ ئازادکردنی ئەرمینیا، وە لەگەڵ ئەهلی عێراقیش دا دەچوو بۆ جەنگ بۆ ئازادکردنی ئازەر بایجان، جا ئەوە حوزەیفەی ترساند کە بینی مسوڵمانان

ڕاجیاییان هەیە لە خوێندنەوەی قورئاندا، حوزەیفە کاتێك گەڕایەوە بە عوسمانی گوت: ئەی فەرماندەی بڕواداران ! فریای ئەم ئۆممەتە بکەوە، پێش ئەوەی بکەونە کێشەو ناکۆکیی دەربارەی کتێبی خوا، وەك جوولەکە و نەصرانییەکان! عوسمانیش ناردی بۆلای (حەفصە) خوا لێی ڕازی بێ: (صُحُفْ) مان بۆ بنێرە، {کە بریتی بوون لەو پەڕانەی کە قورئانیان تێدا کۆکرابۆوە، بەڵام جارێ نەکرابوون بەیەك کتێب} بۆ ئەوەی لە دوو توێی بەرگێکدا بیاننووسینەوەوکۆیان بکەینەوە، دوایی پەڕەکانت بۆ دەنێرینەوە، حەفصەش ناردنی بۆلای عوسمان، ئەویش فەرمانی کرد بە: زەیدی کوڕی سابیت و عەبدوڵڵای کوڕی زوبەیر و سەعیدی کوڕی عاص و عەبدوڕڕەحمانی کوڕی حاریثی کوڕی هیشام، {واتە: لیژنەیەکی چوار قۆڵیی پێك هێنا، یەکێکیان ئەنصاریی و سێشیان قورەیشیی بوون}، ئەوانیش ئەو پەڕانەیان خستە سەر پەڕی دیکەو لە دوو توێی دوو بەرگ دا، وە چەند موصحەفێکیان لەبەر گرتەوە، {کە هەندێکیان دەڵێن: حەوت بوون، هەندێ دەڵێن پێنج بوون، هەندێ دەڵێن چوار بوون}، وە عوسمان خوا لێی ڕازی بێ بە سێ قورەیشییەکانی گوت: ئەگەر ئێوە لەگەڵ زەیدی کوڕی سابیت لە شتێك لە قورئان {لە ئایەتێك، لە وشەیەك}دا، کەوتنە ڕاجیایی یەوە، کە چۆن بنووسرێ ؟ ئەوە بە زمانی قورەیش بینووسن، چونکە قورئان بە زمانی قورەیشی یەکان {بە پلەی یەکەم} هاتۆتە خوارێ، ئەوانیش وایان کرد، هەتاکو پەڕەکانیان لەشێوەی موصحەف دا تەرتیب کرد و چەند نوسخەیەکیان لێ گرتەوە، وە عوسمان خوای لێ ڕازی بێ، پەڕەکانی ناردەوە بۆ لای حەفصە.

وە بۆ هەر ناوچەیەك {وەك: بەصرە و کووفە و شام و خوراسان و میصر} موصحەفێکی نارد {واتە: قورئانێك کە لەنێو دووبەرگ دا کۆکرابۆوە لەوەی کە نووسیویانەتەوە}، بەڵام هەرچی قورئانی دیکە، کەلەشێوەی پەڕ و کتێبان دا نووسرابوو، فەرمانی کرد هەموویان سووتاندن.

لێرەدا ئەوەمان بۆ دەردەکەوێ کە قۆناغی سێیەم، هەر تەواوکەری قۆناغی دووەمەو، ئەویش تەواوکەری قۆناغی یەکەمە، بەڵام ئایا ئەو قورئانەی خراوەتە نێو دوو بەرگەوە و، ئێستا لەبەردەستی ئێمە دایە، جیایە لەوەی کە لە سەردەمی



پێغه‌مبه‌ردا (صلى الله عليه وسلم) وه پاشتر له سه‌رده‌می ئه‌بووبه‌کردا، به ڕاوێژی عومه‌ر کۆکراوه‌ته‌وه؟ نه‌خێر، به‌ڵکو هه‌ریه‌که‌، به‌ڵام ئه‌و کات نه‌خرابووه نێو دوو به‌رگه‌وه‌، جا ڕه‌نگه یه‌کێ بڵێ: باشه چی ده‌بوو ئه‌گه‌ر پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) هه‌ر ئه‌و کاته بیخستبایه نێو دوو به‌رگه‌وه ؟ ده‌ڵێین: ئه‌وه نه‌ده‌گونجا، چونکه سووره‌تی وا هه‌یه هه‌ندێك ئایه‌تی ئه‌م ساڵ هاتوونه خوارو، هه‌ندێك ئایه‌تی دیکه‌ی دوای چه‌ندان ساڵی دیکه هاتوونه خوارێ، که‌واته ده‌بوو هه‌موو جارێ موصحه‌فه‌که بگۆڕن، دیاره ئه‌و کاته‌ش تیا نووس هێنده زۆر نه‌بوون و شتێکی به زه‌حمه‌ت ده‌بوو، هێنده شێوه‌ی ڕێکخستن و ڕیزبه‌ندیی ئایه‌ته‌کان بگۆڕن، له‌به‌رئه‌وه پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) لێی گه‌ڕاوه‌، هه‌تا سووره‌ته‌کان ته‌واو بوون، زانیویه‌تی که له‌دوای خۆی هاوه‌ڵانی به‌ڕێزی خوا لێیان ڕازی بێ، مشووری ده‌خۆن و کۆی ده‌که‌نه‌وه‌.

**لێره‌دا پرسیارێک ده‌کرێ:** وشه‌ی (صحف) له‌گه‌ڵ (مصحف) دا، جیاوازییان چییه‌؟ (صحف) که کۆی (صحيفة) یه واته‌: په‌ڕه‌کان (مصحف)یش واته‌: کتێب و په‌ڕی لێکدراوو ته‌رتیب کراو، وشه‌ی: (صُحُفْ) بۆ یه‌که‌مجار له‌سه‌رده‌می ئه‌بووبه‌کر دا خوای لێ ڕازی بێ به‌کارهات، وشه‌ی (مصحف) یش هێندێ ده‌ڵێن: یه‌که‌مجار له‌سه‌رده‌می ئه‌بووبه‌کر دا به‌کارهاتوه‌، به‌ڵام هه‌ندێکی دیکه ده‌ڵێن: یه‌که‌مجار له‌سه‌رده‌می عوسمان دا به‌کارهێنراوه‌، وه گرنگ ئه‌وه‌یه (مصحف) یانی: قوڕئانێکی نووسراوه‌ی که له‌نێوان دوو به‌رگ دا کۆکراوه‌ته‌وه‌.

هه‌روه‌ها لێره‌دا پرسیارێکی دیکه‌ش ده‌کرێ: ئایا بۆچی په‌ڕه‌کان (صحف) پاش کۆچی دوایی عومه‌ر له‌لای عوسمان نه‌بوون خوا لێیان ڕازی بێ و، بۆچی ده‌چنه لای حه‌فصه‌ی کچی؟ وه‌ڵامه‌که‌ی ئه‌وه‌یه که‌ئه‌و کاته که عومه‌ر خوا لێی ڕازی بێ بریندار ده‌کرێ و له‌سه‌ر جێگای مردن ده‌بێ، خۆ جارێ نازانن کێ ده‌بێ به خه‌لیفه‌، له‌به‌رئه‌وه وه‌ك ئه‌مانه‌تێك عومه‌ر خوا لێی ڕازی بێ له‌لای حه‌فصه‌ی کچی دایناوه‌، که هاوسه‌ری پێغه‌مبه‌ریش (صلى الله عليه وسلم) بووه و له‌به‌رکه‌ر (حافظة)ی قوڕئانیش بووه‌.

له کۆتایی ئه‌م بڕگه‌یه‌شدا، ڕوونکردنه‌وه‌ی چه‌ند مه‌سه‌له‌یه‌ك به پێویست ده‌زانم:



## ڕوونکردنەوەی شەش مەسەلەی گرنگ

**یەکەم:** مەسەلەی دابەشکرانی قورئان بۆ سی (٣٠) بەش (جزء)، ئایا ئەوە چۆن بووە ؟! دەڵێین: ئەوە زانایان کردوویانە و ڕەنگە لەسەردەمی خەلیفە ڕاشیدەکانیشدا نەبووبێ و دوایی بووە، زانایان بۆ ئەوەی بابای قورئانخوێن بزانێ هەرجارەی چەند بخوێنێ؟ بۆیە کردوویانەتە سی بەش، بۆئەوەی بەلای کەمەوە مرۆڤ شەو و ڕۆژی جوزئێك بخوێنێ، تاکو لە مانگێك دا جارێك قورئان خەتم بکات، یاخود ئەگەر نەیتوانی، جوزئێکیان کردۆتە دوو حیزب، بۆئەوەی ئەگەر بە مانگێك نەیتوانی هەموو قورئان بخوێنێ، با بەدوو مانگان بیخوێنێ، شەوو ڕۆژێ یەك (حزب) واتە: نیو جوزء، وە ئەوە هیچ بەڵگەیەکی لەسەر نیە کە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابەشی کردبێ بۆ چەند جوزئێك، یاخود بۆ چەند حیزبێك.

**دووەم:** مەسەلەی سەر و بۆرکردنی بۆ ئایەتەکان، بۆ زانیارییتان ئەوەش دوایی زانایان کردوویانەو ئەصڵی ئەو قورئانەی کە لەسەردەمی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) و خەلیفە ڕاشیدەکان دا نووسراوەتەوە، ئەو کاتە زمانی عەرەبیی هەر خۆی وابووە، سەر و بۆر و ژێر ( فتحة و ضمة و كسرة ) و بگرە خاڵ (نقطة) شی نەبووە و، هەر ڕێك وشە (كلمة) بووە و ڕەسمی کەلیمەکە بووە، وە بۆیەش دوایی جیاوازیی خوێندنەوەکان (اختلاف القراءات) بواری تێدا هەبووە، بەڵام ئێستا ئەو موصحەفانەی لەبەردەستی ئێمەدانە، لەوڵاتانی ڕۆژهەڵاتی ئاسیاو ڕۆژهەڵاتی نێوەڕاست، جیان لەوانەی کەلە وڵاتانی ڕۆژئاوادان، هی ئێمە بە پێی خوێندنەوە (قراءة)ی حەفصە، بەڵام هی ئەوان بەپێی (وەرش) ە، جا ئەگەر سەر و بۆر و ژێر (حركات) ی وشەکانی قورئان، بە پێی خوێندنەوەی حەفص بێ، ناگونجێ هەندێك وشەی بە پێی خوێندنەوەیەکی دیکە بیخوێنی، دیارە لەسەرەتاوە هەر نوقتە بووە و، لە جیاتی فەتحە نوختەیەکیان لەسەرێ دەکرد و، لەجیاتی کەسرە، نوختەیەکیان لە خوارێ دەکردو، لە جیاتی زەممە

نوختەیەکیان لە نێوەڕاستی وشەکە دا دەکرد، بەڵام دوایی کردیان بە سەر و بۆر و ژێر، (الفتحة و الضمة و الکسرة) و گیرە (شدّة) شیان زیاد کرد.

**سێیەم:** مەسەلەیەکی دیکە: ڕیزبەندیی سووڕەتەکان لە موصحەفدا، بەپێی ڕیزبەندیی هاتنە خوارەوەی سووڕەتەکان نیە، وەك پێشتریش باسمان کردو، ئەگەر بەپێی ڕیزبەندیی هاتنە خواریان بووایە، دەبووایە سووڕەتی (العلق) لەسەرەتای قورئانەوە بێ و، سووڕەتی (البراءة) لە کۆتایی قورئان دا بێ، بەڵام ڕیزبەندییەك کە لە موصحەفدا ڕەچاو کراوە، وەك پێشتر باسمان کرد: زۆربەی زانایان ڕایان وایە کە زۆربەی سووڕەتەکان، ئەگەر هەمووشیان نەبێ، ڕیزبەندیی یەکە یان بە وەحی بووە، وە من پێم وایە ڕیزبەندیی یەکە بەپێی گرنگیی و گەورەیی سووڕەتەکانە، هەڵبەتە سووڕەتەکانی قورئان هەموویان گەورەن و هەموویان گرنگن، بەڵام لەنێو گەورەکانیش دا گەورە هەیە و، گەورەتریش هەیە، وە لە نێو ئایەتەکانیش دا هەروایە، ئەوەتا پێغەمبەر (صلى الله علیه وسلم) دەفەرموێ: گەورەی ئایەتەکانی قورئان (آیة الکرسي) یە، وە فەرموویەتی: گەورەی سووڕەتەکانی قورئان، فاتیحەیە، بۆیەش سووڕەتی فاتیحە کراوەتە یەکەمین سووڕەت لە ڕیزبەندیی موصحەف داو، دوای ئەو سووڕەتی (البقرة) دێ، کە زۆرترین یاساکانی شەریعەتی تێدان، ئنجا دوایی (آل عمران) و (النساء) و(المائدة) و ئەوانی دیکە ...

**چوارەم:** مەسەلەی: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) کە ئەگەر تەماشای هەندێك لە موصحەفەکان بکەین، کە لەنێو ئێمەدا هەن، لە زۆربەیاندا (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) وەك ئایەتێك لە سەر ژمێری ئایەتەکان دا حسێب نەکراوە، جا ئایا (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) ئایەتێکە لە هەر سووڕەتێك، یان نا، یان چۆنە ؟

زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) لەو (١١٣) سووڕەتەدا کە لەسەرەتایانەوە هاتوە، کە هەموو سووڕەتەکانی قورئانن، جگە لە سووڕەتی (التوبة)، یان (البراءة) ئایەتێکە لە قورئان، وە لە سووڕەتی (النمل) یش دا، بەشێکە لە ئایەتێك:

﴿ إِنَّهُۥ مِن سُلَيۡمَٰنَ وَإِنَّهُۥ بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ٣٠ ﴾ النمل.

بەڵام لەوەدا ڕاجیاییان هەیە، کە ئایا ئایەتێکە لە ڕیزی ئایەتەکانیان دا، یاخود ئایەتێکی سەربەخۆیە و لە کاتی سەرژمێری ئایەتەکانیاندا حیساب ناکریێ؟ واتە: هەموو لەسەرئەوە یەك دەنگن کە (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) ئایەتێکە، بەڵام هەندێکیان دەڵێن: ئایەتێکی سەربەخۆیە و، خوا دایناوە لەسەرەتای هەموو سوورەتێکەوە، بۆ ئەوەی دیاربێ ئەو سوورەتە، کەی دەست پێدەکات و لە کوێ کۆتایی دێ، وە هەندێکیان دەڵێن: نەخێر، وەك چۆن زۆربەی هەرە زۆریان دەڵێن: (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) ئایەتێکە لە حەوت ئایەتەکەی سوورەتی (الفاتحة)، بە هەمان شێوەش ئایەتێکیشە لەهەرکام لەو سوورەتانەی کە لە پێشیانەوە هاتوە، وە لە ڕیزی ئایەتەکانی هەرکام لەو سوورەتانە دا دەژمێرریێ، کەواتە: هەموویان لەسەر ئەوە یەك دەنگن کە (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) ئایەتێکە لە قورئان، جا ئایەتێکی سەربەخۆیە، یان ئایەتێکە لە ڕیزی ئایەتەکانی هەرکام لە سوورەتەکاندا؟ لەوەدا ڕاجیاییان هەیە، ئەگەرنا هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەك دەنگن، کە هەر شتێك لە موصحەف دا نووسراوەتەوە، قورئانەو (بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ) یش لەسەرەتای (١١٣) سوورەت دا هەیە، کەواتە: قورئانە، چونکە غەیری قورئانیان نەنووسیوەتەوە.

**پێنجەم:** مەسەلەیەکی دیکە، مەسەلەی خوێندنەوەکان (قراءات)ە، هەر بەکورتی دەڵێین: خوێندنەوەکانی قورئان ئەوەی کە بە تەواتور لە پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) بە ئێمە گەیشتبێ، ئەویش بە قورئان لە قەڵەم دەدریێ، بۆ وێنە: ئێمە لە سوورەتی فاتیحە دا ڕستەی: (مالك يوم الدين) دەخوێنینەوە، وە دەشخوێندرێتەوە: (مَلِكِ يوم الدين) کەواتە: بە هەر کامێکیان بیخوێنیەوە هەر قورئانە، ئنجا ئایا تەواتور یانی چی؟ تەواتور ئەوەیە کە کۆمەڵێك لە پێغەمبەریان بیستبێ کە فلان ئایەتەی ئاوا خوێندبێتەوە، وە کۆمەڵێکیش لەو کۆمەڵەیان بیستبێ و، کۆمەڵێکیش لەو کۆمەڵە، تا گەیشتبێتە ئێمە، بەڵێ موتەواتیر ئەوەیە کە کۆمەڵێکی وا لە پێغەمبەریان (صلى الله عليه وسلم) بیستبێ، کە عەقڵ بە مەحاڵی دابنێ، ئەوانە لەسەر درۆ کۆببنەوە، بەڵام ئەو



قیرائەتانەی کە موتەواتیر[١] نەبن و ئاحاد بن، ئەوە حوکمی حەدیسی ئاحادیان هەیە، واتە: یەقینمان بۆ پەیدا نابێ کە ئەوە قورئانە و ئاوا دەخوێندرێتەوە، فەرموودەی ئاحادییش ئەوانەن کە یەك نەفەر یان زیاتر، لە پێغەمبەر[٢] (صلى الله عليه وسلم) بیستوویانە، بەڵام نەگەیشتوونەتە ڕاددەی تەواتور، ئنجا هەندێ ئایەتی دیکەش هەن، کە یەکێ لە هاوەڵان ئاوای خوێندۆتەوە و یەکێکی دیکە ئاوای خوێندۆتەوە، ئەوە ئیجتیهادی هاوەڵانە و ڕای ئەوانەو، وەك ڕا (رأی) مامەڵەی لەگەڵدا دەکرێ .

**شەشەم:** کۆتا مەسەلە کە لەو بارەوە باسی بکەین، ئەوەیە کە سەرەتای دابەزینی قورئان کە پێشتریش باسمان کرد، بەڕای من وەك لە کتێبی:

{پوختەی ژیاننامەی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)} دا، جوان باسم کردوە و بەڵگەکانم هێناون[٣]، لە شەوی (٢١) ی ڕەمەزانی ئەو ساڵەی کە موحەممەد تێیدا بۆتە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، واتە: یەکەمین شەوی کە وەحی بۆ هاتوە، ئەوشەوە سەرەتای دابەزینی قورئانە کە لەمانگی ڕەمەزان دا بووە، بە دەقی ئایەتی:

﴿ شَهۡرُ رَمَضَانَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ فِيهِ ٱلۡقُرۡءَانُ ﴾ البقرة: ١٨٥.

وە ئەو شەوەش پێی دەگوترێ: شـــــەوی قەدر:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ ١ ﴾ القدر.

وە پێشی دەگوترێ شەوێکی بەڕێز، یان بەپێز:

﴿ إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةٖ مُّبَٰرَكَةٍۚ إِنَّا كُنَّا مُنذِرِينَ ٣ ﴾ الدخان.

---

(١) بڕوانە: (تيسير علم أصول الفقه) عبدالله بن يوسف الجديع، ص١٣٧.

(٢) سەرچاوەی پێشوو، ص ١٤١.

(٣) بڕوانە: لاپەڕە: ٩٣ تاکو ٩٦، چاپی سێیەم/ ٢٠١٢ ز.
هەروەها بڕوانە: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) ج٤ الإيمان برسل الله و أنبياء.



ئنجا لێرەدا یەكێك پرسیار دەكا: خوا دەفەرمویٚ: ئێمە قورئانمان لە مانگی ڕەمەزاندا ناردۆتە خوار، كەواتە: دەبیٚ هەموو قورئان لە مانگی ڕەمەزاندا هاتبیٚ، ئاشكراشە كە لە مانگەكانی دیكەش دا قورئان هەر دابەزێنراوە، ئنجا ئایا ئەوە چۆنە ؟ وەڵامەكەشی ئەوەیە كە سەرەتای دابەزینی قورئان لە مانگی ڕەمەزان دا بووە، ئەگەرنا لە هەموو مانگەكانی دیكەش دا قورئان دابەزیوە، لە ماوەی ئەو بیست و سیٚ ساڵەی تەمەنی موبارەكی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم)، كەواتە: خوای كاربەجیٚ كە فەرموویەتی: ﴿إِنَّآ أَنزَلۡنَٰهُ فِي لَيۡلَةِ ٱلۡقَدۡرِ﴾ واتە: سەرەتای دابەزینی قورئان لە شەوی قەدر داو لە مانگی ڕەمەزاندا بووە، بەڵام ئەوە كە دەگوتریٚ: سەرەتا قورئان لەلای خوا هاتۆتە (لوح المحفوظ) و دوایی لە (لوح المحفوظ)ەوە هاتوە بۆ ئاسمانی دنیا بۆ (بيت العزَّة)، ئەوە لە ڕاستی دا هەرچەندە شوێنەوار و ڕیوایەت هەن لەو بارەوە، بەڵام یەقین بۆ ئینسان پەیدا ناكەن، ئنجا ئەگەربێت و تەماشای ڕواڵەتی ئایەتەكانی قورئان بكەین، هەر ئەوەیان لیٚ وەردەگیریٚ، كە قورئان لە ماوەی بیست و سیٚ ساڵدا بۆ پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) دابەزێندراوە، وە كافرەكانیش ڕەخنەیان لەوە گرتوە:

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوۡلَا نُزِّلَ عَلَيۡهِ ٱلۡقُرۡءَانُ جُمۡلَةٗ وَٰحِدَةٗۚ كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَۖ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ٣٢﴾ الفرقان.

واتە: ئەوانەی بێبڕوان دەڵێن: بۆچی قورئانی بەیەكجار بۆی نایەتە خوار؟ {خواش عزوجل دەفەرمویٚ:} بۆیە وایە و پلە پلە بۆت دەنێرینە خوار، تاكو لە عەقڵ و دڵتدا بیچەسپێنین (یان دڵتی پیٚ دامەزراو بكەین)، وە بەشێنەیی وە بەڕیٚ و جیٚ بە سەرتیدا دەخوێنینەوە، بۆ ئەوەی كە چاك لەبەری بكەی.

بەڵام ئایا ئەم ئایەتە بەڵگەیە لەسەر ئەوەی كە خوا كتێبەكانی دیكەی بەیەكجار ناردوونە خوار؟ لە ڕاستی دا ئەم ئایەتە هیچ ئەوە ناگەیەنیٚ و ئەوەش هەر قسەی زانایانە و، ئەو شتانەی كە پەنهان (غيب) ن، ئێمە بۆ ئیسپاتیان پێویستیمان بە بەڵگەی یەقینیی هەیە، ئەگەرنا ئەوە تەنیا هەڵهێنجانەو بۆچوونەو، بۆ ئێمە نابێتە شتێكی پابەندكەر (مُلْزِم) دڵنیاكەر.



## بڕگەی هەشتەم:

## پێگەی قورئان لە ئیسلام دا:

ئەگەر تەماشای ئەم دوو ئایەتە بکەین، زۆر باش پایە و پێگەی قورئانمان بۆ دەردەکەوێ، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ:

﴿ وَكَذَٰلِكَ أَوْحَيْنَآ إِلَيْكَ رُوحًا مِّنْ أَمْرِنَا ۚ مَا كُنتَ تَدْرِى مَا ٱلْكِتَٰبُ وَلَا ٱلْإِيمَٰنُ وَلَٰكِن جَعَلْنَٰهُ نُورًا نَّهْدِى بِهِۦ مَن نَّشَآءُ مِنْ عِبَادِنَا ۚ وَإِنَّكَ لَتَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطٍ مُّسْتَقِيمٍ ﴿٥٢﴾ صِرَٰطِ ٱللَّهِ ٱلَّذِى لَهُۥ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ أَلَآ إِلَى ٱللَّهِ تَصِيرُ ٱلْأُمُورُ ﴿٥٣﴾ ﴾ الشورى.

وەك گوتمان: ئەم دوو ئایەتە موبارەکە، پێگەو پلەو پایەی قورئانمان لە ئیسلام دا، جوان دەخەنە بەرچاو، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ئاوا بەوشێوەیە ـ کە وەحییمان بۆ پێغەمبەرانی پێشوو ناردوە ـ ڕووحێکمان لە ئایینی خۆمان بۆ تۆ نارد {چونکە لە ئایەتی پێشوودا باسی چۆنیەتی ناردنی وەحی دەکات و دەفەرموێ:

﴿ وَمَا كَانَ لِبَشَرٍ أَن يُكَلِّمَهُ ٱللَّهُ إِلَّا وَحْيًا أَوْ مِن وَرَآئِ حِجَابٍ أَوْ يُرْسِلَ رَسُولًا فَيُوحِىَ بِإِذْنِهِۦ مَا يَشَآءُ ۚ إِنَّهُۥ عَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٥١﴾ ﴾ الشورى.

(وَكَذَٰلِكَ) کە پێشتر تەفسیرمان کرد واتە: چۆن وەحییمان ناردوە بۆ پێغەمبەرانی پێش تۆ (علیهم الصلاة والسلام) ئاواش وەحییمان بۆتۆ ناردوە} کە تۆ {پێش ئەوەی قورئانت بۆبێ ئەی موحەممەد (صلى الله علیه وسلم)} نەتدەزانی

نه‌كتێب چی یه و نه ئیمان چی یه! به‌ڵام ئێمه ئه‌م قورئانه‌مان كرد به ڕووناكیی یه‌ك، هه‌ر كام له به‌نده‌كانمان كه بمانه‌وێ پێی ڕێنمایی ده‌كه‌ین، وه بێگومان تۆ خه‌ڵك ڕێنمایی ده‌كه‌ی بۆ ڕاسته شه‌قام، ڕاسته شه‌قامی ئه‌و كه‌سه‌ی كه ئاسمانه‌كان و زه‌وی هی ئه‌ون، ئاگادار بن! كاروبار هه‌مووی بۆلای خوا ده‌گه‌ڕێته‌وه.

كه‌واته: لێره‌دا بۆمان ده‌رده‌كه‌وێ كه ئه‌م قورئانه ڕووحه، ڕووحی ژینه، ڕووحی دینه، وه ئه‌م قورئانه ڕۆشنایی یه و، پێش هاتنی ئه‌م قورئانه پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) نه‌یزانیوه نه كتێب چی یه {واته: به‌رنامه} و نه ئیمانیش چییه، به‌ڵام به‌هۆی قورئانه‌وه پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) زانی كه به‌رنامه‌ی ژیان ده‌بێ چۆن بێ، وه زانیشی ده‌بێ ئیمان چۆن بێ، به‌ڵێ بێگومان پێغه‌مبه‌ر (صلى الله عليه وسلم) خوای ناسیوه، به‌ڵام ئایا چۆن مامه‌ڵه له‌گه‌ڵ خوادا ده‌كرێ؟ چۆن به‌ندایه‌تیی بۆ خوا ده‌كرێ؟ ئه‌وه پێویستی به وه‌حی هه‌یه و پێویستی به‌م قورئانه هه‌بووه.

جا لێره‌دا ئێمه ده‌گه‌ینه ئه‌و ڕاستی یه كه قورئان هه‌م ئه‌سڵی ئیسلامه‌و، هه‌م به‌ڵگه و شایه‌دی ڕاستیی ئیسلامیشه، به‌ڵام بێگومان كه ده‌ڵێین: پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم) پێش هاتنی وه‌حی به‌رنامه و ئیمانی نه‌زانیوه، مانای ئه‌وه نیه كه خوای نه‌ناسیوه‌و، به‌ڕه‌وشتی به‌رز ڕازاوه نه‌بووه، به‌ڵێ خوای به‌رزومه‌زنی ناسیوه و، ڕه‌وشتی به‌رز و جوان بووه و، فیتره‌تی پاك بووه و، مه‌عده‌نی چاك بووه، به‌ڵام به‌به‌ڵگه‌ی ئه‌وه نه‌یزانیوه ئیمان چییه؟ و ئیسلام چییه؟ و شه‌ریعه‌ت چییه؟! چونكه كه‌سی بانگ نه‌كردوه بۆ هیچ، جا ئه‌گه‌ر زانیبای خه‌ڵكی بانگ ده‌كرد، ئه‌گه‌رنا بۆخۆی ئینسانێكی پاك و چاك و خواناس بووه‌و، له لووتكه‌ی خواناسیی دا بووه، به‌ڵام خواناسیی جیایه له خوا په‌رستیی، وه خوا په‌رستیی شه‌خسییش به شێوه‌یه‌كی فیتریی، جیایه له‌وه‌ی خوا بپه‌رستی به‌و شێوه‌یه كه خوا ده‌یه‌وێ و شه‌ریعه‌تی خوا ده‌یه‌وێ، وه خواپه‌رستییش دیسان جیایه له‌وه‌ی كه پێش خه‌ڵكی بكه‌وی، بۆ دینداریی و دنیاداریی، كه بێگومان پێغه‌مبه‌ری خوا (صلى الله عليه وسلم)، هه‌تا خوا قورئانی بۆ



نەناردوە، ئەوانەی نەزانیوە، کەواتە: قورئان ئەسڵی ئیسلامە و بەڵگە و شایەدی ڕاستیی ئیسلامیشە، ئایا پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) چی بە بەڵگە هێناوەتەوە، کە پێغەمبەری خوایە ؟ هەڵبەتە قورئان، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿ وَإِن كُنتُمْ فِي رَيْبٍ مِّمَّا نَزَّلْنَا عَلَىٰ عَبْدِنَا فَأْتُوا بِسُورَةٍ مِّن مِّثْلِهِ ﴾ البقرة: ٢٣.

واتە: وە ئەگەر لە گوماندان لەوەی بۆسەر بەندەی خۆمان دامان بەزاندوە، سوورەتێکی وەك ئەو بێنن.

بەڵێ موعجیزەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) و بەڵگەی ڕاستیی پێغەمبەری خوا، قورئان بووە، بۆیەش تەئکیدی لەسەر دەکەمەوە، چونکە فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەیە، کە هەندێ کەس بەهەڵە لێی تێدەگا، کە دەفەرموێ:

( ألا إِنِّي أُوتِيتُ الْكِتَابَ وَمِثْلَهُ مَعَهُ ) رواه احمد و ابوداود و الترمذي وقال حديث حسن غريب

واتە: ئاگادار بن! من کتێبم پێدراوە، وە وێنەی کتێبیشم پێدراوە لەگەڵی دا.

کە مەبەستی پێ فەرمایشتەکانی و ئەو وەحی یەیە کە پێی دەگوترێ: سوننەت، بەڵام ئایا سوننەت لەگەڵ قورئان دا دەخرێتە تەرازووەوەو، ئایا سوننەت وەك قورئان وایە ؟ بەتەئکید نەخێر، بەڵکو چەند جیاوازییەکیان هەن:



## چوار جیاوازیی لە نێوان قورئان و سوننەت دا

### یەکەم:

جارێ لەڕووی سەنەدەوە، قورئان هەمووی موتەواتیرە، واتە: کۆمەڵێکی زۆر لە پێغەمبەریان گێڕاوەتەوە هەتا گەیشتۆتە ئێمە، بەڵام سوننەت هەمووی موتەواتیر نیە، بەڵکو سوننەت تەنیا کەمێکی موتەواتیرە، ئەویش هەندێکی زۆر کەمی موتەواتیری فەرموودەیی (المتواتر القولي) یەو، ئەوی دیکە موتەواتیری کردەیی (المتواتر الفعلي) یە، زۆربەکەی دیکەی ڕاست (صحيح) و باش (حسن) ە، وە هەیە بێهێز (ضعيف) ەو، هەشە هەر بەناو سوننەتە، ئەگەرنا هەڵبەستراو (موضوع) ە! بەڵام قورئان هەمووی یەك پلەیە لەڕووی سەنەدەوەو، هەموو موتەواتیرە، ئەوە جیاوازیی یەکەم.

### دووەم:

قورئان دەستەوسانکەر (مُعجز) ەو، هیچ کەس ناتوانێ وەك قورئان بێنێ، نەك سوورەتێکی وەك (البقرة) کە (٢٨٦) ئایەتە، بەڵکو سوورەتێکی وەك (الكوثر) یش، کە (٣) ئایەتە و کورتترین سوورەتە، بەڵام سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) و فەرمایشتەکانی، هەرچەندە لە لووتکەی ڕەوانبێژیی و فەصاحەت دا بوون، بەڵام دەستەسانکەر نەبوون، بەبەڵگەی ئەوە کە ئەو هەموو حەدیسانە بە دەمی پێغەمبەرەوە هەڵبەستراون، بەڵام ئایا تا ئێستا هیچکەس توانیویەتی نەك سوورەتێك، بگرە تەنانەت ئایەتێك هەڵبەستێ ؟ نەخێر، بەڵام توانیویانە فەرموودە بە دەمی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) هەڵبەستن، هەڵبەتە ئەویش پسپۆڕ و زانای خۆی لێکی دەکاتەوە، کە ئەوە هەڵبەستراوە، بەڵام گرنگ ئەوەیە ئەگەر سوننەتیش وەك قورئان دەستەوسانکەر بووایە، کەس نەیدەتوانی شتی وابڵێ و، بە دەمی موبارەکی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) فەرمایشت دانە دەنرا.

**سێیەم:**

جیاوازیی سێیەمی نێوان قورئان و سوننەت ئەوەیە کە قورئان خودی خوێندنەوەکەی عیبادەتە، بەڵام دیارە دەقەکانی سوننەت وانین.

**چوارەم:**

پاشان قورئان ڕەها (مطلق) یە، چونکە لە زانیاری بێ سنووری خواوە سەرچاوەی گرتوە، بەڵام سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دیارە ئەوەی کە وەحی بێ، ئەوە لە خواوە بۆی هاتوە، بەڵام بەشێکیش لە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ئیجتیهادی خۆیەتی و ڕووحم بە قوربانی بێ، ئاوا لەو ئایەتە تێگەیشتوە و ئاوا لەو مەسەلەیە تێگەیشتوە، کە ئەویش ئەگەر لە ئیجتیهادێکدا نەیپێکابێ، خوای پەروەردگار بۆی ڕاست کردۆتەوە، وەك بەدیلگرتنی دیلەکانی جەنگی بەدر و، ڕوو وەرچەرخاندنی لە (عبدالله) ی کوڕی مەکتووم، وە مەسەلەی نوێژ کردن لەسەر (عبدالله) ی کوڕی ئوبەییەی کوڕی سەلوول و چەند مەسەلەیەکی دیکەش، کە خوا (سبحانه وتعالى) لەبارەیانەوە ڕەخنەی لێگرتوە و هەڵە ئیجتیهادییەکەی بۆ ڕاست کردۆتەوە.



## ڕوونکردنەوەی چۆنیەتی پەیوەندیی نێوان قورئان و سوننەت و، ڕاستکردنەوەی چەند بۆچوونێکی هەڵە:

١- هەندێ کەس قسەیەکی هەڵە دەکەن، دەڵێن: قورئان پێویستی بە سوننەتە، نەك سوننەت پێویستی بە قورئان بێ! دەڵێین: لە ڕاستی دا ناگونجێ وابێ، چونکە ئەگەر فەرمایشتی خوا پێویستی بە غەیری خۆی بێ، ڕوونی بکاتەوە، مانای وایە خۆی ڕوون (مبین) نیە، لە حاڵێك دا کە لە چەندان ئایەت دا خوا کتێبی خۆی بە (مبين) وەسف کردوە، وەك لە بڕگەی دەیەم دا باسی دەکەین، ئنجا یەکێ بۆی هەیە بڵێ: ئەدی بۆچی خوا دەفەرموێ:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: ئێمە (ذكر) مان بۆلای ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆیان نێردراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بۆ ئەوەی خۆشیان بیربکەنەوە؟! دەڵێین: ڕوون کردنەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بۆ قورئان، ئەوە نەبووە کە قورئان تەفسیر بکات و چونکە ئەگەر وابووایە تەفسیری دەکرد، کوا تەفسیری سوورەتی (البقرة) لەلایەن پێغەمبەری خواوە؟! کوا تەفسیری (آية الكرسي)؟ کوا تەفسیری سوورەتی (آل عمران) ؟! ئەدی مەبەست چی بووە ؟! یانی: قورئانمان بۆتۆ ناردوە، تاکو تۆ ئەو قورئانە بە کردار جێبەجێ بکەی و جێبەجێکردنەکەی لەلایەنی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) ڕوونکردنەوەکەیەتی، ئێمە ئێستا کە دەزانین قورئان چۆن کاری پێدەکرێ، ئەوە بەهۆی سوننەتی پێغەمبەرەوەیە (صلى الله عليه وسلم)، ئەگەرنا بە چەمکە باوەکەی تەفسیر، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قورئانی تەفسیر نەکردوەو، خوای بەرزیش، مەبەستی ئەوە نەبووە قورئان تەفسیر بکا، ئەگەر مەبەستی ئەوە بووایە، تەفسیری دەکرد، بەڵکو مەبەستی ئەوەبووە کە قورئانمان بۆتۆ ناردوە، تاکو تۆ جێبەجێی بکەی و، بە کردەوە حەرەکەی دین و ژینی پێبکەی، وە سەرەنجام بزانرێ کە ئەم قورئانە کام ئایەتەی لە کوێ بەکاردێ و، کام سوورەتەی لەکوێ بەکاردێ و، چۆن مامەڵەی لەگەڵ دا دەکرێ؟.



٢- مەسەلەیەکی دیکە هەر لەو بوارەدا کە پێویستە لێی ئاگاداربین، ئەوەیە کە: ئێمە هەتا باش لە قورئان شارەزا نەبین، لە سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) باش بەهرەمەند نابین، هەڵبەتە بەهۆی سەرنج دانی سوننەتەوە، زیاتر تێدەگەین کە قورئان چۆن کاری پێدەکرێ، نەك لە مانای قورئان تێدەگەین، بەڵام هەتا لە قورئان شارەزا نەبین، ئێمە بە خوێندنەوەی کتێبەکانی سوننەت، تێگەیشتن و بۆچوونێکی ڕاست و دروست و هاوسەنگمان دەربارەی ئیسلام بۆ پەیدا نابێت، بۆچی؟ چونکە خوا(سبحانه وتعالى) هەرچی پێویست بووە بۆ دین، لە قورئاندا ناردوویەتی، بەڵام هەندێك وردەکاریی (تفصيلات) هەیە کە لەپراکتیك و جێبەجێ کردن دا دێتە پێشێ، خوا ئەوەی عایدی پێغەمبەری کردوە، بۆیە ئەوەی پێویستی بە ڕوونکردنەوەی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) نەبێ، خوای کاربەجێ (سبحانه وتعالى) بۆخۆی لە قورئاندا ڕوونی کردۆتەوە، بەس ئەو شتانەی پێویستییان بە ڕوونکردنەوە هەبێ، لەکاتی جێبەجێ کردن (تطبيق)دا، ئەوە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) پێی هەڵساوە.

کەواتە: پەیوەندیی نێوان قورئان و سوننەت پەیوەندیی نێوان مەتن و شەرح نیە، بڵێین: قورئان مەتنەو سوننەت شەرحی دەکا، بەڵکو پەیوەندیی نێوانیان، تیۆر (نظرية) و جێبەجێکردن (تطبيق)، یاخود عیلم و عەمەلە، قورئان ئاوا دەفەرموێ و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئاوای جێبەجێ کردوە، قورئان ئاوا بڕیاری داوە و پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) ئاوا پیادەی کردوە.

ئایا بەڵگەمان چی یە بۆ ئەوە ؟ بەڵگەمان ئەو حەدیسەی صەحیحی (مسلم)ە[1]، کە (عبدالرحمن بن حارث) پرسیاری لە دایکمان عائیشە کردوە خوا لێی ڕازی بێ، دەربارەی هەڵسوکەوت و ڕەوشتی و ڕەفتاری پێغەمبەر، ئەویش (صلى الله عليه وسلم) گوتوویەتی:

(أَلَسْتَ تَقرأُ القرآنَ؟ ئایا قورئان ناخوێنی؟ (قال: بلى) گوتی: با، (قالت: كان خُلُقُ نبيِّ الله (صلى الله عليه وسلم) القرآن ) گوتی: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قورئان بوو، کەواتە: قورئان چی دەفەرموێ، پێغەمبەر

---

(١) بڕوانە: (صحيح مسلم) :٧٤٦ز

(صلی الله علیه وسلم) وای کردوە، لە هەڵسوکەوتی شەخسیی و خێزانیی و سیاسیی و لە هەموو ورد و درشتی ژیانی دا.

٣- وە لە کۆتایی ئەم خاڵەدا دەڵێین: لە ڕاستی دا قورئان و سوننەت دوو شت نین، هەندێك کەس وادەزانن قورئان و سوننەت دوو شتی لەیەك جیاوازن، بەڵکو قورئان و سوننەت دوو شتی تێك هەڵکێشن، بۆچی؟ چونکە سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) واتە: قورئان بە کردەوە و بەبەرجەستە کراویی و بە تەتبیق کراویی، کەواتە: سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) هەر قورئانە، بەڵام لە حالەتی تەنفیزکران و جێبەجێ کردندا، دیارە هەر شتێکیش کە لەحاڵەتی تیۆرییەوە دەهێنرێتە حاڵەتی جێبەجێکردنەوە، زیاتر ڕوون دەبێتەوە و چاکتر خەڵك لێی تێدەگا، کەواتە: ئێمە کە تەماشای سوننەت و سیرە و ڕێبازی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دەکەین، قورئانێکی زیندوو و بەرجەستە کراو دەبینین، بۆیەش دایکمان (عائشة) گوتوویەتی:
(كانَ خُلُقُ نبيِّ الله (صلى الله عليه وسلم) القُرءانْ).

## ئنجا سوننەت دەبێت بە سێ بەشی گشتی:

١- بەشێکی جەختکردنەوە (تأكيد) یە لەسەر ئەوەی کە لە قورئان دا هاتوە، بۆ وێنە: خوای پەروەردگار باسی چاکە لەگەڵ دایك و باب دەکا و، باسی ڕەوشتی جوان و بەرز دەکا و، باسی سیلەی ڕەحم دەکا، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لە فەرمایشتەکانیدا تەئکیدی لەسەر دەکاتەوە، ئەوە یەك.

٢- بەشی دووەمی سوننەت بریتیە لە ڕوونکردنەوەی ئەوەی کە لە قورئان دا باسکراوە، بۆ وێنە: قورئان دەفەرموێ: نوێژێ بکەن، ڕۆژوو بگرن، زەکات بدەن، حەج بکەن، پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) بە تەفصیل بۆی بەیان کردووین، چۆن نوێژ بکەین؟ چۆن حەج بکەین؟ چۆن زەکات بدەین؟ چۆن ڕۆژوو بگرین؟



**٣-** بەشی سێیەمی سوننەت، چەند شتێکە کە هەر لەسەرەتاوە سوننەت هێناونی بۆ وێنە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) هەموو خاوەن چڕنووکێکی لە باڵندەکان و، هەموو خاوەن کەڵبەیەکی لە دڕندەکانی، بە حەڕام داناوە، کە ئەوە لەقورئاندا نەهاتوە:

(عَنْ أَبِي هُرَيْرَةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، عَنِ النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ: كُلُّ ذِي نَابٍ مِنَ السِّبَاعِ فَأَكْلُهُ حَرَامٌ. وأَخْرَجَهُ مِنْ حديثِ ابنِ عَبَّاسٍ بلفظِ: نَهَى، وزادَ: (وَكُلُّ ذِي مِخْلَبٍ مِنَ الطَّيْرِ.)) رَوَاهُ مُسْلِمٌ.

واتە: هەر ئاژەڵێك كەڵبەی هەبێ (وەك: گورگ و چەقەڵ و پڵنگ و شێر...) وە هەر باڵندەیەك چڕنووكی هەبێت و بە قولاب بــێ، ئەوە خواردنی قەدەغەیە.

هەروەها پێغەمبەر قەدەغەی كردوە كە ئینسان ئافرەتێك و خوشكی دایكی، یاخود خوشكی بابی، بەیەكەوە كۆبكاتەوە، لە هاوسەرێتیی دا:

(عَنْ أَبي هُريرةَ رَضِيَ اللَّهُ عَنْهُ، أنَّ النبيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قالَ: ((لَا يُجْمَعُ بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَعَمَّتِهَا، وَلَا بَيْنَ الْمَرْأَةِ وَخَالَتِهَا)). مُتَّفَقٌ عليهِ.

کە ئەوەش تەنیا لە سوننەتی پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) هاتوە، بەڵام بێگومان قورئان دەلالەت لەسەر هەردووکیان دەکات.

شایانی باسیشە ئێمە باسێکی تاڕاددەیەک تێرو تەسەلمان لە بارەی سوننەتەوە لە کتێبی: (سوننەتی پێغەمبەر لە نێوان تێپەڕاندن و بەزایەدان)دا کردووە.



## بڕگەی نۆیەم:

## (محكمات و متشابهات):

لە قورئان دا دوو وشە بەكارهاتوون، بۆ پێناسەی ئایەتەكانی قورئان، كە بریتین لە: (محكمات و متشابهات)، وەك لە سوورەتی (آل عمران) دا، خوا ئایەتەكانی قورئان دەكاتە دوو بەش و دەفەرمویٚ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ مِنْهُ ءَايَٰتٌ مُّحْكَمَٰتٌ هُنَّ أُمُّ ٱلْكِتَٰبِ وَأُخَرُ مُتَشَٰبِهَٰتٌ ﴾ آل عمران: ٧.

واتە: خوا كتێبی بۆسەر تۆ ناردوە، هەندێك ئایەتی (موحكەم) ن، ئەوانە ئەسڵی كتێبن، وە هەندێكیشیان (موتەشابیه) ن.

كەواتە: ئایەتەكانی قورئان دەبنە دوو جۆر: (محكمات) و (متشابهات)، بەڵام لە شوێنێكی دیكە دا خوا (سبحانه وتعالى ) ئایەتەكانی قورئانی هەموو بە (محكمات) وەسف كردوونە، وەك دەفەرمویٚ:

﴿ الٓر كِتَٰبٌ أُحْكِمَتْ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتْ مِن لَّدُنْ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ﴿١﴾ ﴾ هود.

واتە: ئەلیف، لام، ڕا، ئەمە كتێبێكە ئایەتەكانی هەموو موحكەم كراون، پاشان ڕوون كراونەوە لەلایەن (خوای ) كاربەجێی شارەزاوە.

وە لە شوێنێكی دیكەدا هەموو ئایەتەكانی قورئان بە (متشابهات) وەسف كراون، عەكسی ئەوەی دی، وەك دەفەرمویٚ:

﴿ ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحْسَنَ ٱلْحَدِيثِ كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا ﴾ الزمر: ٢٣.

واتە: خوا باشترین فەرمایشتی ناردۆتە خوار، کتێبێکە ئایەتەکانی (متشابە) ن، جا ئەوە یانی چی؟

### زۆر بەکورتی دەڵێم:

زانایان دەربارەی پێناسەی هەرکام لە (محکم) و (متشابە) زۆر قسەیان کردوە، بەڵام من زۆر بە کورتیی و پوختیی دەڵێم: (محکم) واتە: قایم و پتەو کە کەلێن و درزی تێنەکەوێ، ئەوە مانای موحکەمە، دەڵێی: ئەو قەڵایە قەڵایەکی موحکەمە، واتە: قایم و پتەوە، (متشابە)یش واتە: وێکچوو، لێکچوو، جا کە خوا سبحانە وتعالی دەفەرموێ: لە قورئاندا ئایەتانێك هەن موحکەمن و، ئەوانە ئەسڵی قورئانن، واتە: زۆربەی ئایەتەکانی قورئان مانایان ڕۆشنە، چونکە (محکم) کەلە ئەسڵ دا بە مانای پتەو و قایم دێ، لێرەدا یانی: ئەو ئایەتانە یەك مانایان هەیە و مانایان ڕوونە، ئنجا کە دەفەرموێ: (وأُخر متشابهات) بەڵام هەندێك ئایەت لە قورئان دا هەن، مانای وێکچوویان هەیە، واتە: لە واتایەك زیاتر هەڵدەگرن، بۆیە مانایەکەیان ڕۆشن نیە، کەواتە: (محکم و متشابە): واتە: مەعنا ڕۆش و مەعنا وێکچوو، یان: یەك مەعنا هەڵگر و, چەند مەعنا هەڵگر.

بەڵام ئەوە کە خوا سبحانە وتعالی هەموو ئایەتەکانی قورئان بە (محکمات) وەسف دەکات، واتە: هەموو ئایەتەکانی قورئان لەو ڕووەوە کە ڕەخنەیان لێ ناگیرێ. موحکەمن، قایمن، پتەون و جێی ڕەخنەیان تێدا نیە، وە کە هەمووشیان بە (متشابە) وەسف دەکا، واتە: هەموو ئایەتەکانی قورئان وێك دەچن لە ڕێك و پێکیی و قایمیی و پتەویی و، لەوەدا کە هەڵەو کەم و کوڕیی ڕوویان تێناکات.

لەبەرگی دووەمی: (تەفسیری قورئانی بەرز و بەڕێز)یش دا کە سوورەتی (آل عمران) دەگرێتە خۆی، بە درێژیی باسی ئایەتە (محکم) و (متشابە)کانمان کردوە.



## بڕگه‌ی ده‌یه‌م: و كۆتایی:

## ته‌فسـیر و ته‌ئویـل:

دوو وشه له‌لایه‌ن زانایانه‌وه به‌كار هاتوون، بۆ لێكدانه‌وه‌ی ئایه‌ته‌كانی قورئان: وشه‌ی: ته‌فسیر و وشه‌ی: ته‌ئویل، پێناسه‌ی (تفسیر) ئاوا كراوه: (التفسیر: إظهار المعنى المعقول) واته: ده‌رخستنی مه‌عنایه‌كی مه‌عقووڵ كه بچێته عه‌قڵه‌وه[1]، وه پێناسه‌ی (تأویل) یش ئاوا كراوه: (الرجوع الى الأصل) واته: گه‌ڕانه‌وه بۆسه‌ر ئه‌سڵ[2].

كه‌واته: ته‌فسیر چی یه؟ واته: ڕوون كردنه‌وه‌ی مانای ئایه‌ته‌كانی قورئان، ئه‌دی ته‌ئویل چی یه؟ واته: ئایه‌تێك به ڕواڵه‌ت ئیشكالێك دروست ده‌كات، ده‌بێ بیگێڕیه‌وه سه‌ر ئه‌سڵه‌كه‌ی، بۆ وێنه: خوا سبحانه وتعالى ده‌فه‌رمویَ:

﴿وَهُوَ مَعَكُمْ أَيْنَ مَا كُنتُمْ﴾ الحدید: ٤.

واته: خوا له‌گه‌ڵتانه له هه‌ر شوێنێك بن، ئنجا ئایا ئێمه ده‌توانین مانا ڕواڵه‌تییه‌كه‌ی لێبگرین و بڵێین خوا ئێستا لێره‌یه؟ نه‌خێر ناتوانین، چونكه ئه‌وه دژ ده‌وه‌ستیَ له‌گه‌ڵ ئایه‌تی:

﴿لَيْسَ كَمِثْلِهِ شَيْءٌ﴾ الشورى: ١١، دا.

واته: هیچ شتیَ وه‌ك خوا نیه، كه‌واته: ناگونجیَ بڵێین: خوا لێره‌یه، هه‌روه‌ها

---

(١) مختار الصحاح، ص٤٣٨.

(٢) مختار الصحاح، ص٤٢.



دژ دەوەستێ لەگەڵ ئەوەدا کە دەفەرموێ: ﴿ثُمَّ ٱسْتَوَىٰ عَلَى ٱلْعَرْشِ﴾ الحديد: ٤. واتە: پاشان (خوا) چووە سەر عەرش، کەواتە: ناتوانین بڵێین: خوا لێرەیە، ئەدی مانای (وهو معكم أين ماكنتم) چی یە؟! دەبێ تەئویلی بکەین و بیگێڕینەوە بۆ ئەسڵەکەی، واتە: خوا لەگەڵتانە بە عیلم و قودرەتی و ئیرادەی و بەسیفەتەکانی لەگەڵتانە و، چاودێرتانە و بەسەرتان ڕادەگات و، لەژێر دەسەڵاتی خوا دەرباز نابن، ئاوا دەبێ بیگێڕیتەوە بۆ ئەسڵەکەی.

دیارە ئێمە دواتر لە خاڵی پێنجەم دا باسی چۆنیەتی تەفسیر کردنی قورئان و باشترین شێواز و ڕێبازی لێکدانەوەی قورئان دەکەین، بەڵام ئەوەی کە من لە کۆتایی ئەم بڕگەیەدا دەمەوێ بیڵێم، ئەوەیە کە هەموو قورئان پێویستی نەك بە تەئویل نیە، بەڵکو هەمووی پێویستی بە تەفسیریش نیە، بۆچی؟ چونکە: خوا سبحانە وتعالی ئەم قورئانەی ناردوە بۆ هەموو کەس و بۆ هەموو ئاستەکانی ناردوە، کەواتە: دەبێ هەموو کەس و هەموو ئاستەکان بەشی خۆیان لە قورئان تێبگەن، خۆ ئەو هەموو خەڵکە نابێتە توێژەرەوە (مُفَسر)! بەڵام هەموو کەس بەشی خۆی لە قورئان تێدەگا، جا ئایا بۆ ئەوە بەڵگەمان چی یە؟

بەڵگەمان ئەوەیە کە خوا سبحانە وتعالی لە چەندان ئایەتدا، ئەم قورئانە بەوە وەسف دەکات، کە ڕۆشنە و ئاشکرایە و لێی تێدەگەن و ئاسانکراوە بۆ تێگەیشتن، بۆ وێنە:

١- لەسەرەتای سووڕەتی (الحجر) دا دەفەرموێ:

﴿الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ وَقُرْءَانٍ مُّبِينٍ ﴿١﴾﴾ الحجر.

واتە: ئەلیف، لام، ڕا، ئەوانە ئایەتەکانی کتێب و قورئانێکی ڕوون (یان ڕوونکەرەوە)ن.

٢- وە لەسەرەتای (یوسف) دا دەفەرموێ:

﴿الٓر ۚ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿١﴾﴾ یوسف.

واتە: ئەلیف، لام، ڕا، ئەوانە ئایەتەکانی کتێبێکی ڕوون (یان ڕوونکەرەوە)ن.

٣- وە بە هەمان شێوە لەسەرەتای سووڕەتی (الشعراء) دا دەفەرموێ:

﴿طسٓمٓ ﴿١﴾ تِلْكَ ءَايَٰتُ ٱلْكِتَٰبِ ٱلْمُبِينِ ﴿٢﴾﴾ الشعراء.

واتە: طا، سین، میم، ئەو ئایەتانە هی کتێبێکی ڕۆشنن، یان ڕۆشن کەرەوەن.



٤- وە لە سوورەتی (النمل) دا دەفەرموێ:

﴿طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ١﴾ النمل.

واتە: طا، سین، ئەو ئایەتانە هی قورئان و کتێبێکی ڕوون و ئاشکرا (یان ڕوون کەرەوە)ن.

٥- وە لە سەرەتای سوورەتی (القصص) دا دەفەرموێ:

﴿طسٓمٓ ١ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ٢﴾ الشعراء.

٦- وە لە سەرەتای سوورەتی (الدخان) دا دەفەرموێ:

﴿حمٓ ١ وَٱلۡكِتَٰبِ ٱلۡمُبِينِ ٢﴾ الدخان.

٧- وە لە سەرەتای سوورەتی (فصلت) دا فەرموویەتی:

﴿كِتَٰبٞ فُصِّلَتۡ ءَايَٰتُهُۥ قُرۡءَانًا عَرَبِيّٗا لِّقَوۡمٖ يَعۡلَمُونَ ٣﴾ فصلت.

٨- وە لە سەرەتای سوورەتی (هود) دا فەرموویەتی:

﴿الٓرۚ كِتَٰبٌ أُحۡكِمَتۡ ءَايَٰتُهُۥ ثُمَّ فُصِّلَتۡ مِن لَّدُنۡ حَكِيمٍ خَبِيرٍ ١﴾ هود.

٩، ١٠، ١١، ١٢- وە لە چوار ئایەت لەسوورەتی (القمر): (١٧، ٢٢، ٣٢، ٤٠) دا دەفەرموێ:

﴿وَلَقَدۡ يَسَّرۡنَا ٱلۡقُرۡءَانَ لِلذِّكۡرِ فَهَلۡ مِن مُّدَّكِرٖ ١٧﴾ القمر.

واتە: بێگومان قورئانمان ئاسان کردوە بۆ لەبەرکردن، بۆ لێ تێگەیشتن، بۆ خوێندنەوە، ئایا کەس نیە بێ بیخوێنێتەوە، لەبەری بکا، لێی تێبگا ؟

کەواتە: دوای ئەوەی خوا سبحانە وتعالی لەم هەموو ئایەتانەدا دەفەرموێ: قورئان ڕوون و ئاشکرایە و ئاسانە، ئایا دەگونجێ بڵێین: توێژەرەوان نەبێ لە قورئان تێناگەن؟! نەخێر، بەڵکو هەموو کەس بەشی خۆی لێی تێدەگا، بەڵام ئایا هیچ کەس هەیە هەموو شتێ لە قورئان تێ بگا؟ نەخێر، بەس خوا سبحانە وتعالی هەموو نهێنییەکانی کە لە قورئان دا هەن دەیانزانێ، بەڵام هەر کەسە لە ئێمە لە قەدەر خۆی و بەقەدەر بیرکردنەوەی خۆی و، بەقەدەر خۆ ماندوو کردنی و بەقەدەر توانای خۆی، دەتوانێ لە قورئان حاڵی بێ، ئنجا بێگومان تەفسیر کردن و لێکدانەوەی زاناو شارەزایانیش بۆ ئەوەیە: ئەو ئایەتانەی کە هەموو کەس لێیان تێناگات، ڕوونیان بکەنەوە و لێتێگەیشتنیان بۆ خەڵکی ئاسان بکەن.



## خاڵی دووەم

# ئیمان پێهێنان و متمانە هەبوون به قورئـــان

دووەمین ئەركمان لە بەرانبەر قورئاندا ئەوەیە كە پاش ئاشنا بوون بە قورئان و ناسینی قورئان " كە لە خاڵی یەكەمدا بە درێژی باسمان كرد"، ئیمانی پێبینین وە متمانەمان پێی هەبێ، كە دیارە ئیمان پێهێنان و متمانە هەبوون بە قورئان، دوو شتی تێكهەڵكێشن، بەڵام یەك شت نین و لەیەك جیان، هەرچەندە بەیەكەوە پەیوەستن، دیارە بڕوا هێنان بە قورئان، واتە: ئیمان هێنان بەوە كە قورئان دوایین كتێبی خوایە (سبحانە وتعالی) و دوایین پەیامی خوایە، بە پێغەمبەری كۆتایی خۆیدا ناردوویەتی و، ئەویش لە جیبریل (علیە الصلاة والسلام) وەری گرتوە، كە وەك پێشتر باسمان كرد، ئایەتەكان و فەرمایشتەكان ئەوە دەگەیەنن، (جیبریل) سەرۆكی هەموو فریشتەكانی خوای پەروەردگار بێ، بۆیە خوا (سبحانە وتعالی) ئەوی دیاری كردوە كە پەیك و پەیام هێنەری بێت بۆ پێغەمبەران (علیهم الصلاة والسلام).

وە مەبەستیشمان لە متمانە و باوەڕ هەبوون بە قورئان، ئەوەیە كە هەرچی قورئان گرتوویەتە خۆی، لە سەدا سەد هەمووی ڕاستەو، بەقەد نووكی دەرزی كەم و كووڕیی تێدا نیە، جا چ ئێمە لە هەمووی تێبگەین، چ لە هەندێكی تێنەگەین، گرنگ ئەوەیە كە ئێمە ـ مادام خۆمان بە مسوڵمان بزانین ـ دەبێ متمانەمان هەبێ بەوە كە هەرچی لە قورئان دا هەیە، لە سەدا سەد ڕاستە و، بەقەد نووكی دەرزی كەلێن و كەم و كووڕیی تێدا نیە، دیارە متمانە هەبوون بە



ڕاستێتی قورئانیش، بەرهەم و زادەی ئیمان هێنانە بە قورئان و، هەر کەسێك بڕوای وابێ و قەناعەتی وابێ کە قورئان فەرمایشتی خوا و کتێبی خوایە (سبحانە وتعالی)، ئەوە بە تەئکید ئەو قەناعەت و بڕوایە چەندە بەهێز بێ لە دڵیدا، هێندەش متمانە هەبوون و باوەڕ هەبوون بە قورئان لە دڵیدا بەهێز دەبێ، چونکە خوا (سبحانە وتعالی) سیفەتەکانیشی وەك خۆینی، خواش (سبحانە وتعالی) بەرزترین و تەواوترین زاتە، بەڵکو هیچ شتێ وەك خوا نیە، وە خوا وەك هیچ شتێ نیە، وەك فەرموویەتی:

﴿لَيۡسَ كَمِثۡلِهِۦ شَيۡءٞ﴾ الشوری: ١١.

دیارە ئەوەش هەم زاتی دەگرێتەوە و هەم سیفەتەکانیشی، کەواتە: سیفەتەکانی خوا تەواوترین و چاکترین سیفەتن، وەك چۆن زاتی خوا تەواوترین زاتەو، هەر خوا (سبحانە وتعالی) بوونەکەی لە خۆیەوەیە و، غەیری خوا هەمووی بوونەکەی پێدراوە، ئەوەتا کاتێك فیرعەون لە مووسا و هاروونی برای (علیهما الصلاة والسلام) دەپرسێ:

﴿فَمَن رَّبُّكُمَا يَٰمُوسَىٰ﴾ طه: ٤٩.

پەروەردگارتان کێیە ئەی مووسا؟ مووسا (علیه الصلاة والسلام) زۆر بەکورتیی وەڵامی دەداتەوە و دەڵێ:

﴿قَالَ رَبُّنَا ٱلَّذِيٓ أَعۡطَىٰ كُلَّ شَيۡءٍ خَلۡقَهُۥ ثُمَّ هَدَىٰ ٥٠﴾ طه.

پەروەردگارمان ئەو کەسەیە بوونی بەهەموو شتێك داوە، پاشان ڕێنماییشی کردوە، بەڵێ تەنیا خوا (سبحانە وتعالی) بوونەکەی لە خۆیەوەیە و غەیری خوا هەمووی بوونی پێدراوە، بۆیە کاتێکیش دێ کە بوونەکەیان لێوەردەگرێتەوە، سیفەتەکانی خواش بە هەمان شێوە، بەبێ سنوور، پەسند و چاك و تێر و تەواون، واتە: کە باسی زانیاری خوا دەکەین، زانیاری خوا سنووری نیە، ئەوە نیە بڵێی خوای پەروەردگار ئەو شتانە دەزانێ، بەڵام شتێك هەیە نایزانێ:

﴿إِنَّ ٱللَّهَ بِكُلِّ شَيۡءٍ عَلِيمٌ﴾ الأنفال: ٧٥ .

واتە: بێگومان خوا بەهەموو شێوەیەك زانایە.



وه‌ كه‌ باسی ڕه‌حمه‌تی خوا ده‌كه‌ین، ڕه‌حمه‌تی خوا بێسنووره‌، وه‌ك فه‌رموویه‌تی:

﴿ وَرَحْمَتِي وَسِعَتْ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ الأعراف: ١٥٦.

واته‌: ڕه‌حمه‌تی من هه‌موو شتێكی گرتۆته‌وه‌، وه‌ كه‌ باسی ویستی خوا ده‌كه‌ین، ده‌ڵێین: هیچ شتێك نیه‌ له‌ ژێر كۆنترۆڵ و ئیراده‌ی خوا بچێته‌ ده‌ر، وه‌ كه‌ باسی ده‌سه‌ڵاتی خوا ده‌كه‌ین، باسی ده‌سه‌ڵاتێكی بێ سنوور ده‌كه‌ین:

﴿ إِنَّ اللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَيْءٍ قَدِيرٌ ﴾ البقرة: ٢٠.

واته‌: خوا له‌سه‌ر هه‌موو شتێ به‌ توانایه‌. هه‌روه‌ها ویستی خوا بێ سنووره‌ و هه‌رچی بیه‌وێ ده‌یكات و ویستی خوا هه‌موو شتێ ده‌گرێته‌وه‌:

﴿ إِنَّ رَبَّكَ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴾ هود: ١٠٧.

وه‌ فه‌رمایشتی خواش كه‌ بێگومان قورئان فه‌رمایشتی خوایه‌، ئه‌ویش وه‌ك هه‌موو سیفه‌ته‌كانی خوا، له‌و په‌ڕی ته‌واویی دایه‌، وه‌ك خوا ده‌فه‌رموێ:

﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾ الأنعام: ١١٥.

وه‌ فه‌رمایشتی په‌روه‌ردگارت ته‌واوی كردوه‌ له‌ ڕاستیی و له‌ دادگه‌رییدا، چونكه‌ فه‌رمایشتی خوا ده‌بێته‌وه‌ به‌ دوو جۆر: یان هه‌واڵ دانه‌، یاخود بڕیاردانه‌، هه‌واڵه‌كانی خوا (سبحانه وتعالى) ئه‌وه‌ی كه‌ خوا هه‌واڵی پێ ده‌دا، له‌ سه‌دا سه‌د ڕاستن، هه‌روه‌ها حوكم و بڕیاره‌كانیشی له‌ سه‌دا سه‌د دادگه‌رانه‌ و به‌جێن به‌ڵێ، فه‌رمایشتی په‌روه‌ردگارمان له‌ ڕاستیی دا و له‌ دادگه‌رییدا ته‌واویان كردوه‌.

ئێستاش دوای ئه‌م ڕوونكردنه‌وه‌یه‌ با ته‌ماشای ئه‌م چه‌ند ئایه‌ته‌ به‌ پێزه‌ی خوای په‌روه‌ردگار بكه‌ین، كه‌ چۆن له‌سه‌ر مسوڵمانان و ئیمانداران پێویست ده‌كات، ئیمان به‌ كتێبی خوا بێنن و، متمانه‌شیان هه‌بێ به‌ كتێبی خوا، خوا (سبحانه وتعالى) ده‌فه‌رموێ:

١- ﴿ يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا آمِنُوا بِاللَّهِ وَرَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِ وَالْكِتَابِ الَّذِي أَنزَلَ مِن قَبْلُ ۚ وَمَن يَكْفُرْ بِاللَّهِ وَمَلَائِكَتِهِ وَكُتُبِهِ وَرُسُلِهِ وَالْيَوْمِ الْآخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَالًا بَعِيدًا ﴿١٣٦﴾ ﴾ النساء.

خوا (سبحانه وتعالى) ڕوو له ئێمەی مسوڵمان و خاوەن ئیمان دەكات و دەفەرموێ: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئیمان بێنن به خوا و پێغەمبەرەكـەی (صلى الله عليه وسلم) وه بـەو كتێبـەی ناردوویەته سـەر پێغەمبەرەكەی، وه بەو كتێبەی كه له پێشەوە ناردوویەتی {واته: به هەموو ئەو كتێبانەی له پێشدا ناردوونی، یانی: پێش قورئان} ئەدی كەسێك ئیمان نەهێنێ؟ ﴿وَمَن يَكْفُرْ بِٱللَّهِ وَمَلَـٰٓئِكَتِهِۦ وَكُتُبِهِۦ وَرُسُلِهِۦ وَٱلْيَوْمِ ٱلْـَٔاخِرِ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَـٰلًۢا بَعِيدًا﴾ وه هەر كەسێك بێ بڕوا بێت به خوا و فریشتەكانی خوا و كتێبەكانی خواو و پێغەمبەرانی خوا و به ڕۆژی دوایی، ئەوە زۆر به شێوەیەكی ئاشكرا گومڕابووە، واته: گومڕابوونەكەی هیچ تەم و مژی لەسەر نیه.

كەواته: ئێمەی ئیماندار لەسەرمان پێویست كراوه كه ئیمان به كتێبی خوا بێنین.

### لێرەدا پرسیارێك دروست دەبێ:

باشه كه ئێمه ئیمانداریـن دیاره ئیمانمان بەكتێبی خوا هەیه، ئەدی بۆچی خوا دەفەرموێ:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓا۟ ءَامِنُوا۟ بِٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِى نَزَّلَ عَلَىٰ رَسُولِهِۦ وَٱلْكِتَـٰبِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ مِن قَبْلُ﴾.

**وەڵامەكەی** هەر ئەوەیه كه ئیمان پله پلەیه، ئایا ئیمانی جیبریل (عليه الصلاة والسلام) وەك ئیمانی خەڵكی دیكه وایه؟ به تەئكید نەخێر، وه ئایا ئیمانی پێغەمبەری كۆتایی وه باقی پێغەمبەرانی دیكه، وەك ئیمانی خەڵكی دیكه وایه؟ به تەئكید نەخێر، وه ئایا ئیمانی هاوەڵانی بەڕێزی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) وه بـنەماڵه و خزمانی نزیكـی، كه له خزمەتی دابوون و ڕۆژانه و شەوانه بینیویانه كه وەحی بۆ سەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دابەزیوە، وەك ئیمانی خەڵكی دیكه وایه، كه لەو جەوەدا نەژیاون؟ بێگومان نەخێر، كەواته: ئیمان پله پلەیه، بۆیەش خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرموێ: ئیمان بێنن، واته: ئیمانەكەتان تەواوتر بكەن و پله پله سەركەون، هەتا ئیمانێكی تەواو و كامڵ و تێر و تەسەل به دەست دێنن.



٢- هەروەها لە سوورەتی (الأنعام) دا خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرمویٚ:

﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ۚ وَٱلَّذِينَ ءَاتَيْنَٰهُمُ ٱلْكِتَٰبَ يَعْلَمُونَ أَنَّهُۥ مُنَزَّلٌ مِّن رَّبِّكَ بِٱلْحَقِّ ۖ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿١١٤﴾ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ۚ لَّا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ ۚ وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴿١١٥﴾ ﴾ الأنعام.

خوا تبارك و تعالى لەسەر زمانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرمویٚ: ئایا جگە لە خوا دادوەرێکی دیکە، یاخود حوکمڕانێکی دیکە (بە مانای حەڵاڵ و حەڕام دانەر) بخوازم؟ لە حاڵێکدا کە ئەو کتێبی بۆ ئێوە ناردوە و ڕوونی کردۆتەوە، واتە: هەموو شتێکی تێدا ڕوون کردۆتەوە، {واتە: چۆن بۆم هەیە غەیری ئەو خوایە کە کتێب و بەرنامەی ناردوە و هەموو شتێکی تێکی تێدا ڕوون کردۆتەوە، بکەم بە دادوەر و حوکمڕانی خۆم؟} وە ئەوانەش کە کتێبمان پێداون {واتە: زانایانی جوولەکە و نەصرانیی و ئەوانی دیکەش، کە خۆیان بە خاوەن کتێبی ئاسمانیی دەزانن}، دڵنیان کە لە لایەن پەروەردگارتەوە بۆ تۆ هاتوە و بە حەق هاتوە، کەواتە: تۆ لەوانە مەبە کە دەکەونە گومان و دوو دڵییەوە، {دیارە لێرە دا ڕووی دواندن لە پێغەمبەرە (صلى الله عليه وسلم)، بەڵام مەبەست پێی خەڵکی دیکەیە، مەبەست پێی ئۆممەتەکەیەتی و مەبەست پێی هەر کەسێکە کە قورئان دەخوێنیٚ}، پاشان دەفەرمویٚ:

﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا وَهُوَ ٱلسَّمِيعُ ٱلْعَلِيمُ ﴾ الأنعام: ١١٥.

وە وشەی پەروەردگارت {واتە: وشەکانـــی، فەرمایشتەکانی پەروەردگارت} تەواویان کردوە لە ڕاستیی و لە دادگەرییدا، گۆڕین نیە بۆ فەرمایشت و وشەکانی خوا، وە خوا بیسەری زانایە، (بیسەر)ە، قسەی خەڵك دەبیستیٚ و داوایان دەبیستیٚ و دەنگەکانیان دەبیستیٚ، وە (زانا) یەو دەزانیٚ چییان پێویستە؟ بۆیە کتێبی خۆی کە ناردوە بە تەواویی وەڵامگۆی داخوازییەکانی ئەو ئینسانانەیەو، وەڵامگۆی داخوازییە فیطرییەکانیانە.

٣- هەروەها خوا ڕوو لە پێغەمبەری خاتەم موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) دەکات، بەڵام وەك گوتراوە: دیوار لەگەڵ تۆمە، گویٚ سوانە گوێت لێبیٚ، بە

ڕواڵەت ڕووی له پێغەمبەره، بەڵام له ڕاستی دا لەگەڵ ئۆممەتی پێغەمبەریەتی (صلى الله عليه وسلم)، دەفەرموێ:

﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ ۚ لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ ﴿٩٤﴾ وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُوا۟ بِـَٔايَٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَٰسِرِينَ ﴿٩٥﴾ ﴾ يونس.

پێش ئەوەی ئەم دوو ئایەتە تەفسیر بکەم و مانایان لێکبدەمەوە بە کوردی و بە کورتی، دەڵێم: متمانە هەبوون بە ڕاستیی قورئان و ئیمان هەبوون بەوە کە فەرمایشتی خوایە، وە متمانە پێ بوونی کە هەرچی تێدایە حەقە، زۆرشتێکی گەورەیە وتەنانەت پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم)یش کە خوا ئەم قورئانەی ناردۆتە سەر دڵ و دەروونی و، بێگومان بە قەدەر نووکی دەرزی خەتەرەی گومان و دوو دڵیی بە دڵدا نەهاتوە، کەچی دیسان خوا (سبحانه وتعالى) ئەو ڕاستییەی دەخاتەوە بەرچاو، کە وەك گوتم زیاتر مەبەست پێی ئۆممەتەکەیەتی، بەڵام بەهەر حاڵ ڕووی دواندنیش لەوە، دەفەرموێ: ﴿ فَإِن كُنتَ فِي شَكٍّ مِّمَّآ أَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ﴾ ئنجا ئەگەر لە دوودڵیی دابووی، لەوەدا کە ناردوومانەتە خوارێ بۆتۆ {کە قورئانە، وشەی (شك) لە زمانی عەرەبیی دا ئەوەیە کە بوون و نەبوونی شتێك بەقەد یەك دابنێی و، هەردوو لای وەك یەك بن، کە ئەوە بەکوردیی پێی دەڵێین: {دوو دڵیی}[1]، بەڵام گومان (ظن) ئەوەیە کە پێت وابێ شتێك ئەگەری بوونەکەی زیاترە لە نەبوونەکەی، یاخود ئەگەری نەبوونی زیاترە لە بوونەکەی و لایەکیان زاڵە بەسەر لایەکیان دا، ئەگەر دوو دڵ بووی لەوەدا کە بۆ لای تۆمان ناردۆتە خوارێ}: ﴿ فَسْـَٔلِ ٱلَّذِينَ يَقْرَءُونَ ٱلْكِتَٰبَ مِن قَبْلِكَ ﴾ئەوە لەوانە بپرسە کە لە پێش تۆدا کتێبیان خوێندۆتەوە {واتە: لە شارەزایانی کتێبەکانی خوا بپرسە، ئەوانەی شارەزای کتێبە ئاسمانییەکانن، ئەگەر لەوان بپرسی، دڵنیا دەبی ئەو قورئانەش کە بۆتۆ هاتوە، دوایین کتێبی خوایە، چونکە لەو کتێبانەی پێشوودا هەواڵ دراوە بە هاتنی قورئان، وە هەواڵ

---

(١) مختار الصحاح، ص٣٠٧.



دراوە بە هاتنی پێغەمبەری کۆتایش موحەممەد (صلى الله عليه وسلم)}
﴿لَقَدْ جَآءَكَ ٱلْحَقُّ مِن رَّبِّكَ﴾ بێگومان لەپەروەردگارتەوە حەقت بۆ هاتوە ﴿فَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلْمُمْتَرِينَ﴾ ئنجا بە هیچ شێوەیەك لەوانە نەبیٚ کە دەکەونە دوو دڵییەوە ﴿وَلَا تَكُونَنَّ مِنَ ٱلَّذِينَ كَذَّبُواْ بِـَٔايَـٰتِ ٱللَّهِ فَتَكُونَ مِنَ ٱلْخَـٰسِرِينَ﴾ وە بە هیچ شێوەیەك لەو کەسانە مەبە، کە ئایەتەکانی خوا بە درۆ دەزانن، ئەگەر وابیٚ، لە زیان باران دەبیٚ.

٤- وە لە سوورەتی (البقرة) دا، خوا (سبحانه وتعالى) دەفەرمویٚ :
﴿الٓمٓ ۝١ ذَٰلِكَ ٱلْكِتَـٰبُ لَا رَيْبَ ۛ فِيهِ ۛ هُدًى لِّلْمُتَّقِينَ ۝٢﴾ البقرة.

ئەلیف، لام، میم، ئەو کتێبە گومانی تێدا نیە، ڕێنماییە بۆ پارێزکاران.

هەڵبەتە ئەم ئایەتانەم هەر بە نموونە هێناونەوە، ئەگەرنا ئایەتی دیکە زۆرن لەو بارەوەو، هەموو ئەو ئایەتانە ئەم دوو ڕاستییەمان دەخەنە بەر دەست:

أ- کە هەر کەسێك خۆی بە ئیماندار بە بڕوادار بزانیٚ، دەبیٚ سەدا سەد بڕوای بەوەبیٚ کە قورئان فەرمایشتی خوایە.

ب- وە پاشان باوەڕ و متمانەشی هەبیٚ بەو فەرمایشتەی خوا، کە هەرچی تێیدا هاتوە: حەق و ڕاستە و هیچ خەوش و پەڵە و هیچ ناڕێکییەکی تێدا نیە.

جا لێرەدا با تەماشا بکەین: ئایا بڕوا هەبوون بە قورئان، وە باوەڕ پیٚ بوونی، {(بڕوا) مانای (إيمان)ە، و (باوەڕ) یش مانای (ثقة) یە}، لە چی دا دەردەکەویٚ؟! کە دیارە هەردووکیان شێرراوەن، وەك لە (أَثر)دا هاتوە: ((الإيمانُ سِرٌّ وَالإسلامُ عَلانية)) واتە: ((ئیمان پەنهانە و ئیسلامیش ئاشکرایە)) جا ئایا ئێمە چۆن بزانین خۆمان، یان خەڵك ئیمانی بە قورئان هەیە، وە متمانەی پیٚی هەیە؟

لەڕاستیدا ئەوە لـــە هەڵوێست و ڕەفتارەکان دا دەردەکەوێت و بەرجەستە دەبیٚ، هەرکەسە چەندە ئیمانی بە قورئان هەیەو، چەندە متمانەی بە قورئان هەیە، ئنجا من لەوبارەوە چوار شتم کردوون بە تەرازوو:



## چوار پێوەر بۆ زانینی ئەندازەی بڕواو باوەڕ هەبوون بەقورئان

**یەکەم:** هەندێك لە زانایان و لە توێژەرەوانی قورئان - کە دوایە ئاماژە بەدوو سێ وێنە دەکەم - لە ژێر زەختی ئەو واقیعە فیکریی و سیاسییەدا کە تێیدا ژیاون، زۆر جار ویستوویانە ئایەتەکان بە جۆرێك مانا بکەن، کە لەگەڵ ڕواڵەتی ئەو مانایە دا ناگونجێ، کە ڕواڵەتی ئایەتەکان دەیگەنن.

**بە واتایەکی دیکە:** ویستوویانە ئایەتەکان مل پێبسووڕێنن بەملا و لادا، بۆچی؟ بۆ ئەوەی بچێتە عەقڵی هەندێك خەڵکەوە، لە هەندێك تەفسیردا بینیومە دەڵێ: ئێمە ئەم ئایەتە ئەگەر وەك ڕواڵەتەکەی تەفسیری بکەین، ناچێتە عەقڵی خەڵکەوە، لەبەر ئەوە دەبێ بە نەوعێك تەفسیری بکەین بچێتە عەقڵی خەڵکەوە، ئنجا ئایا ئەو هەڵوێستە ڕاستە؟! بە تەئکید نەخێر، دەچێتە عەقڵی خەڵك یان ناچێتە عەقڵیانەوە، ئەوە خەتای عەقڵی خەڵکە، کە مانایەکی ڕاست و دروستی ئایەتی خوای کاربەجێی تێدا جێنابێتەوە، دەبێ خەڵك گلەیی لە عەقڵی خۆی بکات و، دەبێ خەڵك عەقڵی خۆی ڕاست بکاتەوە، نەك ئایەتەکان پێ مل پێ بسووڕێنن و بیانگۆڕن و، واتایەکی سەیرۆکەیان لێبدەن، کەلەگەڵ عەقڵی خەڵکدا بگونجێ!

ئەلێرەدا ئیمان هەبوون بە قورئان و متمانە هەبوون بە قورئان، یاخود نەبوون، یاخود پلەکەی چەندە، لێرەدا دەردەکەوێ، بۆ نموونە: (شێخ موحەممەد عەبدەی میصرِیی) کە زانایەکی ناوداری ئیسلامە، لە تەفسیری ئەو ئایەتانەدا کە باسی لەت بوونی دەریای سوور دەکەن بۆ مووسا (علیه الصلاة والسلام) و بۆ بەنی ئیسرائیل، کاتێك کە لە چەنگی فیرعەون ڕادەکەن، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿ وَإِذْ فَرَقْنَا بِكُمُ ٱلْبَحْرَ فَأَنجَيْنَٰكُمْ وَأَغْرَقْنَآ ءَالَ فِرْعَوْنَ وَأَنتُمْ تَنظُرُونَ ۝٥٠ ﴾ البقرة.

واتە: یاد بکەنەوە {ئەی جوولەکەکانی سەردەمی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)! خوا چ چاکەیەکی لەگەڵ پێشینانتان کردوە} کاتێك کە دەریامان لەت کرد و ئێوەمان دەرباز کرد و فیرعەون و دارودەستەکەیشیمان خنکاندن و، ئێوەش تەماشاتان دەکردن، جا هەندێک لە توێژەرەوانی قورئان کە شێخ موحەممەد



عەبدە لێیانەوە نەقڵ دەکات، لێرەدا چۆنی تەفسیر دەکەن؟! دەڵێن: {لەو حاڵەتەدا دیارە هەڵکشان و داکشانی دەریا بووە، کە لە ئەنجامی هێزی کێشندەی نێوانی مانگ وزەوی دا دەریا هەڵکشان و داکشان (مدّ و جزر) ی دەبێ جا، دەڵێ: ئەوکاتە دەریا لە حاڵەتی داکشان (جَزْر) بووە کە پەڕیونەوە!} کە بێگومان ئەوە شتێکی دوورە!! بەڵام شێخ موحەممەد عەبدە هەروەک زانایانی دیکە ئایەتەکان تەفسیر دەکات[1].

هەروەها (طيراً أبابيل) کە خوا لە سوورەتی (الفيل) دا باسی کردوون و جۆرە باڵندەیەك بوون و، خوا وەك سوپایەکی تایبەتی خۆی بەکاری هێناون بۆ لە نێو بردنی سوپایەکەی ئەبرەهە، کە هاتبوو بۆ ڕووخاندنی کەعبە، وەك فەرموویەتی:

﴿أَلَمْ تَرَ كَيْفَ فَعَلَ رَبُّكَ بِأَصْحَابِ الْفِيلِ ﴿١﴾ أَلَمْ يَجْعَلْ كَيْدَهُمْ فِي تَضْلِيلٍ ﴿٢﴾ وَأَرْسَلَ عَلَيْهِمْ طَيْرًا أَبَابِيلَ ﴿٣﴾ تَرْمِيهِمْ بِحِجَارَةٍ مِنْ سِجِّيلٍ ﴿٤﴾ فَجَعَلَهُمْ كَعَصْفٍ مَأْكُولٍ﴾ الفيل.

کەچی ئەو دەڵێ: (سوپایەکەی ئەبرەهە تووشی نەخۆشیی طاعوون بوون) واتە: (طيراً أبابيل) بە میکرۆب وەسف دەکات، میکرۆبێك کە نابینرێ!![2]

وە خوا عزوجل لە سوورەتی (آل عمران) دا باسی مەسەلەیەك دەکا و دەفەرموێ: جوولەکەکان بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) یان گوت:

﴿إِنَّ اللَّهَ عَهِدَ إِلَيْنَا أَلَّا نُؤْمِنَ لِرَسُولٍ حَتَّىٰ يَأْتِيَنَا بِقُرْبَانٍ تَأْكُلُهُ النَّارُ﴾ آل عمران: ١٨٣.

واتە: خوا پێیڕاگەیاندووین کە ئیمان بە هیچ پێغەمبەرێك ناهێنین تاکو قوربانییەکمان بۆ نەکا، کە ئاگر بێتە خوار لە ئاسمانێ و بیخوات و بیسووتێنێ! (محمد رشيد رضا) خوا لێی خۆشبێ ئاوای تەفسیر دەکا و دەڵێ: (مەرج نیە ئەوە بووبێ، بەڵام مەبەست ئەوەیە کە بۆخۆیان قوربانییەکەیان سووتاندووە ئاگریان تێبەرداوە)، کەچی خوا بە دەقی ئایەت دەفەرموێ:

---

(١) بڕوانە: الأعمال الكاملة للامام محمد عبده، الجزء الرابع: في تفسير القران، ص١٨٣،١٨٢. بەڵام (شێخ محمد عبده) بۆخۆی هەروەک زانایانی دیکە ئەو مەسەلەیە تەفسیر دەکات، وە ئەو کەسانەش، کە ئەو جۆرە تەفسیرکردنە هەڵدەبژێرن ناویان دەنێ: (الذين لا يحبون المعجزات من المتهورين).

(٢) سەرچاوەی پێشوو، الجزء الخامس، في تفسير القرآن ص ٥٢٨، ٥٢٩.



﴿قُلْ قَدْ جَآءَكُمْ رُسُلٌ مِّن قَبْلِى بِٱلْبَيِّنَٰتِ وَبِٱلَّذِى قُلْتُمْ فَلِمَ قَتَلْتُمُوهُمْ إِن كُنتُمْ صَٰدِقِينَ﴾ آل عمران: ١٨٣.

واته: بڵێ له پێش مندا پێغەمبەرانێك بەڵگەی ڕوون و ئاشكرایان بۆ هێناون و، ئەوەش كه دەیڵێن ئەوەشیان بۆ هێنان.

ئنجا كه تۆ تەماشای تەوڕات دەكەی، له تەوڕات دا هەیه كه چەند جارێك جوولەكەكان قوربانییان كردوه و، ئەو كاته موعجیزه بووه بۆ مووسا (علیه الصلاة والسلام)، وه له سەردەمی (سُلیمان) یش دا بووه و له سەردەمی پێغەمبەرانی دیكەش دابووه، كه دوای ئەوەی قوربانییان كردوه، ئاگر له ئاسمانێ هاتۆته خوارێ و سووتاندوویەتی و بۆته قەرەبرووت و ئەوه موعجیزەیەك بووه[1]، بەڵام كه له عەقڵی خەڵكی ئەم سەردەمەوه ناچێ، تۆ بێنی مانایەكی دیكەی سەیری لێبدەیەوه، ئەوه بەڕاستی جۆرێكه له كەمیی متمانه هەبوون، كه لەوانەیه ئەو كەسە له قەراری نەفسی خۆیشیدا بزانێ كه ئەو مانایەی نیه، بەڵام دەڵێ: ئاخر مانایەكەی دیكه ناچێته عەقڵی خەڵكەوەو با بیگونجێنین لەگەڵ عەقڵی خەڵك دا!! بەڵام بێگومان ئەوە نابێت، بەڵكو دەبێ خەڵك عەقڵی خۆی گەوره و فراوان بكا، هەتا جێی ڕاستییەكانی قورئانی تێدا ببێتەوه، نەك ڕاستییەكانی قورئان بە جۆرێك تەشوێ تاشیی بكەین و، لق و پۆپیان بكەین و بیانكەین بە تەیری مەعقووڵ، بۆ ئەوەی له عەقڵی خەڵكی دا جێیان بێتەوه!!

**دووەم:** كەوتنە دوو دڵیی له بەرانبەر هەندێك له یاساكانی قورئاندا، ئەوەش كەم و زۆر دەبینرێ، بۆ وێنه: مەسەلەی سزای دەست بڕین، دەگوترێ: با باسی سزای دەست بڕین نەكەین، عەقڵی خەڵكی ئێستا ئەوە تەقەببول ناكا، یان مەسەلەی تۆڵەی كوشتن (قصاص)، یان ئەو سزایانەی دیكه كه له قورئاندا هاتوون، بەڵام ئیمان هەبوون بە قورئان و متمانه هەبوون بە قورئان، ئەوەیه كه هەرچی خوا فەرموویەتی، مادام دەزانین خوا فەرموویەتی، جا سزایه، یان پاداشته، یان حەقیقەتێكی مێژوویيه، دەبێ وەریبگرین و قەبووڵمان بێ و دڵنیاش بین، كه هەرگیز ڕاستییەكی قورئان لەگەڵ هیچ دەرهاویشتەو بڕیارێكی ڕاست و

---

(١) بۆ تەفسیری ئەم ئایەتەو ئاماژه بە {پەیمانی كۆن} كه تەوڕاته بەشێكیەتی، بڕوانه: بەرگی دووەمی ((تەفسیری قورئانی بەرزو بەپێز)) سووڕەتی (آل عمران) لاپەڕه: ٦٢٩-٦٣٢.



دروستی عەقڵ و زانست و واقیع دا تێك ناگیرێ، ئنجا ئایا ئەو ڕاستییە یاسایەکی شەریعەتە، یان هەر شتێکی دیکەیە، دەچێتە عەقڵی خەڵك، یان نا؟ ئەوە گرفت و کێشەی خۆیانە و کێشەی قورئان نیە و، خەڵك وای لە خۆی کردوە کە ڕاستییەکانی قورئان هەزم نەکات، بۆیە دەبێ ئەوان عەقڵی خۆیان چارەسەر بکەن، نەك ئێمە ڕاستییەکانی قورئان، یاخود یاساکانی بگۆڕین.

**سێیەم:** دەرکەوتنی هەندێك نهێنیی، کە زانیاری ئێستا دەریان دەخات و، پەلە کردن لەوەدا کە بێین ئایەتەکانی قورئان، یان فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) لەگەڵ ئەو دەرهاویشتە و بیردۆزە زانستییانەدا بگونجێنین، ئەویش دیسان جۆرێکە لە کەم متمانەیی بە قورئان، ئێمە نابێ پێمان وابێ، کاتێك قورئان لەگەڵ دەرهاویشتەکانی زانستی ئەم سەردەمەدا دەگونجێنین، ئەوە دیفاع لە قورئان دەکەین، چونکە فەرمایشتی خوا لەوە بەرزترەو، یەکی لەسەر ئەو جۆرە دیفاع لێکردنە نەکەوتوە، مەگەر شتێك ببێتە حەقیقەتێکی عیلمیی وا، کەتازە نکوولّیی لێنەکرێ، وەك: سووڕانەوەی زەوی بە دەوری خۆی و خۆردا و، ئەو حەقیقەتە عیلمییانەی کە لە بواری فیزیا و کیمیا و گەردوون ناسیی و، لە بواری پزیشکیی دا دەرکەوتوون، ئەوە ئەو کاتە گرفت نیە، بەڵام تاکو نەبن بە حەقیقەتی عیلمیی، نابێ پەلە بکەین لەوەدا کە ئایەتەکانی خوای پەروەردگار بگونجێنین لەگەڵ دەرهاویشتەکان و بەرهەمی زانست دا.

**چوارەم:** بەراورد کردنی هەندێك ڕاستیی و یاسای ئیسلام لەگەڵ تەوژم و بیرۆکەی تازەدا، وەك: (سۆسیالیزم، کاپیتالیزم، سیکۆلاریزم، دیموکراسیی) کە بێگومان ئیسلام چەندان خاڵی هاوبەشی هەن، لەگەڵ زۆر لە بیردۆزەکاندا، بەڵام نابێ ئیسلام لەگەڵ ئەو بیردۆزەو ڕێچکانەدا بخەینە تەرازووە وەو، پێکەوە بەراوردیان بکەین، وەك کاتی خۆی هەندێك لە زانایانی کتێبی وایان دەنووسی، بۆ وێنە: یەکێکیان (إشتراكية الإسلام) ی دەنووسی و، یەکی دیکە (ديموقراطية الإسلام)، کە لە ڕاستی دا ئەوە جۆرێکە لە زەم کردنی ئیسلام و قورئان، نەك مەدح کردنیان، من زۆرجار گوتوومە: ئێمە بەوە مەدحی قورئان و ئیسلام ناکەین، کە بەراوردیان دەکەین لەگەڵ شتێ دا، کە زادەی فیکری بەشەرە، کاتی خۆی کە باسی سۆسیالیزم دەکرا، دەیانگوت: تەواو هەرگیز لەوە چاکتر نابێ!

بەڵام هەر ئەوەندەمان زانی بازاڕی شکاو، ئەو کۆمەڵگایەی کە لەسەر بناغەی سۆسیالیزم بنیات نرابوو، هەڵوەشایەوە و تێکچوو، ئنجا ئەگەر گوتبامان ئیسلام و سۆسیالیزم وەك یەکن، دەبوو بڵێین: ئەوە ئیسلامیش فەشەلی هێنا! یان ئێستا کە باسی سیکۆلاریزم دەکرێ و، باسی سیستمی سەرمایەداریی دەکرێت و، باسی جیهانگیریی دەکرێت و، زۆر مەدحی دیموکراسی دەکرێت، کە نەك دوایی، هەر ئێستا لە ڕۆژئاوا ڕەخنەی زۆر جیددیی ئاڕاستەی دیموکڕاسی دەکرێ، کە دیموکڕاسی {حوکمی گەل} نیە، وەك بانگەشەی بۆ دەکرێ، بەڵکو حوکمی کەمینەیەکی خاوەن پارەی ڕاگەیاندن بەدەستی چەواشەکەرە، بەسەر زۆرینەیەکی ئیخفاڵکراودا، وەك لە کتێبی (چەند مەسەلەیەکی باوی سەردەم)[1] دا باسم کردوە.

کەواتە: وەختێك ئێمە بێین ئیسلام لەگەڵ دیموکڕاسییدا، بە دوو ڕووی حەقیقەتێك دابنێین و، ئیسلام لەگەڵ ئەودا تێکەڵ بکەین، کاتێك کە دیموکڕاسی فەشەل دێنێ، وەك دوێنێ سۆسیالیزم فەشەلی هێنا، لەگەڵ دیموکڕاسیش فەشەلی هێنا، دەبێ بڵێین: ئیسلامیشی لەگەڵ ڕۆیشت ! بۆیە ئیمان هەبوون بە قورئان و متمانە هەبوون بە قورئان ئەوەیە، کە ئێمە پێمان وانەبێ، شتێکی دیکەی لە قورئان گرنگتر هەیە، بەڵکو شتێکی دیکە وەك قورئان هەیە، هەتا بڵێین: قورئانیش وای گوتوە ! بەڵێ خاڵی هاوبەش هەیە لە نێوانی ئیسلام و دیموکڕاسیدا و، خاڵی هاوبەش هەیە لە نێوان ئیسلام و سیستەمی سۆسیالیزمدا، وە خاڵی هاوبەشیش هەیە لەنێوانی ئیسلام و سەرمایەدارییش دا، هەروەها لە بیردۆزەکانی دیکەشدا کەم و زۆر ئیسلام، خاڵی هاوبەشی لەگەڵیاندا هەیە، بەڵام ئیسلام وەك هیچ کام لەوانە نیە، وە بە تەئکید هیچ فیکرەیەکی بەشەر نیە کە کەم و کووڕیی تێدانەبێ و کرچ و کاڵیی تێدا نەبێ، بەڵام قورئان حەقیقەتی ڕەهایە: ﴿ وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا ﴾، دیارە هۆی ئەوەش ئاشکرایە، ئیسلام و قورئانێك کە لە زانیاری ڕەهاو بێ سنووری خواوە سەرچاوە دەگرن، دیارە ڕاستیی ڕەهایان تێدایە، بەڵام بیردۆزەو ڕێچکەکانی بەشەر، کە زادەی بیر و زەینی مرۆڤن و، مرۆڤیش سنووردارو نیسبییەو، گۆزەش چی تێدابێ هەر ئەوەی لێ دەڕژێ!.

---

(١) بڕوانە: چاپی پێنجەم، لاپەڕە (٢٦٠-٢٦٢).



خاڵی سێیەم

# چاك خوێندنی قورئان و لەبەركردنی و تێوەڕامانی و تێگەیشتنی

سێیەمین ئەركی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان، ئەوەیە كە چاكی بخوێنینەوە، پاشان لەبەری بكەین، وە تێیەوە ڕابمێنین و تێیبگەین و باش لێی حاڵی بین، بۆچی؟ چونكە ئەو ئامانجە گشتی و سەرەكییەی قورئان بۆی نێردراوەتە خوار، ئەوەیە كە لێی تێبگەین و كاری پێبكەین، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٩﴾ ص .

واتە: ئەمە كتێبێكە بۆلای تۆمان ناردوە، بە پیرۆزە، {بەرەكەتدارە، بەرهەمدارە،} بۆ ئەوەی لە ئایەتەكانییەوە ڕامێنن، وە بۆ ئەوەی خاوەن عەقڵان پەندی لێوەربگرن، واتە: كاری پێبكەن و لێی بەهرەمەند بن، دیاریشە كە ئێمە كاتێك دەتوانین لە قورئان وردبینەوە و تێی ڕابمێنین، وە پاشان لێی بەهرەمەند بین و پەندی لێوەربگرین، كە بە شێوەیەكی ڕاست و دروست بیخوێنینەوە و پاشان هەوڵ بدەین لەبەری بكەین، دوای ئەوە دەستمان لە تێوەڕامان و تێگەیشتنی و، پاشان بەهرە لێوەرگرتنی گیر دەبێ.



## چاك خوێندنەوەی قورئان

با تەماشای ئەم ئایەتانە بکەین دەربارەی چاك خوێندنەوەی قورئان:

١- خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الإسراء) دا دەفەرموێ:

﴿وَقُرْءَانًا فَرَقْنَٰهُ لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا ﴿١٠٦﴾﴾ الإسراء.

واتە: وە ئەمە قورئانێکە بەش بەشمان کردوە {یانی: هەموومان پێکەوەنەناردوە و بەش بەشمان کردوە، ئایەت ئایەت و سوورەت سوورەت}

﴿لِتَقْرَأَهُۥ عَلَى ٱلنَّاسِ عَلَىٰ مُكْثٍ كَانَ﴾ بۆ ئەوەی بەسەر خەڵکی دا بیخوێنیتەوە بە شێنەیی {(عَلَىٰ مُكْثٍ) واتە: (على تَمَهّلٍ) بە شێنەیی، وردە وردە، پلە پلە، (وَنَزَّلْنَٰهُ تَنزِيلًا) وە پلە پلەش ناردوومانەتە خوارێ، ئەندازە ناردوومانەتە خوار، وەك شارەزایانی زانستییەکانی قورئان دەڵێن: (أُنْزِل مُنَجَّماً) بەش بەش نێردراوەتە خوار، نەك هەمووی لێکڕا.

٢- هەروەها خوا (سبحانه وتعالى) لە سوورەتی (الفرقان)، دا، دەربارەی چۆنیەتی خوێندنی قورئان دەفەرموێ:

﴿وَقَالَ ٱلَّذِينَ كَفَرُواْ لَوْلَا نُزِّلَ عَلَيْهِ ٱلْقُرْءَانُ جُمْلَةً وَٰحِدَةً كَذَٰلِكَ لِنُثَبِّتَ بِهِۦ فُؤَادَكَ وَرَتَّلْنَٰهُ تَرْتِيلًا ﴿٣٢﴾﴾ الفرقان.

واتە: وە ئەوانەی بێ بڕوان گوتیان: بۆچی قورئانی بە یەك جار بۆ دانەبەزێنراوە؟ (خواش دەفەرموێ:) ئاوامان بۆ دابەزاندووی (پلە پلە و لە ماوەی (٢٣) ساڵدا) بۆ ئەوەی عەقڵ و دڵتی پێبچەسپێنین، {هەر جارەی سوورەتێك هاتوە و پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) زیاتر دامەزراو بووە} وە زۆر بە جوانییش بۆمان خوێندوویەوە.

ئەگەر هەمووی لێکڕا دابەزیبووایە، نەدەگونجا ئاوا بخوێندرێتەوە، وە بەو شێوەیەش لە عەقڵ و دڵی پێغەمبەر دا (صلى الله عليه وسلم) نەدەچەسپی،



ئەوە لە کوێ تۆ بێی هەر ڕۆژە چەند ئایەتێك لەبەر بکەی و، باش باش هەزمیان بکەی و، لە عەقڵ و دڵی خۆتیان دا بچەسپێنی! وە ئەوە لە کوێ کە بێنی ئەندازەیەکی زۆر لە قورئان لەبەر بکەی، بەڵام دوایی لە بیرت بچێتەوە.

٣- هەروەها هەر دەربارەی چاك خوێندنەوەی قورئان، خوا لە سووڕەتی (المزمّل)دا دەفەرموێ: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾ المزمل: ٤.

واتە: وە قورئان بخوێنەوە بە ڕێك و پێکیی، لە زمانی عەرەبیی دا دەگوترێ: (ثَغْرٌ مُرَتَّلٌ)، (ثَغْر) واتە: زار، زارێکی ددان ڕێك و پێك[1]، کەواتە: (تەرتیل) ئەوەیە کە پیتەکانی قورئان ووشەکانی قورئان و بڕگەکانی قورئان، هەر کامێکیان حەقی خۆی پێبدەی.

(إبن كثير) لە تەفسیرەکەی خۆیدا و لە تەفسیری ئەوەدا کە دەفەرموێ: ﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴾ المزمل: ٤.

دەڵێ :(أي أِقرأْهُ على تَمَهُّلٍ فإنه يكون عَوْناً على فهم القرآن وتدبُّره، وكذلك كان يقرأُ صلوات الله وسلامه عليه)[2]، واتە: بەشێنەیی بیخوێنەوە، بەکاوەخۆ پەلەی لێمەکە، چونکە ئەوە زیاتر هاوکارت دەبێ بۆ ئەوەی لە قورئان تێبگەی و لێی وردبییەوە، وە پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) هەروای دەخوێندەوە.

ئنجا با دەربارەی چۆنیەتی خوێندنەوەی قورئان و چاك خوێندنەوەی و جوان خوێندنەوەی، کە ئێستا زانیارییەکی سەربەخۆ هەیە، لەو بارەوەو پێی دەگوترێ: (علم التجويد) واتە: زانیاری چاك خوێندنەوەو جوان خوێندنەوەی قورئان، با سەرنجی چەند فەرموودەیەکی پێغەمبەریش بدەین:

١- [سُئِلَ أَنَسٌ : كَيْفَ كَانَتْ قِرَاءَةُ رَسُولِ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ؟ قَالَ: " كَانَتْ مَدًّا، ثم قرأ: بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ، يَمُدُّ ( بِسْمِ اللَّهِ )، وَيَمُدُّ (الرَّحْمَنِ)، وَيَمُدُّ (الرَّحِيمِ )] رواه البخاري.

---

(١) {الرَّتَلُ: إتّساق الشيء و انتظامُهُ على استقامَةٍ: يقالُ: رجلٌ رَتِلُ الأَسنان و الترتيلُ: إرسالُ الكلمة من الفَمِ بسهولةٍ و استقامةٍ}.

(٢) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير إبن كثير) ص١٤٥٤.

واتە: پرسیار لە ئەنەسی کوڕی مالیك کرا دەربارەی چۆنیەتی قورئان خوێندنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش گوتی: لێکی دەکێشایەوە، دوایی {ئەنەس بۆ فێرکردنی کابرا تابیخاتە بەرچاوی و بۆی بەرجەستە بکا} (بِسْمِ اللَّهِ الرَّحْمَنِ الرَّحِيمِ) ی خوێندەوە، (بسم الله) ی درێژکردەوە، (الرَّحْمَنِ) ی درێژکردەوە، (الرَّحِيمِ) ی درێژکردەوە. واتە: پەلەی نەکردوە.

٢- [عَنْ أُمِّ سَلَمَةَ أَنّها سُئِلَتْ عَنْ قِراءة رسول اللَّه J ؟ فَقَالت:كَانَ يَقْطَعُ قِرَاءَتَهُ آيَةً آيَةً: بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ .ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ . ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ . مَٰلِكِ يَوْمِ ....] رواه أحمد و أبوداود و الترمذي.

واتە: پرسیار لە ئومموسەلەمە (دایکی بڕواداران) کراوە، خوای لێ ڕازی بێ، دەربارەی چۆنیەتی قورئان خوێندنی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، ئەویش گوتوویەتی: پێغەمبەر ئایـــەت ئایـــەت، قورئـــــان خوێندنەکەی خۆی لێك دەپچڕی:

﴿بِسْمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿١﴾ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٢﴾ ٱلرَّحْمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ ﴿٣﴾ مَٰلِكِ يَوْمِ ٱلدِّينِ ﴿٤﴾﴾ الفاتحة.

دیارە خواش (سبحانه و تعالى) بەپەلە فەرمایشتی خۆی لەگەڵ پێغەمبەردا نە فەرمووە، بەڵکو بەشێنەیی، وەبەڕاستی فەرمایشتی خوا، وەك قسەی خەڵکی دیکە نیە هەر ڕیزی بکەی! بۆیە لە صەحیحی بوخاریی دا هاتوە کە یەکێ گوتی: من بە سێ شەو و ڕۆژان هەموو قورئانێ دەخوێنم، (عبدالله) ی کوڕی (مسعود) یش گوتی:

(هَـــذّاً كَهَـــذِّ الشِّعـــر) .

واتە: وەك خوێندنەوەی شیعر بە خێرایی دەیخوێنیەوە.

بەڵێ قورئان فەرمایشتی خوایە و دەبێ بەڕێزەوە و بەویقارەوە بخوێنرێ و ئەوەندە وەختەت لێ وەچاو نەبێ کە قورئانەکەی پێدەخوێنی.

٣- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

(زَيِّنُوا الْقُرْآنَ بِأَصْوَاتِكُمْ) رواه البخاري.

واتە: قورئان بەدەنگەکانی خۆتان جوان بکەن، دیارە قورئان بۆ خۆی هەر جوانە، بەڵام ئەگەر بەدەنگی خۆش و بە جوانیی و ڕێکیی لەباریی بخوێندرێ، جوانتر دەبێ.

٤- هەروەها پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

[لَيسَ منّا مَنْ لَمْ يَتَغَنَّ بِالقُرآنْ ] رواه البخاري.

واتە: هەر کەسێك دەنگی خۆی بەقورئان نەلارێنێتەوە، لە ئێمە نیە، هەڵبەتە لێرەدا کەباسی چاك خوێندنەوەی قورئان دەکەین، مەبەست ئەوەنیە کە هەموو وزە و توانامان بخەینە سەرئەوەی چۆن پیت و وشەکان گۆ (تلفّظ) بکەین و لە مەخرەجی خۆیان دەربچن !

بەڵێ، پێویستە بەقەدەر خۆی ئەو لایەنە گرنگیی پێبدرێ، بەڵام بە تەئکید خوێندنەوەی قورئان بۆ لێ تێگەیشتنیەتی، کەواتە: نابێ خۆخەریك کردن بە چاك خوێندنەوەی قورئانەوە، لەسەر حیسابی لێ تێگەیشتنی و پاشان ئیش پێکردنی بێ، بەڵکو دەبێ هەرشتە بەپێی خۆی گرنگیی پێ بدرێ، وە چاك خوێندنی قورئانیش، بە تەئکید پێویستە بەقەدەر خۆی گرنگیی پێبدرێ، وە لێتێگەیشتنی و، پاشان کارپێکردنی و پێوەپابەندبوونی، هەرکامێك لەوانە دەبێ حەقی خۆی بدرێتێ، نەك حەقی هەموو لایەنەکان بدرێ بەلایەنێك!

## له‌به‌ركردنی قورئـــان

سه‌باره‌ت به‌له‌به‌ر كردنی قورئانیـــش خـــوا (سبحانه وتعالی) له‌سووره‌تی (العنكبوت) دا ده‌فه‌رمویٰ:

﴿ وَمَا كُنتَ تَتْلُوا۟ مِن قَبْلِهِۦ مِن كِتَٰبٍ وَلَا تَخُطُّهُۥ بِيَمِينِكَ ۖ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴿٤٨﴾ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ۚ وَمَا يَجْحَدُ بِـَٔايَٰتِنَآ إِلَّا ٱلظَّٰلِمُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾ العنكبوت.

خوا به پێغه‌مبه‌ر (صلی الله علیه وسلم) ده‌فه‌رمویٰ: تۆ له‌پێش قورئاندا هیچ كتێبێكت نه‌خوێندۆته‌وه، وه به ده‌ستی ڕاستت نه‌تنووسیوه، {واته: ئه‌ی موحه‌ممه‌د! تۆ پێشتر نه‌خوێندنه‌وه‌ت هه‌بووه، نه نووسینت هه‌بووه} ﴿ إِذًا لَّٱرْتَابَ ٱلْمُبْطِلُونَ ﴾ العنكبوت: ٤٨، چونكه ئه‌گه‌ر خوێندنه‌وه‌و نووسینت هه‌بووایه، ئه‌وانه‌ی له‌سه‌ر ناحه‌قن، بۆیان هه‌بوو بكه‌ونه گومانه‌وه {وه بڵێن: ڕه‌نگه بۆ خۆی قورئانی دانابیٰ، به‌ڵام كه نه‌خوێندنه‌وه‌ت هه‌بووه، نه نووسین، مانای وایه زاتێكی دیكه فێری تۆی كردوه،}، دوایی ده‌فه‌رمویٰ:

﴿ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ﴾ العنكبوت: ٤٩.

به‌ڵكو ئه‌م قورئانه چه‌ند ئایه‌تێكی ڕۆشنن، له سینه‌ی ئه‌وانه‌دا كه زانیارییان پێدراوه، وه بێجگه له‌سته‌مكاران هیچ كه‌س نكوولٚیی له ئایه‌ته‌كانی ئێمه ناكات. مه‌به‌ستم لێره‌دا ئه‌م ڕسته‌یه:

﴿ بَلْ هُوَ ءَايَٰتٌۢ بَيِّنَٰتٌ فِى صُدُورِ ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ﴾ العنكبوت: ٤٩.

كه خوا مه‌دحی ئه‌وانه ده‌كا ئایه‌ته‌كانی خوا ده‌خه‌نه سینه‌ی خۆیانه‌وه و له‌به‌ریان ده‌كه‌ن، هه‌ڵبه‌ته ئه‌و قورئانه‌ش كه‌له‌به‌ر ده‌كریٰ، زۆر جیایه له‌وه‌ی كه هه‌روا ده‌خوێندرێته‌وه، چونكه كه له‌به‌ر ده‌كریٰ، زیاتر ته‌فاعولی له‌گه‌ڵ ده‌كه‌ی، وه مه‌جالت ده‌بیٰ لێی وردبیه‌وه، چونكه هه‌موو ده‌میٰ قورئانت له‌به‌رده‌ست دانیه،

ئنجا هەر خودی لەبەرکردنی قورئان بۆ خۆی ڕووناکیی بەرەکەتێکە دەچێتە سینەتەوە و، بەئەندامەکانتدا دابەش دەبێ، بۆیە لەبەرکردنی قورئان بەڕاستی نیعمەتێکی زۆر گەورەیە، وەك لەفەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دا هاتوە کە خوا (سبحانه وتعالى) بە پێغەمبەر دەفەرموێ:

( إني مبتليك، ومبتلٍ بك، ومُنْزِلٌ عليك كتابًا لا يَغْسِلُهُ الماءُ تقرأه نائمًا ويقظاناً) رواه مسلم.

واتە: من تۆ تاقی دەکەمەوە، وەبەتۆش خەڵك تاقی دەکەمەوە، وەکتێبێکت دەنێرمە سەرێ و بۆ دەنێرمە خوار، کە ئاو نایشواتەوە، بەخەوتوویی و بەبێداریی دەیخوێنی. واتە: لەسینەی دایە.



## بیر کردنەوە لە قورئان و تێوەڕامانی و لێتێگەیشتنی

وە دەربارەی بیرکردنەوە لەقورئان و تێوەڕامانی و لێتێگەیشتنی، تەنیا ئەم ئایەتە دەخوێنینەوە:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلْنَٰهُ إِلَيْكَ مُبَٰرَكٌ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ ص.

واتە: ئەمە کتێبێکە ناردوومانەتە خوار بۆ لای تۆ بەپێزە، {بەرهەمدارە، بەرەکەتدارە،} بۆ ئەوەی لەئایەتەکانی وردبنەوە، وەبۆئەوەی خاوەن عەقڵان پەندی لێ وەربگرن.

### لە کۆتایی ئەم خاڵەشدا دەڵێم:

من بابەتێکی سەربەخۆم لەم بوارەدا نووسیوە، بە ناوونیشانی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەندبین؟) لەوبابەتەدا حەوت هەنگاوم خستوونە ڕوو، بۆ چاك بەهرەمەندبوون لە قورئان، کە ئەمانەن:

١- ئەدەب نواندن و بەگەورە گرتن (التأدب والتعظيم).

٢- خوێندنەوەو گوێ بۆگرتن (التلاوة والإستماع).

٣- بیرکردنەوەو تێوەڕامان (التفكر والتدبر).

٤- کارتێکران و پەندوەرگرتن (التأثر والتذكر).

٥- شوێن کەوتن و گەردن کەچکردن (الإتباع والتسليم).

٦- تەزکیە پێکردن و فێرکردن (التزكية والتعليم)،

٧- چاکسازیی و حوکمڕان کردن (الإصلاح والتحكيم).

هیوادارم ئەو بابەتە بخوێننەوە، کە بەرچاو ڕوونییەکی باشتان دەداتێ لەوبارەوە، کە ئێمە چۆن لەگەڵ قورئان دا ڕەفتار بکەین و بیخوێنینەوە و، چۆن زیاتر لێی سوود مەند دەبین؟



## خاڵی چوارەم

# شوێنکەوتنی قورئان و پێوە پابەند بوونی

چوارەم ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە کتێبی خوا و فەرمایشتی بێ وێنەی خوا، سبحانە وتعالی، بریتیە لە شوێن کەوتنی قورئان و پێوە پابەند بوونی، دیارە خودی خوێندنەوەی قورئان عیبادەتە، بیر لێکردنەوەی عیبادەتە، لەبەرکردنی عیبادەتە، بەڵام خوێندنەوەی و لەبەرکردنی و بیرلێکردنەوە و تێفکرینی، لە ڕاستی دا لە ڕوویێکی دیکەوە، دەبن بەئامراز و هۆکار، بۆ شوێنکەوتنی قورئان، چونکە ئەم قورئانە بۆیە هاتوە کە پێیەوە پابەند بین، بەڵام هەتا تێی نەگەین، ناتوانین پێیەوە پابەند بین، وە هەتا لەبەری نەکەین و نەیخوێنینەوە، ناشتوانین تێی بگەین.

کەواتە: خوێندنەوەی قورئان و پاشان لەبەرکردنی و تێگەیشتنی، هەموویان هۆکارن، تاکو بتوانین وەك قورئان دەفەرموێ، ئاوا ژیان بگوزەرێنین، ژیانی تاکییمان، ژیانی خێزانییمان، ژیانی کۆمەڵایەتییمان، ژیانی سیاسییمان، .. هتد.



## مەبەستمان لە شوێن کەوتنی قورئان چییە؟

مەبەستمان لە شوێنکەوتنی قورئان، شوێن کەوتنی سەرجەم ڕێنمایی و ئاڕاستەکانییەتی، بەبێ هەڵاواردن، هەروەها مەبەستمان لە پێوە پابەند بوونی قورئان، دیسان پابەند بوونە بە تێکڕای فەرمانەکانی قورئان و نەهییەکانی قورئان و یاساکانی قورئانەوە، لە هەموو بوار و لایەنەکانی ژیان و گوزەرانماندا.

ژیانی تاکییمان ئەوەی کە بەتەنێ جێبەجێ دەکرێ لە قورئان، بۆخۆت جێبەجێی بکە، وە ئەوەی لە چوارچێوەی ماڵ و خێزانت دایە، لەوێدا جێبەجێی بکە، وە ئەوەی لە چوارچێوەی کۆمەڵگادایە، لەوێدا جێبەجێی بکە، ئەوەی بە تەنێ پێت دەکرێ، بیکە و ئەوەی کە بە کاری هەرەوەزیی و کاری بە کۆمەڵ نەبێ جێبەجێ ناکرێ، دەبێ هەوڵ بدەی هەرەوەزی بۆ بکەی و کۆمەڵی بۆ پەیدا بکەی، چونکە خوا دەفەرموێ: قورئانمان ناردوە، بۆ ئەوەی کە پەندی لێ وەربگرن و پێی بەڕێوە بچن، بۆیە دەبێ ئەوەی بەخۆت دەکرێ، بیکەی و، ئەوەی پێت ناکرێ، دەبێ کۆمەڵی بۆ پەیدابکەی، با تەماشای ئەم ئایەتانە بکەین:

١- خوا سبحانه وتعالى بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ:

﴿ ٱتَّبِعۡ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن رَّبِّكَۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۖ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ١٠٦ ﴾ الأنعام.

واتە: شوێن ئەوە بکەوە کە لە پەروەردگارتەوە بە وەحی بۆت هاتوە، بێجگە لەو هیچ پەرستراوێکی دیکە نیە، وە واز لەهاوبەش دانەران بێنە و پشتیان تێبکە.

واتە: لەبەر زەخت و فشاری هاوبەش دانەرەکان و لەترسی ئەوان و لەبەر ڕازی کردنی ئەوان، نەچی واز لە شوێن کەوتنی قورئان بێنی، بە دوای قورئان بکەوە و گوێ مەدە ئەوە، کە کێ پێی خۆشە و کێ پێی ناخۆشە.

ئنجا ئەوە خوا سبحانه وتعالى بە پێغەمبەری خاتەم (صلى الله عليه وسلم) وا دەفەرموێ و، بۆیەش فەرموویەتی : هاوبەشدانەرەکان پشتگوێ بخە: ﴿ وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ﴾ چونکە بەڕاستی ئینسان کاتێك دەتوانێ بە تەواویی



بە دوای قورئان بکەوێ، کە نابێ زەخت و فشاری خەڵکی کافر و بێدینی بەسەرەوە بێ و لەوان بترسێ، یاخود بیەوێ ئەوان ڕازی بکا، چونکە بەڕاستی قورئان بۆ ئینسانی ئازاد و ئازا هاتوە و، بۆ ئینسانی ژێردەست و ترسنۆك نەهاتوە و، کەسێك دەتوانێ بەدوای قورئان بکەوێ، کە بێجگە لە خوا لەکەس نەترسێ و خوا بەیەککگر (مُوَحِّد) بێ، بۆیە دەفەرموێ: ﴿ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾ کێ دەتوانێ بەدوای قورئان بکەوێ ؟ کەسێك کە تەنیا خوا بە پەرستراوی خۆی بزانێ، ئینسانی خوا بە یەککگر و یەکتاپەرست، دەتوانێ کە بەڕاستی بەدوای قورئان بکەوێ، کەسێك کە گوێ نەداتە موشریك و کافر و لاڕێیەکان، دەبێ ئاوا سەرنجی ئایەتەکانی قورئان بدەین، ئەگەرنا ئەو ئایەتانە ئەگەر ئاوا هەر بەسەرپێیی تەماشایان بکەین، دەڵێین: باشە ئەوە خوا دەفەرموێ: بەدوای ئەوە بکەوە کە بەوەحی لە پەروەردگارتەوە بۆت هاتوە، بەڵام بۆنە (مُناسبة) ی چی یە کە دوایی دەفەرموێ: ﴿لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ﴾، وە دواتریش دەفەرموێ: ﴿وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ﴾ ؟.

هۆکارەکەی ئەوەیە کە باسمان کرد، کەسێك دەتوانێ بەدوای قورئان بکەوێ، کە بەڕاستی یەکتاپەرست بێ و، بێجگە لە خوا هیچ پەرستراوێکی دیکەی نەبێت و، هیچ کەسی دیکە بە شایستەی پەرستن نەزانێ، وە ئامادەش بێ، پشت لە کافران بکا و ڕوویان لێ وەرگێڕێ و گوێیان پێنەدات .

٢- وە لە سوورەتی (الأعراف) دا دەفەرموێ:

﴿ٱتَّبِعُوا۟ مَآ أُنزِلَ إِلَيْكُم مِّن رَّبِّكُمْ وَلَا تَتَّبِعُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ ۗ قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾﴾ الأعراف.

واتە: بە دوای ئەوە بکەون، کە لە پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزێندراوە {پێشێ ڕووی دواندن لە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بوو، بەڵام لێرەدا بەگشتی دەفەرموێ: کە هەم پێغەمبەر و هەم ئۆممەتەکەی: بەدوای ئەوە بکەون، کە لە پەروەردگاریانەوە بۆیان دابەزێندراوە}، ﴿وَلَا تَتَّبِعُوا۟ مِن دُونِهِۦٓ أَوْلِيَآءَ﴾ وە جگە لەو بەدوای سەرپەرشتیارانی دیکە و مشوور خۆرانی دیکە مەکەون ﴿قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ﴾ کەم وایە بیربکەنەوە و پەند وەربگرن، {ئەو کەمانەش ئەوانەن کە ئیمان دارن}، واتە: بڕوادارانێك کە پەند وەردەگرن و بیردەکەنەوە کەمن و، ئەوانی دیکە



زۆریان ئیهمالن، یاخود ئه‌ی كافره‌كان! ته‌نانه‌ت كه‌میش په‌ند وه‌رناگرن، لێره‌دا جێی سه‌رنج ئه‌وه‌یه‌ كه‌ خوا ده‌فه‌رموێ:

﴿ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ﴾ .

كه‌واته‌: به‌دوای به‌رنامه‌ و كتێبی كێ بكه‌وی، ئه‌وت كردوه‌ به‌ وه‌لی خۆت، وه‌لی، واته‌: سه‌رپه‌رشتیار و مشوور خۆرو كار هه‌ڵسووڕێنه‌ر، بۆیه‌ ده‌فه‌رموێ: ﴿وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ ﴾ چونكه‌ ئه‌گه‌ر به‌دوای كتێب و به‌رنامه‌ی هه‌ر كه‌سێكی دیكه‌ بكه‌وی، مانای وایه‌ ئه‌وت كردوه‌ به‌ وه‌لی و سه‌رپه‌رشتیاری خۆت و مشوورگێڕی خۆت .

٣- وه‌ له‌ سووره‌تی (یونس)دا ده‌فه‌رموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧﴾ یونس.

لێره‌دا خوا سبحانه‌ وتعالی ڕووی دواندن ده‌كاته‌ هه‌موو خه‌ڵك و هه‌موو مرۆڤایه‌تی و ده‌فه‌رموێ: ئه‌ی خه‌ڵكینه‌! بێگومان له‌ په‌روه‌ردگارتانه‌وه‌ ئامۆژگارییتان بۆ هاتوه‌، وه‌ شیفای ئه‌وه‌ كه‌ له‌ سینه‌كانتان دا هه‌یه‌ {شیفای ئه‌و ده‌رد و نه‌خۆشییانه‌ی كه‌ له‌ سینه‌كانتان دا هه‌یه‌} وه‌ ڕێنمایی و به‌ به‌زه‌یی یه‌ بۆ ئیمانداران.

**ته‌ماشابكه‌ن:** ئامۆژگاریی و شیفایه‌كه‌ به‌ گشتی باس ده‌كا، چونكه‌ قورئان ئینسانی كافریش ده‌توانێ سوودی لێوه‌ربگرێ، پێتان وایه‌ خه‌ڵكی ڕۆژئاوا كه‌م له‌ قورئان به‌هره‌مه‌ند بوون؟ به‌ڵكو زۆر لێی به‌هره‌مه‌ند بوون، له‌گه‌ڵ ئه‌وه‌دا كه‌ ئیمانیان پێی نیه‌، به‌ڵام زۆریان سوود لێ بینیوه‌، پێتان وایه‌ قورئان ده‌وری نه‌بینیوه‌، له‌وه‌دا كه‌ له‌ زۆر نه‌خۆشیی یان ده‌ربازیان بكا، نه‌خۆشیی فكریی، نه‌خۆشیی كۆمه‌ڵایه‌تیی، نه‌خۆشیی سیاسیی؟ به‌ ته‌ئكید قورئان زۆر ده‌وری بینیوه‌، بۆ وێنه‌: ئێستا كه‌ ده‌ستا و ده‌ست پێكردنی ده‌سه‌ڵات به‌شێوه‌ی ئاشتییانه‌ له‌ ڕۆژئاوادا هه‌یه‌، پێتان وایه‌ هی خۆیانه‌!

كاتی خۆی وڵاتانی ڕۆژئاوا ملیۆنان كه‌سیان لێ كوژرا، له‌سه‌ر داواكردنی ماف و ئازادییه‌كان، وه‌ كاتی خۆی خه‌ڵكی ڕۆژئاوا حوكمڕانه‌كانی خۆیانیان

وەك خوا تەماشا دەكرد، یان نوێنەری خوا، یان سێبەری خوا! ئەدی كێ فێری كردن كە حوكمڕان نوێنەر و سێبەری خوا نیە و نوێنەری خەڵكە؟ بێگومان ئیسلام فێری كردن و قورئان فێری كردن.

كەواتە: ئامۆژگاربوونی قورئان و شیفابوونی قورئان، بۆ خەڵكە بەگشتی، بەڵام: ﴿وَهُدًى وَرَحْمَةٌ لِّلْمُؤْمِنِينَ﴾ كێ قورئان دەكاتە ڕێنمایی خۆی بۆ ژیانی، وە كێ قورئان بۆی دەبێتە مایەی ڕەحمەت و بەزەیی؟ دیارە ئیمانداران، بەڵام خەڵكی دیكەش بەگشتی دەتوانێ پەند لە قورئان وەربگرێ و قورئان بكاتە ئامۆژگاریی خۆی و بیكاتە شیفا و چارەسەر بۆ نەخۆشییەكانی.

٤- ئنجا لە سوورەتی (النحل) دا خوا دەفەرموێ:

﴿وَنَزَّلْنَا عَلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ وَهُدًى وَرَحْمَةً وَبُشْرَىٰ لِلْمُسْلِمِينَ﴾النحل: ٨٩.

واتە: وە قورئانمان بۆ سەر تۆ ناردۆتە خوار، ڕوون كەرەوەیە بۆ هەموو شتێك، وە ڕێنمایی و بەزەیی و موژدەیە بۆ مسوڵمانان، یەكێ بۆی هەیە بڵێ: خوا دەفەرموێ: (تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ) وەك هەندێ لـــە توێژەرەوانی قورئان بەشێوەیەكی سادە قورئانیان تەفسیر كردوەو گوتوویانە: قورئان هەموو شتێكی تێدایە، بەڵام ئەوە ڕاست نیەو لێرەدا: (تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ) واتە:قورئان هەموو شتێك ڕوون دەكاتەوە، كە ئێوە پێویستیتان پێیەتی،بۆ ئەم ژیان وگوزەرانەی دنیاتان، بەڵام ئەگەر شتێك لە مەودای عەقڵی ئینسان دا بێ، ئایا قورئان هەر ڕوونی دەكاتەوە؟ بێگومان نەخێر، ئایا قورئان ڕوونی كردۆتەوە: سەیارە چۆن دروست بكەین؟ نەخێر، ئایا ڕوونی كردۆتەوە چۆن ڕۆكێت دروست بكەین و، پێی بچینە سەر مانگ؟ نەخێر، ئایا ڕوونی كردۆتەوە: چۆن لە ڕووی كشتوكاڵەوە بەرو پێش بچین؟ نەخێر، لە ڕووی پیشەسازییەوە؟ نەخێر، لەڕووی بازرگانییەوە؟ نەخێر، بۆچی؟ چونكە ئەوە هەمووی لە مەودای عەقڵی ئینسان دا هەیە، كەواتە: (تِبْيَٰنًا لِّكُلِّ شَىْءٍ) واتە: قورئان هەر شتێك كە لە مەودای عەقڵی ئینساندا نیەو، ئینسان بۆخۆی عەقڵی پێناشكێ و ناتوانێ خۆی دەركی بكا، هەموو ئەو شتانەی ڕوون دەكاتەوە، بەڵام شتێك كە عەقڵ دەتوانێ دەركی بكات، قورئان ئەوە ڕوون ناكاتەوە، بۆچی؟ چونكە قورئان نەهاتوە كە عەقڵ



تەنبەڵ بێ وپاڵبداتەوە، قورئان نەهاتوە کەمرۆڤ هەڵخزێو بڵێ: خوا هەموو شتێکی بۆ فەرموو وم! بەڵکو قورئان هاتوە عەقڵی خەڵك بجوولێنێ، بەڵام ئەو شتانەی کە عەقڵ توانای بەسەر دا ناشکێن، قورئان ڕوونی کردوونەوە .

٥- وە لە سوورەتی (المائدة) دا خوا (سبحانەوتعالی ) دەفەرموێ:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ المائدة.

ئەم ئایەتە دوای ئەو ئایەتانەیە کە خوا سبحانە وتعالى تێیاندا باسی ناردنە خوارەوەی تەورات بۆ جوولەکەکـان و، ئینجیل بـۆ نەصرانییەکان دەکات، دوایی دەفەرموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾ وەك چۆن تەوراتمان بۆ مووسا (علیه السلام) نارده خوار، کە بەرنامەی جوولەکەکان بێ، وە ئینجیلمان نارده خوار بۆ عیسا (علیه السلام) کە وێڕای تەورات، بەرنامە بێ بۆ نەصرانییەکان، ئاوا کتێبیشمان بۆتۆ ناردۆتە خوار، بە هەق، واتە لە خودی خۆی دا حەقە، وە لەکاتی خۆی دا هاتوە و لە شوێنی خۆی دا هاتوە ﴿مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ ﴾ هەرچی کتێبی پێش خۆیەتی بەڕاستی دەزانێ، وەك ئەسڵەکەیان و دەڵێ: (صُحُف) بۆ ئیبراهیم هاتوە و، تەورات بۆ مووسا هاتوەو، زەبوور بۆ داوود هاتوە و، ئینجیل بۆ عیسا هاتوە، وە کتێبەکانی دیکەش کە بۆ پێغەمبەرانی دیکە و هاتوون و ناویان نەهاتوە، هەموویان ڕاستن، وەك ئەسڵەکەیان، نەك وەك واقیعی ئێستایان، ﴿وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ﴾ وێڕای ئەوەی ئەسڵەکەیان بە ڕاست دەزانێ، بەسەریشیانەوە چاودێرە، واتە: هەر کەم و کوورِیی و لادان و دەستکاریی کرانێکیان تێدابێ، وە قورئان بە پێویستی زانیبێت، ڕاستی کرۆدتەوە، ﴿فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ﴾ کەواتە: بەوەی کە خوا ناردوویەتە خوار، دادوەرییان لە نێواندا بکە، ﴿وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ﴾



وە بەدوای ئارەزووەکانیان مەکەوە، کە لابدەی لەو حەقەی کە بۆت هاتوە، ﴿لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا﴾ بۆ هەر کامێکتان ڕێباز و بەرنامەیەکمان داناوە: بۆ جوولەکەکان لەسەردەمی مووسا دا (علیه السلام) بەرنامەیەك پێویست بوو و، لەسەردەمی عیسا دا (علیه السلام) بۆ بەنی ئیسرائیل و ئەوانەی بڕوایان بە عیسا هێنا، بەرنامەیەك پێویست بوو، بۆ تۆش ئەی موحەممەد (صلی الله علیه وسلم)، بۆ ئۆممەتەکەی تۆ کە بریتیە لە هەموو مرۆڤایەتیی، تاکو دنیا کۆتایی دێ، بەرنامەیەك پێویستە.

﴿وَلَوْ شَاءَ اللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَاحِدَةً﴾ وە ئەگەر خوا ویستبای هەمووتانی دەکردە یەك کۆمەڵ و یەك ئۆممەت و یەك کتێبیشی بۆ دەناردن، ﴿وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِي مَا آتَاكُمْ﴾ بەڵام بۆ ئەوەی تاقیتان بکاتەوە، لەوەدا کە پێیی داون، داخۆ ئایا جوولەکە و نەسرانییەکان ئامادەن بە دوای موحەمەد (صلی الله علیه وسلم) بکەون، کە هەموو پێغەمبەرەکانیان بەڕاست دەزانێ، وە هەموو کتێبەکانی خوا بەڕاست دەزانێ، وە تەواوکەری کاری پێغەمبەرانی پێش خۆیەتی، وە دەست بەرداری ئەو بەرژەوەندییە ناشەرعییانە ببن، کە بە بەزم و بازاڕی ساختە بۆخۆیان دروستیان کردوە؟!

﴿فَاسْتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ﴾ دەجا پێشبڕکێ بکەن لە چاکەکان دا، ﴿إِلَى اللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا﴾ هەمووتان بۆلای خوا دەگێڕدرێنەوە، ﴿فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ﴾ بێگومان هەواڵتان پێدەدا بەوەی کە تێیدا دەکەوتنە ڕاجیاییەوە.

وەك بینیمان لە هەموو ئەو ئایەتانە دا خوا (سبحانه وتعالی) زۆر بەڕوون و ڕاشکاویی، فەرمان دەکا بە پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) وە پاشان بە ئێمەی شوێن کەوتووانی پێغەمبەر، کە بە دوای قورئان بکەوین و بەدوای ئەو کتێبە بکەوین، کە خوا بە پێغەمبەری کۆتایی دا ناردوویەتی، وە هیچ مسوڵمانیك سەرپشك نەکراوە، مافی هەڵبژاردنی پێنەدراوە، لە بەرانبەر شوێنکەوتنی قورئاندا، مادام خۆی بە مسوڵمان بزانێ، ئنجا ئایا شوێنکەوتنی قورئان و پێوە پابەند بوونی، لە چەند بواردا خۆی دەنوێنێ؟ بێگومان لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، بەڵام من حەوت بواری سەرەکییم بۆ زیاتر بەرچاو ڕوون بوونەوەی ئێوە، خستونە ڕوو:

## بوارەكانى پابەنديى بە قورئـانەوە

**يەكەم:**

لە بوارى بوون ناسيى دا، ئێمە چۆن تەماشاى بوون (وجود) دەكەين؟
چۆن تەماشاى بوونەوەر دەكەين ؟
چۆن تەماشاى خوا(سبحانە وتعالى) دەكەين؟

ژيانى دنيا، ئينسان، دوارۆژ،...هتد، دەبێ قورئان بكەينە چرايەك و وەك قورئان پێمان دەڵێ، ئاوا تەماشاى بوون بكەين و، تەماشاى سەرجەم ئەو شتانە بكەين، كە وشەى بوون (وجود) دەيانگرێتەوە، هەر لە خواى بەرزو بێ وێنەوە بگرە، هەتا تێكڕايى دروستكراوەكانى خواى بەديهێنەر، لە ژيان، دنيا، مرۆڤ، دوارۆژ...هتد.

ديارە من لە كتێبى: (تەوژمى ئيسلام وعەلمانيى وخاڵە هاوبەش و جياوازييەكانيان) دا باسى بووناسيى ئيسلامم كردوە، بۆيە حەواڵەى ئەوێتان دەكەم[1].

**دووەم:**

لە بوارى ئيمان و عەقيدە دا، دەبێ قورئان بكەينە مامۆستاو چاوساغى خۆمان و بيكەينە چرايەك، چونكە لە قورئاندا ئيمان و عەقيدەى ئيسلاميى جوان ڕوون كراوەتەوە، وەك من لە كتێبى: (ئيمان و عەقيدەى ئيسلاميى) دا كە شەش بەرگە، بە تەفصيل باسى ئيمان و عەقيدەى ئيسلاميم كردوە، لەبەر ڕۆشنايى قورئان و سوننەت دا، هەروەها لە كتێبى: (ڕوونكردنەوەى عەقيدەى طەحاويى)يش دا بە پوختيى لە بارەى ئيمان و عەقيدەوە دواوين.

---

(١) بڕوانە: چاپى سێيەم/٢٠١٤، نووسينگەى تەفسير.
هەروەها بەرگى يەكەمى كتێبى: (الاسلام كما يتجلى في كتاب الله)ش بۆ بابەتى بووناسى تەرخان كراوە.





**سێ یەم:**

لە بواری خوا پەرستیی دا: چۆن خوا بپەرستین و بەندایەتیی بۆ بکەین؟ نوێژمان چۆن بێ؟ ڕۆژوومان، حەجمان، زەکاتمان، دووعا و پاڕانەوەمان، یادی خوامان چۆن بێ؟ قورئان هەمووی ڕوون کردۆتەوە، لە هێڵە گشتییەکانی دا، وە پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) لە لق و پۆپ و وردەکارییەکانی دا، وەك من لە کتێبی:(خواپەرستیی ئیسلامیی )دا، کە چوار بەرگە، بە تەفصیلْ باسم کردوە.

**چوارەم:**

لە بواری خوورەوشت دا: خوورەوشتی بەرز و پەسەند چییە؟ دەبێ تەماشای قورئان بکەین، هەرچی ڕەوشتێك قورئان مەدحی کردوە، بزانە کە چاکە، وە هەرچی کردەوە و ئاکار و ڕەفتارێك قورئان زەمی کردوە، بزانە خراپە، دەبێ قورئان تەرازوو و پێوەری ئێمە بێ بۆ ئەوەی بزانین ڕەوشتە بەرزەکان و سیفەتە جوانەکان کامانەن؟ تاکو خۆمانیان پێ برازێنینەوە، وەسیفەتە خراپەکان کامانەن و خووخدەو خەصڵەتە نزمەکان کامانەن؟ تاکوخۆمانیان لێ بەدوور بگرین، کە من لەهەر کام لە کتێبی: (ڕێگای صالْح بوون و بەرەو خوا چوون) و (ڕەوشت و ئاکاری ئیسلامی ) و (گیانی ژیان) و، نامیلکەی: (خوورەوشتی بەرزو پەسند سەنگی مەحەکی موسڵمانەتییە)دا، بەتێروتەسەڵی باسی ئەم بابەتەم کردوە.

**پێنجەم:**

لە بواری باری کەسێتی دا: واتە: بواری خێزانیی کە من لە کتێبی: {ئافرەت و خێزان لە سایەی شەریعەتدا} کە دوو بەرگە تا ڕاددەیەکی باش ئەم بابەتەم شی کردۆتەوە، هەروەها لە نامیلکەی: (سروشت و پایەکانی خێزان و مەسەلەی چەند ژنیی )یشدا، لەو بارەوە قسەم کردوە.

**شەشەم:**

لە بواری حوکم و سیاسەت دا: کۆمەڵگا دەبێ چۆن بەڕێوە بچێ و، حوکمڕانان چۆن هەڵدەبژێردرێن و، کێ دایان دەنێ و، چۆن حوکم دەکەن؟

ئەوەش بوارێکی دیکەیەو، دەبێ ئێمە تێیدا بە دوای قورئان بکەوین، کە من لە زنجیرە وتاری (ئیسلام و دەوڵەتداریی و حوکمڕانیی)دا کە ئێستا لە کەناڵی ئاسمانیی (پەیام)ەوە، لە بەرنامەی (سەرنج)دا پێشکەشیان دەکەین و، سەرگەرمی نووسینەوە و ئامادەکردنیشیانین، لە دوو توێی کتێبێکدا[١].

**حەوتەم:**

لەبواری ئابووریی و مامەڵە و بازرگانییدا.

بەکورتیی و بەکوردیی: دەبێ لە هەمووبوارو لایەنەکانی دین و ژینماندا قورئان مامۆستا و چاوساغ و چرامان بێت، ئەو کاتە دەیسەلمێنین کە بەدوای قورئان کەوتووین، وە شوێن پێی دوایین کتێبی خوامان هەڵگرتوە.

شایانی باسیشە کە من لە کتێبی: ((الإسلام كما يتجلى في كتاب الله))[٢] دا، کە لە زیندانی ئەمریکاییەکان دا نووسیومەو هەشت بەرگەو دەوری چوار هەزار لاپەڕەیە، باسی سەرجەم لایەنەکانی ئیسلامم کردوە، هەموویشی لەبەر ڕۆشنایی قورئان دا، وە سوپاس بۆ خوا ئێستا ئەو کتێبە چاپ کراوەو لەکتێبخانەکانی هەرێم و دەرەوەی عێراقیشدا چنگ دەکەوێ.

وە ئێستا سەرگەرمی ئەوەم کە لە چاپی دووەمی دا، بە مەبەستی ئاسانتر بڵاوبوونەوە و بەهرە لێوەرگیرانی، وەک مەوسوعەیەکی پێکهاتووە لە دوازدە کتێبی سەربەخۆ، بیخەینەوە بەر دیدی خوێنەران.

---

(١) دوایی لە دوو توێی چوار بەرگدا بوو بە مەوسووعەیەکی سیاسیی.

(٢) واتە: {ئیسلام وەك لە کتێبی خوادا دەدرەوشێتەوە}.



خاڵی پێنجەم و کۆتایی

# ناساندنی قورئان و بڵاوکردنەوەی ڕاستی یەکانی

پێنجەمین ئەرکی سەرشانمان بەرانبەر بە قورئان، بریتیە لەوە کە ئێمە قورئان بە خەڵك بناسێنین، وشەی: خەڵکیش لە پێشدا مەبەستم پێی خەڵکی دەور و بەری خۆمانەو، ئینسان دەبێ لە خێزانی خۆیەوە دەست پێ بکات، لە برا و خوشکەکانی و، لە دۆست و ڕەفیقانی و، لە خزم و نزیکانییەوە، قورئانیان پێ بناسێنین و، ڕاستی یەکانی قورئانیان بخەینە بەرچاو.

بەڵێ بەڕێزان!

بەڕاستی ئەو کەسە لە خوای پەروەردگار نزیکترەو، لەلای خوا خۆشەویسترە، کە زیاتر لەگەڵ فەرمایشتی خوادا سەر و کاری هەیە، چونکە لەدوای خوا، هیچ شتێك لە قورئان گەورەتر نیە، لە سۆنگەی ئەوەوە کە قورئان سیفەتی خواو فەرمایشتی خوایە، ئنجا ئایا ئێمە چۆن لەگەڵ خوادا (سبحانه وتعالى ) دەتوانین مامەڵە بکەین؟ لە ڕاستی دا بە هۆی فەرمایشتی خواوە دەتوانین مامەڵەیەکی ڕاست و دروست لەگەڵ خوای پەروەردگار دا بکەین و، بەندایەتیی بۆ بکەین، دیارە موحەممەد (صلى الله عليه وسلم) و هەموو پێغەمبەرانی دیکەی پێش ئەویش، سەڵات و سەلامی خوایان لەسەربێ، هەر بەپێی فەرمایشتی خوا و بەپێی ئەو وەحی و پەیامەی خوا بۆی ناردوون، لەگەڵ خوادا هەڵس و کەوتیان

کردوە، بۆیە بەڕاستی ئەوانە خوا پێداوو بەختەوەرن، کە تەمەنی خۆیان زیاتر لەگەڵ فەرمایشتی خوادا بەسەر دەبەن، چونکە هیچ شتێ لە فەرمایشتی خوا گەورەتر نیەو، هیچ شتێك لە کەلامی خوا بەرەکەتدارتر نیە، وە ئەگەر تەماشای زانایانی ئیسلام بکەین، دەبینین ئەوانەیان کە زیاتر خەریکی فەرمایشتی خواو خەریکی کتێبی خوا بوون، زیاتر توانیویانە خزمەت بکەن و زیاتر توانیویانە گۆڕانکاریی بەسەر خۆیان دا بێنن، پاشان گۆڕانکاریی بەسەر ئەو واقیع و دەوروبەرە دا بێنن، کە تێیدا ژیاون.

ئێستاش با تەماشای ئەم چەند ئایەت و فەرمایشتانە بکەین، کە فەرمانمان پێ دەکەن، قورئان بە خەڵك بناسێنین و ڕاستی یەکانی قورئان بە خەڵك بگەیەنین:

**یــەك:** لە سوورەتی (الأنعام) دا، خوا سبحانه وتعالی دەفەرموێ:

﴿ قُلْ أَيُّ شَيْءٍ أَكْبَرُ شَهَٰدَةً قُلِ ٱللَّهُ شَهِيدٌۢ بَيْنِى وَبَيْنَكُمْ وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ وَمَنۢ بَلَغَ أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ ٱللَّهِ ءَالِهَةً أُخْرَىٰ قُل لَّآ أَشْهَدُ قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَٰحِدٌ وَإِنَّنِى بَرِىٓءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ ﴿١٩﴾ ﴾ الأنعام.

بە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دەفەرموێ: پێیان بڵێ: کێ، یان چ شتێك گەورەترە شایەدیی بدات ؟ یان کێ ئەگەر شایەدیی بدات، شایەدیی دانەکەی گەورەترین شتە؟ بڵێ: خوا، {یانی: خوا ئەگەر شایەدیی لەسەر شتێك بدات، کە ئەو شتە وایە، ئەوە خوا گەورەترین شایەدە، واتە: ئەگەر ئەوانیش نەیانگوت: خوا گەورەترین شایەدە، تۆ بڵێ: خوا شایەدە} لە نێوان من و ئێوەدا.

واتە: خوا شایەدە کە من پێغەمبەری خوام و، ئەم فەرمایشتە فەرمایشتی خوایە، خواش بەسە بۆ شایەدیی، چونکە گەورەترین شایەدە} خوا لە نێوانماندا شایەدە، وە ئەم قورئانەشم بۆ نێردراوە، تاکو بە ئێوەی ڕابگەیەنم، وە بە هەر کەسێکی دیکە کە پێی دەگات.

جا من لە هێنانەوەی ئەم ئایەتەدا تەنیا مەبەستم ئەم ڕستەیەیە: (وَمَنۢ بَلَغَ ) واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرمانی پێکراوە کە بفەرموێ: ﴿ وَأُوحِىَ إِلَىَّ هَٰذَا ٱلْقُرْءَانُ لِأُنذِرَكُم بِهِۦ ﴾ ئەم قورئانەم بۆ نێردراوە، تاکو بە ئێوەی



ڕابگەیەنم و ئێوەی پێ بترسێنم و پێ هۆشیار بکەمەوە (وَمَنْ بَلَغَ) وە هەر کەسێکی دیکەش کە دوایی قورئانی پێ دەگات، واتە: ئەویش دیسان هەر پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بەو قورئانە هۆشیاری دەکاتەوە، ﴿أَئِنَّكُمْ لَتَشْهَدُونَ أَنَّ مَعَ اللَّهِ آلِهَةً أُخْرَىٰ﴾ پێیان بڵێ: ئایا ئێوە شایەدیی دەدەن، کە لەگەڵ خوادا پەرستراوی دیکە هەن؟ (قل لا أشهد) بڵێ: ئەگەر ئێوە شایەدیی بدەن، شایەدییەکەتان بە ناحەقە، بەڵام من شایەدیی نادەم.

﴿قُلْ إِنَّمَا هُوَ إِلَٰهٌ وَاحِدٌ وَإِنَّنِي بَرِيءٌ مِّمَّا تُشْرِكُونَ﴾ بڵێ: تەنیا یەك پەرستراو هەیە، وە من بەریيم لەوەی کە ئێوە دەیکەن بە هاوبەش بۆ خوا.

**دوو:** لە سوورەتی (الزمر) دا خوا دەفەرمویٚ:

﴿إِنَّا أَنزَلْنَا عَلَيْكَ الْكِتَابَ لِلنَّاسِ بِالْحَقِّ ۖ فَمَنِ اهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا ۖ وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ ﴿٤١﴾﴾ الزمر.

واتە: ئێمە کتێبمان بە حەق ناردۆتە سەر تۆ بۆ خەڵکی، {واتە: ئەم قورئانە بۆ خەڵك هاتوە، کە خەڵك لێی تێبگات و پێی ئاشنا بێ و پێوەی پابەند بێ} ﴿فَمَنِ اهْتَدَىٰ فَلِنَفْسِهِ ۖ وَمَن ضَلَّ فَإِنَّمَا يَضِلُّ عَلَيْهَا﴾ جا هەر کەسێك ڕێی ڕاستی گرت، ئەوە سوودەکەی بۆ خۆیەتی، وە هەر کەسێك ڕێی ون کرد، ڕێ لێ ون بوونەکەی بەس بە زیانی خۆی تەواو دەبێ ﴿وَمَا أَنتَ عَلَيْهِم بِوَكِيلٍ﴾ وە تۆ وەکیل نی بەسەر یانەوە، کە بیانپارێزی و نەهێڵی گومڕابن و ڕێیان لێ تێك بچێ.

**سێ:** پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) لە فەرمایشتێك دا، دەفەرمویٚ:

(عَنْ عَبْدِ اللَّهِ بْنِ عَمْرٍو ، أَنَّ النَّبِيَّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ ، قَالَ : بَلِّغُوا عَنِّي وَلَوْ آيَةً، وَحَدِّثُوا عَنْ بَنِي إِسْرَائِيلَ وَلا حَرَجَ ، وَمَنْ كَذَبَ عَلَيَّ مُتَعَمِّدًا ، فَلْيَتَبَوَّأْ مَقْعَدَهُ مِنَ النَّارِ) رواه البخاري: ٣٤٦١.

واتە: ئەگەر ئایەتێکیش بێت لەمنەوە بیگەیەنن،وە لەبەنی ئیسرائیلەوە شت بگێڕنەوە و قەیناکات، هـــەر کەسێکیش بـــە ئانقەست درۆم بەدەمەوە هەڵبەستێ،

با جێگای لە ئاگردا دابنێ. بەڵام بێگومان ئەوەی کە لەبەنی ئیسرائیل و خاوەن کتێبەکان بە گشتی دەگێڕرێتەوە، هەرچی پێچەوانەی قورئان بوو، ئەوە ڕەتکراوەیە و ئەوەش کە سەرمان لێدەرنەچوو، نە دەڵێین ڕاست دەکەن، نە دەڵێین درۆدەکەن، چونکە لە فەرموودەیەکی دیکەدا هاتوە:

(قَالَ رَسُولُ اللَّهِ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ: إِذَا حَدَّثَكُمْ أَهْلُ الْكِتَابِ فَلَا تُصَدِّقُوهُمْ وَلَا تُكَذِّبُوهُمْ) رواه البخاري :٧٣٦٢.

واتە: ئەگەر بەنی ئیسرائیل قسەیان بۆ کردن، نە بڵێن ڕاست دەکەن، نە بڵێن درۆ دەکەن.

کە بێگومان مەبەستی پێ ئەو شتانەیە کە ڕاستیی و هەڵەیی یان دیار نەبێ.

دیارە بۆ بڵاوکردنەوەی ڕاستی یەکانی قورئانیش، هەر کەسە لە قەدەر خۆی شتێکی هەر پێ دەکرێ، چونکە لەوانەیە یەکێ بڵێ: ئنجا خۆ من مەلا نیم، یان من شارەزانیم و خاوەن شەهادە نیم!! بەڵام وانیە، هیچ کەس نیە بە قەدەر خۆی لە قورئان تێ نەگات و، بە ئەندازەی ئەوە کە لێی تێگەیشتووی، بەرپرسیاری و پێویستە ئەرکی ڕاگەیاندنی ڕاستییەکانی قورئان ئەنجام بدەی، پێشتریش باسمان کرد، کە خوا لەچەند شوێن و لەسەرەتای چەندان سوورەت دا کتێبی خۆی بە (مُبين) واتە: ڕۆشن و ئاشکرا، وەسف کردوە.

**چـــوار:** وە لە (٤) ئایەت لە سوورەتی (القمر) دا، کە ئایەتەکانی (٤٠ و٣٢ و ٢٢ و١٧) ن، خوا عزوجل ئەم ڕاستییەی دووبارە کردۆتەوە:

﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا الْقُرْآنَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾ القمر.

واتە: وە بێگومان قورئانمان ئاسان کردوە بۆ لەبەرکردن، بۆ خوێندنەوە، بۆ لێ تێگەیشتن، ئایا کەس نیە لێی تێبگا! چونکە وشەی (ذکر) بە مانای خوێندنەوەو، لەبەرکردن و، لێ تێگەیشتن دێ، وەك (عبدالرحمن بن ناصر السعدي) لە (تيسير الكريم الرحمن في تفسير كلام المنان)دا[1] دەڵێ:

---

(١) بڕوانە: ص ٨٢٨.



(أي: ولقد يسَّرنا وسهَّلنا هذا القرآن الكريم، ألفاظه للحفظ والأَداء، ومعانيه للفهم والعلم، لأنه أحسن الكلام لفظاً، وأصدقه معنى، وأبينه تفسيراً، فكل من أقبل عليه يسَّر الله عليه مَطلوبه غاية التيسير، وسهَّلَهُ عَليه، والذِّكر شاملٌ لكل ما يتذكر به العاملون من الحلال والحرام، وأحكام الأمر والنهي، وأحكام الجزاء والمواعظ والعبر، والعقائد النافعة والأخبار الصادقة).

واتە: خوا کە دەفەرمویَ:

﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ فَهَلْ مِن مُّدَّكِرٍ ﴿١٧﴾ ﴾ القمر.

یانی: بێگومان قورئانی بەرزو بەرێزمان ئاسان و سێنا کردوە: وشەکانی بۆ لەبەرکردن و بێژتن، وە واتایەکانی بۆ تێگەیشتن و زانین، چونکە باشترین قسەیە لە ڕووی بێژەوەو، ڕاستترینیەتی لەڕووی ماناوەو، ڕوونترینیەتی لە ڕووی لێکدانەوەوە، بۆیە هەر کەسێك بە ڕاستیی ڕووی تێبکات، خوا ئامانجەکەی زۆر بۆ ئاسان دەکات و بۆی سێنا دەکات، وە وشەی (ذکر) یش گشتگیرە بۆ هەر شتێك کە زانایان پەندی لێوەردەگرن، لە یاساکانی حەلاڵ و حەرام و، فەرمان و قەدەغەو، یاساکانی سزاو پاداشت و، ئامۆژگاریی و پەندەکان و، بیروبڕوا سوود بەخشەکان و، هەواڵە ڕاستەکان.

کەواتە: کە دەفەرمویَ: ﴿ وَلَقَدْ يَسَّرْنَا ٱلْقُرْءَانَ لِلذِّكْرِ ﴾ واتە: قورئانمان ئاسانکردوە بۆ لەبەرکردن و، بۆ خوێندنەوە و، بۆ لیَ تێگەیشتن، ئنجا ئایا خوا بفەرمویَ: ئاسانم کردوە، تاوان نییە کەسێکی دیکە بڵیَ: زەحمەتە؟ بەڵام هەڵبەتە لێرەدا کە دەفەرمویَ: ئاسانم کردوە، لەگەڵ خۆ ماندووکردن دا ناکۆك نیە، چونکە بێگومان ئەگەر هیچ خۆت ماندوو نەکەی و، عەرەبیی نەزانی، لە قورئان تێناگەی، بەڵام ئەگەر زمانی عەرەبیی (نحو، صرف، بلاغة) بزانی و تەماشای قورئان بکەی، لێی تێدەگەی، بەڵکو لەڕاستی دا زۆر شیعر و پەخشان هەیە، زۆر قورسترە لە قورئان، وە ئەوەندەی کە قورئان دەگونجیَ لەبەربکریَ، هیچ قسەیەکی دیکە، نە شیعر نە پەخشان، ئاوا لەبەر ناکریَ، قورئان زۆر ئاسانە، وەك خوا فەرموویەتی، بەڵام ئەگەر بەردەوام ئاگامان لێی نەبێت و، بەردەوام



نەیخوێنن، لە دڵ و مێشکمان دا نامێنێ، وەك لەم فەرموودەیەدا هاتوە:

(عَنْ أَبِي مُوسَى عَن النَّبِيِّ صَلَّى اللَّهُ عَلَيْهِ وَسَلَّمَ قَالَ : تَعَاهَدُوا الْقُرْآنَ ، فَوَالَّذِي نَفْسِي بِيَدِهِ لَهُوَ أَشَدُّ تَفَصِّيًا مِنَ الإِبِلِ فِي عُقُلِها). رواه البخاري.

واتە: ئاگاتان لەم قورئانە بێت {و بەردەوام بیخوێنن} سوێند بەوەی گیانی منی بەدەستە، لە حوشتری بزۆز زیاتر خۆی ڕادەپسکێنێ، واتە: وەك چۆن حوشتر خۆی ڕادەپسکێنێ تاكو خۆی بەرەڵڵا بکا، قورئانیش ئاوایە و ئەگەر زۆر نەیخوێنی، لە زەینت دەچێتەدەر، هەڵبەتە زوو لە زەین دەچێتە دەر، بەڵام ئەگەر کەیفیشت لێ بێ، زوو دێتەوە بەرت .

**کە دەشڵێین:** بە ئاسانیی لێی تێدەگەین، یانی: هەرکەسە و بەقەدەر خۆی و، بە پێی ئامادەیی و هەوڵدانی خۆی، ئنجا هەموو کەس نابێتە تەفسیر زان، بەڵام هیچ کەس نیە کە بە قەدەر خۆی لە قورئان تێنەگات، هەڵبەتە ئەوەش کە وەك پێویست تێیدەگا، زیاتر زانایانن و ئەوانەن کە زیاتر وزە سەرف دەکەن و زیاتر خۆیان ماندوو دەکەن و، عەقڵیان کراوەترەو، عیلم و شارەزاییان زیاترە، ئەوان زیاتر لە قورئان تێدەگەن، بەڵام شوانێکیش و کرێکارێکیش و جوتیارێکیش و نەفەرێکی زۆر سادەش، دەتوانێ بەشی خۆی لە قورئان تێبگات، وە بایی ئەوەندە کە توانیویەتی لێی تێبگا، بەرپرسیاریشە بەرانبەر بەوەی لێی تێگەیشتوە، کە بیگەیەنێ بە غەیری خۆی.

ئنجا لە کۆتایی ئەم بابەتە دا دەمەوێ ئاماژە بکەم بۆ باشترین شێواز و ڕێبازی تێگەیشتن لە قورئان:



# باشترین شێواز و ڕێباز بۆ تێگەیشتن لە قورئان و خەڵك تێگەیاندن لە قورئان:

من لە پێنج خاڵدا بە کورتی باسی هۆکارەکانی چاکتر تێگەیشتنی قورئان دەکەم:

## هۆکاری یەکەم: تەفسیرکردنی قورئان بە قورئان:

توێژەرەوانی قورئان لەسەر ئەوە یەك دەنگن و، لەوبارەوە گوتوویانە: (إن القرآنُ يُفَسِّرُ بَعْضُهُ بَعضاً) قورئان هەندێکی هەندێکی ڕوون دەکاتەوە، بۆ نموونە:

١- خوا لە قورئان دا باسی خۆڕاگریی (صبر) دەکات، ئنجا ئایا (صبر) چییە؟ ئەگەر تەماشای ئایەتەکانی قورئان بکەین، خوا بۆمان باس دەکات و بۆمان ڕوون دەکاتەوە کە دەبێ لە چی و چی دا خۆمان ڕابگرین. بۆ وێنە:

أ- لە سوورەتی (البقرة) دا دەفەرموێ:

﴿ وَٱلصَّٰبِرِينَ فِي ٱلۡبَأۡسَآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَحِينَ ٱلۡبَأۡسِ ﴾ البقرة: ١٧٧.

واتە: ئەوانەی خۆڕاگرن لەکاتی نەداریی و نەخۆشیی و ناخۆشیی و، لەکاتی جەنگ و ڕووبەڕوو بوونەوەدا، کەواتە: خۆڕاگریی تەنیا شتێك و دووشتان ناگرێتەوە، بەڵکو هەموو بوارەکانی دین و ژین دەگرێتەوە .

ب- هەروەها هەر لە سوورەتی (البقرة) دا خوا سبحانەوتعالى دەفەرموێ:

﴿ وَبَشِّرِ ٱلصَّٰبِرِينَ ﴿١٥٥﴾ ٱلَّذِينَ إِذَآ أَصَٰبَتۡهُم مُّصِيبَةٞ قَالُوٓاْ إِنَّا لِلَّهِ وَإِنَّآ إِلَيۡهِ رَٰجِعُونَ ﴿١٥٦﴾ ﴾ البقرة.

واتە: وە موژدە بدە بە خۆڕاگران، ئەوانەی کە بەڵایەکیان تووش بوو، دەڵێن:

ئێمە هی خواین و بۆلای خواش دەچینەوە، کەواتە: شوێنێکی دیکە، کە دەبێ صەبری تێدا بگیرێ، گرفتاریی و بەلاو موسیبەتە، هەروەها بەم شێوەیە، ئەگەر تەماشای هەموو ئەو شوێنانە بکەی، کە باسی خۆڕاگریی (صبر) دەکەن، تێدەگەی کە (صبر) مانای چییە؟.

٢- هەروەها خوا سبحانەوتعالی باسی تەقوا دەکات و باسی پارێزکاران دەکات، بۆ وێنە: لەسەرەتای سووڕەتی (البقرة) دا، خوا دەفەرمویێ:

﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢ ﴾ البقرة.

واتە: ئەو کتێبە گومانی تێدا نیە، ڕێنماییە بۆ پارێزکاران، ئنجا ئایا پارێزکاران کێن؟ ئەگەر تەماشای ئەو شوێنانە بکەین کە خوا تێیاندا باسی پارێزکاران دەکات، تێدەگەین پارێزکاران کێن؟ بۆ وێنە:

لە سووڕەتی (آل عمران) دا خوا سبحانە وتعالی دەفەرمویێ:

﴿ ۞ وَسَارِعُوٓاْ إِلَىٰ مَغۡفِرَةٖ مِّن رَّبِّكُمۡ وَجَنَّةٍ عَرۡضُهَا ٱلسَّمَٰوَٰتُ وَٱلۡأَرۡضُ أُعِدَّتۡ لِلۡمُتَّقِينَ ١٣٣ ﴾ آل عمران.

واتە: وە خێرایی بکەن بەرەو لێبوردنێك لە خواوەو، بەهەشتێك کە پانییەکەی بەقەدەر ئاسمان و زەوی یە، ئامادە کراوە بۆ پارێزکاران، ئنجا ئایا پارێزکاران کێن؟ و سیفەتەکانیان چین؟

﴿ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ فِي ٱلسَّرَّآءِ وَٱلضَّرَّآءِ وَٱلۡكَٰظِمِينَ ٱلۡغَيۡظَ وَٱلۡعَافِينَ عَنِ ٱلنَّاسِۗ وَٱللَّهُ يُحِبُّ ٱلۡمُحۡسِنِينَ ١٣٤ وَٱلَّذِينَ إِذَا فَعَلُواْ فَٰحِشَةً أَوۡ ظَلَمُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ ذَكَرُواْ ٱللَّهَ فَٱسۡتَغۡفَرُواْ لِذُنُوبِهِمۡ وَمَن يَغۡفِرُ ٱلذُّنُوبَ إِلَّا ٱللَّهُ وَلَمۡ يُصِرُّواْ عَلَىٰ مَا فَعَلُواْ وَهُمۡ يَعۡلَمُونَ ١٣٥ ﴾ آل عمران.

کەواتە: ئەوانە پارێزکارانن، ئەوانەی کە ماڵی خۆیان لەکاتی هەرزانیی و گرانیی، یاخود لەکاتی هەبوون و نەبوون دا، دەبەخشن، وە تووڕەیی خۆ قوتدەرەوان و، لێبوردووان لە خەڵکی، وە خوا چاکەکارانی خۆشدەوێن، وە ئەوانەی ئەگەر



گوناهێکیان کرد، یان ستەمیان لە خۆیان کرد (نائومێد نابن لە ڕەحمەتی خواو) داوای لێبوردن بۆ گوناهەکانیان دەکەن، وە دەشزانن کە بێجگە لە خوا کەس لە گوناهیان نابووڕێ، وە بەردەوام نابن لەسەر ئەوەی کردوویانە، لە حاڵێکدا کە دەشزانن (چەند خراپە!).

کەواتە: پارێزکار ئەوە نیە کە بە باڵان بفڕێ!، بەڵکو ئەوەیە کە خاوەنی ئەو سیفەتانە بێت، غەڵەتیش دەکا، بەڵام دەگەڕێتەوە بۆلای خوا.

٣- ئنجا کە دەڵێین: قورئان هەندێکی هەندێکی تەفسیر دەکا، دەبێ تەماشای سیاقی ئایەتەکان بکەین، با لەوبارەوە یەك نموونەتان بۆ بێنمەوە: زۆربەی مامۆستایان ئەم ئایەتە دەربارەی ئەخلاق و ڕەوشتی جوان دێننەوە:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

خوا دەفەرموێ: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا بۆ ئێوە، سەرمەشقییەکی باش هەیە، بۆ هەرکەسێك بە ئومێدی خوا و ڕۆژی دوایی بێ و، زۆریش یادی خوا بکات.

بەڵێ، زۆرجار ئەم ئایەتە وەك بەڵگە لەسەر ڕەوشتی جوان دەهێنرێتەوە، کە ئێمەش وەك پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) ڕەوشت و خوومان جوان بێ، بەڵام ئەگەر تەماشای سیاقی ئایەتەکان بکەین، دەبینین پێش ئەم ئایەتەو ئایەتەکانی دواییش، هەمووی باسی جەنگ و جیهادە، کەواتە: مەبەستی ئەسڵیی لەم ئایەتە، یانی: لە جەنگ و جیهادو فیداکاریی لەپێناوی خواداو، لەپێناوی دینی خوادا، پێغەمبەری خوا سەرمەشقە بۆ ئێوە، چونکە لەپێش ئەم ئایەتەدا خوای پەروەردگار باسی بەسەرهاتی جەنگی خەندەق دەکات، جەنگی ئەحزاب کە لەسەرەتاوە دەیهێنێ:

﴿ يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوا۟ ٱذْكُرُوا۟ نِعْمَةَ ٱللَّهِ عَلَيْكُمْ إِذْ جَآءَتْكُمْ جُنُودٌ فَأَرْسَلْنَا عَلَيْهِمْ رِيحًا وَجُنُودًا لَّمْ تَرَوْهَا ۚ وَكَانَ ٱللَّهُ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرًا ﴿٩﴾ ﴾ الأحزاب.

دوایی دەفەرموێ:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْـَٔاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ وَلَمَّا رَءَا ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْأَحْزَابَ قَالُوا۟ هَـٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ ۚ وَمَا زَادَهُمْ إِلَّآ إِيمَـٰنًا وَتَسْلِيمًا ﴿٢٢﴾ مِّنَ ٱلْمُؤْمِنِينَ رِجَالٌ صَدَقُوا۟ مَا عَـٰهَدُوا۟ ٱللَّهَ عَلَيْهِ ۖ فَمِنْهُم مَّن قَضَىٰ نَحْبَهُۥ وَمِنْهُم مَّن يَنتَظِرُ ۖ وَمَا بَدَّلُوا۟ تَبْدِيلًا ﴿٢٣﴾ ﴾ الأحزاب.

مەبەستم ئەوەیە کەزۆرجار ئایەتێك لەسیاقی خۆی دەری دێنی و، ئاگات لەپێشی و لەدوای نیە، واتایەکی هەڵە بەدەستـەوە دەدات!

**یان بۆ نموونە: ڕستەی:**

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴾ آل عمران: ٣١.

واتە: بڵێ: ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدوێ شوێنم بکەون خواش ئێوەی خۆشدەوێ، ئەم ڕستەیە لەچ سیاقێك دا هاتوە؟ لەم سیاقەدا کە دەفەرموێ:

﴿ لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَـٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ ﴾ آل عمران.

واتە: بابڕواداران بێبڕوایان لە جیاتی بڕواداران نەکەنە دۆستیان، وە هەرکەسێك ئەوە بکات، ئەوە هیچ پەیوەندیی - ئیمانیی - بەخواوە نیە، مەگەر لەحاڵێکدا وەك خۆپاراستن خۆتانیان لێ بپارێزن {وە بەڕووکەشیی نزیکیی خۆتانیان پیشانبدەن} وە خوا لە - سزای - خۆی دەتانترسێنێ و سەرەنجامیش هەر بۆلای خوایە.

دوایی بەردەوام دەبێ و دەفەرموێ:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ﴾ آل عمران: ٣١.

کەواتە: ئەم ئایەتە مەبەست پێی ئەوەیە: ئێوەش لەوەدا بەدوای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکەون، کە بێجگە لەخواو ئیمانداران، کەسی بەدۆست نەگرتوە و، نەچن کافران بە دۆست بگرن، چونکە کەسێك شوێنکەوتووی



پێغەمبەرە (صلی الله علیه وسلم)، کە بێجگە لە خواو ئیمانداران کەسی دیکە بە دۆست و پشتیوانی خۆی نەزانێ، کەچی مسوڵمانی وا هەیە، ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوەو، لە حیزبێکی عەلمانییش دایە، وە هی وا هەیە ئەم ئایەتە دەخوێنێتەوەو، ڕیشی خۆیشی بەدەست کافرێکەوە، یان بەدەست مونافیقێکەوە داوە! بەڵام ئەگەر سەرنجی کۆی ئایەتەکان بدات، دەزانێ کە هەڵوێستەکەی ڕاست دژو پێچەوانەی ئایەتەکەیە، چونکە ئایەتەکانی فەرمایشتی خوا، وەك ئاڵقەکانی زنجیر یەکدی دەبەستنەوە، خۆ حاشا لە فەرمایشتی خوا هەر تیرە لە کەندەڵانێك نیە!

بەڵکو هەموو ئایەتەکان پێکەوە پەیوەستن، بەڵام دەبێ تۆ سەرنجی ئەوانەی پێشێ و ئەوانەی دوایی بدەی، وە هەر وشەیەکی قورئان وهەر ڕستەیەکی قورئان، بتەوێ مانایەکەی بە ڕاست و دروستی بزانی، دەبێ تەماشای هەموو ئایەتەکانی پێشووی و دواتری بکەی، ئەوکاتە واتاکەی چاکتر بە دەستەوە دەدات.

## هۆکاری دووەم: سەرنجدانی سوننەت و سیرەی پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) :

### بەڵێ بەڕێزان!

بۆ چاك تێگەیشتنی قورئان و تێگەیاندنی خەڵك لە قورئان، دەبێ تەماشای سیرە و سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەین، چونکە خوا دەفەرموێ:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: وە قورئان (ذکر) مان ناردۆتە خوار بۆ تۆ، تاکو ئەوەی بۆ خەڵك هاتۆتە خوار بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بۆخۆشیان بیر بکەنەوە.

بەڵام لێرەدا دەمەوێ ئەوەتان پێ بڵێم کە پێشتریش باسمان کردوە: سوننەتی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) تەفسیری قورئان نیە و، پێغەمبەری خوا

قورئانی تەفسیر نەکردوە و، ئەگەر پێویست بایە، بێگومان تەفسیری دەکرد، ئەدی یانی چی کە دەڵێن: پێغەمبەری خوا ڕوون کەرەوەی قورئانە ؟ واتە: ئێمە کاتێك لە قورئان تێدەگەین و دەزانین چۆن کاری پێدەکرێ و چۆن بەرجەستە دەکرێ، لەسەر ئەرزی واقیع؟

کەتەماشای پێغەمبەری خوا بکەین: بانگەواز چۆن دەکرێ؟ تەماشای پێغەمبەری خوا بکە.

سەرەتا خەڵك بۆلای چی بانگ دەکرێ؟ تەماشای پێغەمبەری خوا بکە، عیبادەت چۆن دەکرێ؟ تەماشای پێغەمبەری خوا(صلى الله عليه وسلم) بکە.

کۆمەڵگا چۆن دەگۆڕدرێ و چاکسازیی و پاکسازیی دەکرێ؟ تەماشای پێغەمبەری خوا بکە، دەوڵەت و حکوومەت چۆن تەشکیل دەکرێ؟ تەماشای پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکە.

چۆن لەگەڵ ئەهلی کوفردا جەنگ و جیهاد دەکرێ؟ تەماشای قۆناغەکانی جەنگ و جیهادی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکە.

کەواتە: هۆکاری دووەم بۆ چاك لێ تێگەیشتنی قورئان، ئەوەیە کە باش سەرنجی سوننەت و ڕێباز و فەرمایشتەکانی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) بدەین، کە قورئانیان بە بەرجەستە کراویی تێدایە، پێشتریش باسم کرد: کە قورئان و سوننەت دوو شتی لەیەك جیا نین، بەڵکو سوننەتی پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) {وشەی سوننەت واتە: ڕێباز} بریتیە لە بەرجەستەکردنی قورئان لەسەر ئەرزی واقیع، نەك بڵێی قورئان شتێکە و سوننەت شتێکی دیکەیە، بەڵکو سوننەتیش هەر قورئانە، بەڵام بە بەرجەستە کراویی و بە تەتبیق کراویی و، بە زیندوویی لەسەر ئەرزی واقیع، پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) قورئانی بەرجەستە کردوە.



## هۆكاری سێیەم: بەهرە وەرگرتن لە پێشینی چاكمان:

بەڵێ، بۆ لێ تێگەیشتنی قورئان: هۆكارێكی دیكە بریتیە لە بەهرە وەرگرتن لە پێشینی چاكمان، خوا دەفەرمویێ:

﴿فَسْـَٔلُوٓاْ أَهْـلَ ٱلذِّكْرِ إِن كُنتُمْ لَا تَعْلَمُونَ﴾ النحل: ٤٣.

واتە: لە زانایان بپرسن، ئەگەر نازانن، زانایانی پێش ئێمە، چ توێژەرەوانی قورئان، چ فەرموودە ناسان، چ شەرعزانان، دەبێ تەماشا بكەین چۆن لە قورئان تێگەیشتوون! لە لێ تێگەیشتنی ئەوان بەهرە وەربگرین، بەڵام دەبێ وریا بین، تەفسیرەكانی ئەوان و بۆچوونەكانی ئەوان و ئیجتیهادەكانی ئەوان، نەكەینە دین، چونكە هەموو ئەوەی ئەوان بەرهەمیان هێناوە، تێگەیشتنی ئەوانە لەبارەی قورئان و ئایینەوە، نەك خودی قورئان و دین.

دیارە هەر كاتێ وەك دینیش مامەڵەمان لەگەڵ تێگەیشتنەكان لە دین دا كرد، دینمان زۆر دەبن، بەڵام ئەگەر گوتمان: ئەوە تێگەیشتنی ئەوانە دەربارەی ئەو ئایەتە، ئەو فەرمایشتەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم)، ئەو كاتە دین هەر یەك دینە، بەڵام بە تێگەیشتنی جۆراو جۆرەوە، ئنجا بە تەئكید ئەوان بۆ سەردەمی خۆیان تەماشای قورئانیان كردوە، ئێمەش پێویستە بۆ سەردەمی خۆمان دووبارە تەماشای بكەینەوە، نابێ عەقڵی خۆمان دابخەین، بۆیەش خوا دەفەرموێ:

﴿لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

كەواتە: ڕوونكردنەوەی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بەدیل نیە بۆ بیركردنەوەی خۆمان، خۆشمان دەبێ بیر بكەینەوە، وە بەڕاستی زانایانی ئیسلام و پێشەوایانی ئیسلام، تەنیا ئەوانەیان توانیویانە گۆڕانكاریی بكەن، كە بەعەقڵێكی ئازاد و كراوە، بەدڵێكی بوێرانەوە، تەماشای قورئان و ئایەتەكانی خواو فەرمایشتەكانی پێغەمبەریان (صلی الله علیه وسلم) كردوە.

## هۆکاری چوارەم: خۆ ڕازاندنەوە بە پارێزکاریی:

چونکە چەندە ئینسان ئەهلی تەقوابێ، زیاتر لەقورئان تێدەگا، بەڵگەمان چی یە؟ ئەوەیە کە خوا دەفەرموێ:

﴿ الٓمٓ ﴿١﴾ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ﴿٢﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئەلیف، لام، میم، ئەو کتێبە گومانی تێدا نیە، ڕێنمایی کەرە بۆ پارێزکاران، بەڵێ بە ئەندازەی ئەوە کە ئینسان پارێزکار دەبێ و خۆی دەپارێزێ لە تووڕەیی خواو، لەو شتانەی کە خوا پێی ناخۆشن، کە چواندنی فەرزەکان و شکاندنی قەدەغەکانە و، ئەمیش بێگومان دەرەنجامی پابەند بوونە بە شەریعەتەوە، لە قورئان تێدەگا و دڵی ڕۆشن دەبێتەوە، وەك خوا سبحانە وتعالى لە سوورەتی (الأنفال) دا دەفەرموێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِن تَتَّقُواْ ٱللَّهَ يَجۡعَل لَّكُمۡ فُرۡقَانٗا ﴾ الأنفال.

واتە: ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە! ئەگەر پارێز لە خوا بکەن، خوا فورقانتان پێ دەبەخشێ، (فرقان) یش حاڵەتێکە کە ئینسان حەق و ناحەق، حەڵاڵ و حەرام، چاك و خراپی پێ، لەیەك جیادەکاتەوە .

## هۆکاری پێنجەم و کۆتایی: وەدەست هێنانی زانیاری و شارەزایی:

ئینسان چەند ئاسۆی عەقڵی کراوەتر بێ و، چەند زانیاری زیاتر بێ، دەربارەی ئەو واقیعە کە تێیدا دەژی، دەربارەی تەوژمە فکرییەکان و تەوژمە سیاسییەکان، دەربارەی خێر و شەڕی ئەو کۆمەڵگا و دەوروبەرە، مێژووی، کلتوور و فەرهەنگی.. هتد، وە دەربارەی زانستە جۆراو جۆرەکان، مرۆڤ چەند عەقڵی فراوانتر بێ و پڕ مەعلووماتتر بێ و، چەکدارتر بێ بە زانیاری، زیاتر لە قورئان تێدەگا.



یەکێك تەماشای سوورەتێك لە قورئان دەکا، تەنیا مانایەکی سادەی لێ وەردەگرێ، بەڵام یەکێکی دیکە تەماشای دەکا، یەك بار مانای لێ وەردەگرێ، چەنکە عەقڵەکەی چەکدارە بە شارەزایی و زانیاری زۆر.

با لێرەدا دوو نموونە بێنینەوە:

**یەکەم:** ئەگەر بەچاوی ڕووت سەیری دڵۆپە ئاوێك بکەی، هەر دڵۆپە ئاوێکە و دەی بینی، بەڵام ئەگەر بە وردبین (میکرۆسکۆب) تەماشای بکەی، مەخلووقات و زیندەوەری زۆری تێدا دەبینی.

**دووەم:** لەدوورەوە تەماشای دەریا بکە: تەنیا مەخلووقێکی شین یان سەوز دەبینی، بەڵام کاتێك دەچی یە سەری، تەماشا دەکەی زیندەوەر و ماسی و جرِ و جانەوەری زۆری تێدایە، وە ئەگەر بچیە نێوی، تەماشای دەکەی شتی عەجایەبتریش لە بنەوە هەیەو، گەوهەر و مرواریشی تێدایە!

بۆیە بەڕاستی ئێمە هەتا زانیارییمان زیاتربێ و هەتا ئاسۆی بیر و عەقڵمان فراوانتر بێ، زیاتر لە قورئان تێدەگەین وەك خوای زانا دەفەرموێ:

﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: وە ئەو وێنانە بۆ خەڵك دێنینەوە، بەڵام تەنیا زانایەکان لێیان تێدەگەن.

کەواتە: ئینسان بە ئەندازەی ئەوە کە عیلمی هەیە، لە وێنە هێنانەوەی قورئان تێدەگا.

هەروەها خوا دەفەرموێ:

﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُوا۟ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِىٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِىٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ﴿٦﴾ ﴾ سبأ.

واتە: وە ئەوانەی کە زانیارییان پێدراوە، دەزانن، کە ئەوەی لە پەروەردگارتەوە هاتوە، حەقە و ڕێنمایی دەکا بۆ ڕاستە شەقامی خوای زاڵی ستایش کراو.

هەروەها خوا عزوجل دەفەرموێ:

﴿ كِتَٰبٌ فُصِّلَتْ ءَايَٰتُهُۥ قُرْءَانًا عَرَبِيًّا لِّقَوْمٍ يَعْلَمُونَ ﴿٣﴾ ﴾ فصلت.



واتە: ئەمە کتێبێکە ئایەتەکانی ڕۆشن کراونەوە، قورئانێکی عەرەبیی یە بۆ کەسانێك کە بزانن، کەواتە: ئەوکەسەی کە نەزانێ، ئیستیفادەی لێ ناکا.

ئنجا لێرەش دا مەسەلەیەکی گرنگ هەیە، ئەویش ئەوەیە کە سەرجەم هۆکار و هەنگاوەکانیش، واتە: چ قورئان بە قورئان تەفسیر بکەین، چ بگەڕێینەوە بۆ سوننەت، چ بگەڕێینەوە بۆ قسەی زانایان، چ بمانەوێ زانست و شارەزایی وەدەست بێنین، هەمووی پێویستی بە عەقڵەو، بۆ هەمووی دەبێ عەقڵی خۆمان بەکاربێنین، عەقڵ و هۆشێکی کراوە و چالاك، بۆیە خوا سبحانه وتعالی دەفەرموێ:

﴿ أَفَلَا يَتَدَبَّرُونَ ٱلْقُرْءَانَ أَمْ عَلَىٰ قُلُوبٍ أَقْفَالُهَآ ﴿٢٤﴾ ﴾ محمد.

واتە: ئایا لە قورئان ورد نابنەوە، یاخود لەسەر دڵیان (عەقڵیان) قفڵەکانیان هەن؟ یانی: ئایا عەقڵیان قفڵ دراوە، یان لێی ورد نابنەوە ؟ هەر کەسێ لە قورئان ورد بێتەوە، بە عەقڵێکی کراوە و ئازادەوە، لەڕاستی دا لێی تێدەگا و لێی بەهرەمەند دەبێ. ئنجا لە کۆتایی دا دەڵێین: خوا دەفەرموێ:

﴿ كَذَٰلِكَ يُبَيِّنُ ٱللَّهُ لَكُمْ ءَايَٰتِهِۦ لَعَلَّكُمْ تَعْقِلُونَ ﴿٢٤٢﴾ ﴾ البقرة.

واتە: ئاوا خوا ئایەتەکانی خۆی بۆ ئێوە ڕوون دەکاتەوە، بەڵکو بفامن، بەڵکو عەقڵتان هەبێ، کەواتە: بایی ئەوەندە کە ئینسان عەقڵی هەیە و عەقڵی خۆی بەکاردێنێ، - چونکە هەموومان عەقڵمان هەیە - بەڵام بایی ئەوەندە کە ئینسان کە عەقڵی خۆی بەکاردێنێ و خۆی ماندوو دەکا، زیاتر لە قورئان بەهرەمەند دەبێ.

خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی ئێمە لەو کەسانە بگێڕێ، کە هەموو ئەو ئەرکانە بەرانبەر بە قورئان، بە چاکترین شێوە جێبەجێ دەکەن، وە خوا بە لوتف و کەرەمی خۆی خەڵکی مسوڵمانی کوردستان و عیراقیش لە دەوری چرای قورئان کۆبکاتەوە، خوا یارمەتی ئەو خەڵك و میللەتەی ئێمە بدا، کە باش لە کتێبی خوا تێبگەن، بۆ ئەوەی سەرفرازیی و بەختەوەریی دنیا و دوارۆژ بۆخۆیان مسۆگەر بکەن.

سبحان ربك رب العزة عما يصفون وسلام على
المرسلين والحمدلله رب العالمين

# ئەم بەشە

## خوێنەری بەڕێزا

ئەم بەشە كۆی حەوت وانەیە كە لە خول (دورة)ێك دا گوتراونەوەو پاش هێنرانە سەر كاغەزیان[1] و پێداچوونەوەو كەم و زیاد تێداكردنێكی باشی خۆم، بەم شێوەیان لێهاتوە.

لەخوای میهرەبانیش داواكارم زیاتر دامەزراوو نەلەخشاومان بكات و، هەموو لایەكیشمان تۆفیق بدات بۆ هەرچی زیاترو چاكتر خزمەت كردن بە كتێبی بەڕێزو بەپێزی خۆی و، لەو كەسانەمان بگێڕێ كە بەهۆی قورئانەوە، بەرزیی دنیاو دوارۆژیان بە قسمەت دەبێ، وەك پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:

(إنَّ الله يَرفَعُ بهذا الكَلامِ أَقوامًا) رواه مسلم.

واتە: بێگومان خوا بە هۆی ئەم فەرمایشتە وە كەسانێك بەرز دەكاتەوە.

هەروەها فەرموویەتی:

(إنَّ أَفْضَلكُم مَن تَعلَّمَ القُرآن وعَلَّمَه) رواه البخاري برقم: ٥٠٢٨.

واتە: بێگومان چاكترینتان ئەو كەسەیە كە شارەزای قورئان دەبێ و خەڵكی لێ شارەزا دەكات.

---

(١) شایانی باسە سەرەتا برای بەڕێزم كاك (ئومێد مصطفى) هێنانیە سەر كاغەز و، پاشان برای بەڕێزم كاك (عمر حەمەتاڵ) دووبارە بە خەتێكی خۆش نووسینیەوە، خوا پاداشتیان بداتەوە. دیارە ئەم بابەتەش یەكێكە لە باسەكانی كتێبی: (الأسلام كما يتجلى في كتاب الله) بەرگی سێیەم (الإيمان بكتب الله تعالى).



# دەستپێك و ڕێخۆشكردن

بِسۡمِ ٱللَّهِ ٱلرَّحۡمَٰنِ ٱلرَّحِيمِ

الحمد لله رب العالمين وصلى الله تعالى وسلم و بارك على حبيبنا محمد و آله أجمعين، من الصحب و الأزواج و القرابة و التابعين لهم بإحسان الى يوم الدين.

### خوشك و برایانی بەڕێزو خۆشەویست!

السلام عليكم ورحمة الله وبركاته

خوا پشتیوان بێ زنجیرە وانەیەكتان پێشكەش دەكەم، كە حەوت وانەن لە ژێر ناوونیشانی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟!).

شایانی باسیشە ئەم باسە، هێڵە سەرەكییەكانی و هەوێنەكەی یەكێكە لە باسەكانی نێو كتێبی: (الإسلام كما يتجلى في كتاب الله) كە كاتی خۆی لە زیندانی ئەمەریكادا نووسیومە.

### سەرەتا دەڵێین:

بێگومان ئیمان بە كتێبی خوا - كە مەبەستمان پێی قورئانە، كە دوایین كتێبی خوای پەروەردگارە، تاكە كتێبی خوای پەروەردگاریشە كە بە ساغیی و دەستكاریی نەكراویی لە دەستی بەشەردا ماوەتەوە - بەڵێ ئیمان بە كتێبی خوا، یەكەمین هەنگاوی بەهرەمەند بوونە لە كتێبی خوای پەروەردگار، بەڵام من

لێرەدا بۆیە باسی ئەوە ناکەم، چونکە ئێمە ئەم دەرسانە بۆ خەڵکی مسوڵمان دەخەینە ڕوو، دیارە ئینسانی مسوڵمانیش کەسێکە پێشتر ئیمانی بە کتێبی خوا هێناوە، دەشتوانین بۆ پێناسەی ئیمان هێنان بە کتێبی خوا عز وجل، هەر بەکورتی بڵێین:

{ئیمان بە کتێبی خوا، بەڕاست زانینی قورئانە کە فەرمایشتی خوایەو بۆ پێغەمبەری کۆتایی (محمد) علیه الصلاة والسلام ناردوویەتی، پاشان هەڵس و کەوت کردنە لەگەڵ کتێبی خوادا، بەو شێوەیەی کە خوا فەرموویەتی}.

واتە: بەڕاست زانینی کتێبی خوای پەروەردگار و هەڵس و کەوت کردنێکی ڕاست و دروست لەگەڵی دا، دوو پێکهێنەری سەرەکی ئیمان بە کتێبی خودا پێك دێنن.

جا ئێمە لەم زنجیرە وانەیەدا تەنیا باسی پێکهێنەری دووەمیان دەکەین: (چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ کتێبی خوای پەروەردگاردا)، چونکە وەك گوتمان: ئینسانی مسوڵمان لەوە بۆتەوە کە ئەوە کتێبی خوایە و بەڕاستی دەزانێ و، دەزانێ کە فەرمایشتی خوایە و، بۆ پێغەمبەری کۆتاییە (علیه الصلاة والسلام).

دیارە ئێمە لە حەوت هەنگاودا، باسی چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ کتێبی خوای پەروەردگاردا دەکەین، وە بۆ هەرکام لەو حەوت هەنگاوانە، وانەیەك تەرخان دەکەین، بەم ناوونیشانانەی خوارێ:

### هەنگاوی یەکەم: ئەدەب نواندن و بە گەورەگرتن (التأدب والتعظیم)

بەڵێ بەڕێزان! یەکەمین هەنگاوی (هەڵس و کەوت کردنی ڕاست و دروست لەگەڵ قورئاندا) بۆ ئەوەی چاکتر لێی بەهرەمەند بین، ئەدەب نواندن و ڕێزگرتن و بە گەورە گرتنیەتی.

### هەنگاوی دووەم: خوێندنەوەو گوێ بۆ گرتن (التلاوة والإستماع)

دووەمین هەنگاویش بۆ ئەوە کە ئینسان لە کتێبی خوا شارەزا بێت، ئەوەیە کە یان بۆ خۆی بیخوێنێتەوە، یان گوێی بۆ بگرێ لە کەسانێك کە بەسەریدا دەخوێننەوە.



### هەنگاوی سێیەم: بیر لێ کردنەوەو تێوە ڕامان (التفکر والتدبر)

چونکە بێگومان ئینسان چ بۆ خۆی قورئان بخوێنێ، یان بەسەریدا بخوێنرێتەوە، ئەگەر بیری لێ نەکاتەوە و تێیەوە ڕانەمێنێ، تێی ناگات.

### هەنگاوی چوارەم: کارتێکران و پەند وەرگرتن (التأثر والتذکر)

واتە ئینسانی مسوڵمان دەبێ بە کتێبی خوای پەروەردگار کارتێکراو (متأثّر) بێ و کاریگەریی لەسەری هەبێ، وە دەبێ پەندی لێ وەرگرێ و ئەو ڕاستییانەی کە قورئان دەیانفەرموێ، هەزم (إستیعاب) یان بکاو وەریان بگرێ و، پەندو عیبرەتیان لێ وەرگرێ.

### هەنگاوی پێنجەم: شوێنکەوتن و مل بۆ کەچ کردن (الإتباع والتسلیم)

بەڵێ کەسێك بیەوێ لە کتێبی خوا عز وجل بەهرەمەند بێ، پێویستە شوێنکەوتنی بۆی هەبێ: بۆ ڕێنماییەکانی، بۆ یاساو دەستوورەکانی، وە دەبێ ملکەچیش بێ و پابەند بێ بەو شتانەوە، کە کتێبی خوا دەیان فەرموێ و لەسەری پێویست دەکات.

### هەنگاوی شەشەم: تەزکیە پێ کردن و فێرکردن (التزکیة والتعلیم)

شەشەمین هەنگاوی هەڵس و کەوتی ڕاست و دروست لەگەڵ کتێبی بەڕێز و بەپێزی خوادا تاکو چاکتر لێی بەهرەمەند بێ، ئەوەیە کە هەم خۆی پێ تەزکیە بکات و، خۆی ئاشنا و شارەزا بکات بە ڕاستییەکانی قورئان، وە هەم دەوروبەریشی پێ تەزکیە بکات و، فێری ڕاستییەکانی قورئانیان بکات.

### هەنگاوی حەوتەم و کۆتایی: چاکسازیی و حوکمڕان کردن (الإصلاح والتحکیم)

چونکە قورئان بۆیە هاتوە، هەم تاکەکان و هەم کۆمەڵگاش پاك و چاك بکات، وە هەم حوکمڕانیی بە سەر تاك و کۆمەڵدا بکات و، ئەو شەریعەتەی کە گرتوویەتە نێو خۆی، خەڵك پێوەی پابەند بێ و، لە ژیانی تایبەتی و کۆمەڵیی خۆیان دا پیادەی بکەن.

## جا بەڕێزان!

شایانی باسیشە کە:

ئەم حەوت هەنگاوانەی بۆ چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ کتێبی خوادا خستماننە ڕوو، وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك بە دوای یەکدا دێن، واتە پلە بە پلە بەدوای یەکدا دێن، چونکە:

هەنگاوی یەکەم کە بریتیە لە ئەدەب نواندن لە بەرامبەر کتێبی خوادا و، بە گەورەگرتن و ڕێز لێ گرتنی، ئەوە دیارە یەکەمین هەنگاوەو، هەرکەسێ بە ڕاستی ئیمانی بە قورئان هەبێ، لە بەرامبەریدا بە ئەدەب دەبێ و بە دەرو دەروون (ظاهر و باطن)ی و بە ڕواڵەت و بە ئاشکرا لە بەرامبەریدا بە ئەدەب دەبێ، و بە دڵیش بە گەورەی دەگرێ و بە بەرزو پیرۆزی دادەنێ.

ئنجا دوای ئەوەی کە بابای مسوڵمان، کتێبی خواو فەرمایشتی بێ وێنەی خوا عز وجل بە گەورە دەگرێ و بەرز ڕادەگرێ و، لەبەرامبەریدا بە ئەدەب دەبێ، دیارە ئەو جۆرە هەست و شعوورە، پاڵی پێوە دەنێ کە بیخوێنێتەوە، چونکە خوای پەروەردگار هەر بۆ ئەوە ناردوویەتی و وشەی (قرآن) واتە:(خوێندنەوە) یان (خوێندراوە). بەڵێ قورئان بۆ ئەوە هاتوە بخوێندرێتەوە و گوێی لێ بگیرێ.

بۆیە هەنگاوی دووەم بۆ ئینسانی مسوڵمان کاتێك کە دەیەوێ هەڵس و کەوتێکی بەو شێوەیەی کە خوا پێی خۆشە لەگەڵ کەلام و فەرمایشتەکەیدا بکات، ئەوەیە کە بیخوێنێتەوە، یان گوێی لێ بگرێ، کاتێك کە بەسەریدا دەخوێندرێتەوە.

پاشان بەدوای ئەم هەنگاوەشدا یەکسەر هەنگاوی سێیەم دێت، چونکە ئینسان کاتێك شتێك بەلایەوە گەورە و گرنگ بێ و بیخوێنێتەوە، دیارە بیری لێ دەکاتەوەو، تێی ڕادەمێنێ و پێیدا قووڵ دەبێتەوە، وە ئەو هەنگاوەی سێیەم

هەنگاوی چوارەمیشی بەدوادا دێ، چونكە كاتێك مرۆڤ بیر لە كتێبی خوا بكاتەوە و تێوەی ڕامێنێ، بێگومان كاری تێ دەكاو پەندی لێ وەردەگرێ.

ئنجا لە دوای كارتێكران و پەند لێ وەرگیرانیش، یەكسەر شوێن كەوتن و مل بۆ كەچكردن (الإتباع والتسليم) دێ، چونكە هیچ كەس نیە لە كتێبی خوا تبارك وتعالى تێبگات و كاری تێبكات، شوێنی نەكەوێ و بۆ ئاڕاستە و ئەمر و نەهییەكانی ملكەچ نەبێ!

پاشان هەر كەسێكیش ملی بۆ قورئان كەچ كرد و شوێنی كەوت، ئەوە بێگومان هەم خۆی پاك و چاك دەبێ و بە ڕاستییەكانی قورئان شارەزا دەبێ و، هەم خەڵك و دەوروبەریشی لەو تەزكیە بوون و شارەزابوونەدا بەشدار دەكات.

وە سەرەنجام هەر كەسێكیش بە قورئان تەزكیە بوو و فێری ڕاستییەكانیشی بوو، هەوڵ دەدات دەوروبەریشی پاك و چاك بكات، وە هەوڵ دەدات كە ئەو قورئانە و ئەو شەریعەتە لە دەوروبەریدا ڕەنگ بداتەوە و بەسەر كۆمەڵگای دەوروبەریدا بیچەسپێنێ.

ئێستاش با بێینە سەر وانەی یەكەم، كە هەنگاوی یەكەمە:

وانەی یەکەم

هەنگاوی یەکەم:

# ئەدەب نواندن و بە گەورەگرتن

(التأدُّب والتعظيم)

خوای پەروەردگار لەو ڕۆژەوە، کە ئادەمی لەسەر زەوی دانا، بەڵێنی بەخۆی و وەچەکەی دا، هەروەها بەڵێنی بە (جن)یش دا، کە ئەوانیش وەچەی ئیبلیسن، کە لە هیدایەت و بەرنامەی خۆی بەهرەمەندیان بکات و، حەواڵەی خۆیانیان نەکات، بۆئەوەی لە تاقیکردنەوەی ژیانی دنیای سەر زەوی دا دەربچن و، موژدەی پێدان کە: بەرنامەی خۆمتان بۆ دەنێرم:

﴿فَإِمَّا يَأْتِيَنَّكُم مِّنِّي هُدًى فَمَنِ اتَّبَعَ هُدَايَ فَلَا يَضِلُّ وَلَا يَشْقَىٰ ﴿١٢٣﴾﴾ طه.

واتە: ئنجا کاتێك لە منەوە هیدایەتتان بۆهات، هەر کەسێك دوای هیدایەتی من بکەوێ، ئەوە مسۆگەر نە ون دەبێ و نەڕێی لێ تێك دەچێ و، نە ژین تاڵیش دەبێ، (چونکە ئینسان، کە ڕێی لێ تێکچوو، ژین تاڵ و چارەڕەش دەبێ).

ئنجا دوایین کتێبی خوای بە بەزەیی بۆ مرۆڤایەتیی، قوڕئانە و، هەر کەسێك بەڕاستی ئیمانی بەوە هەبێ، کە ئەو قوڕئانە خوا ناردوویەتی و، فەرمایشتی خوایە و خوا بۆخۆی فەرموویەتی، ئەوە بێگومان ئەو ئیمان و قەناعەتەی پاڵی پێوە دەنێ، کە ئەوپەڕی ئەدەب و ڕێز و بە گەورەگرتنی لە بەرامبەریدا هەبێ.



هەڵبەتە ئێمە نازانین خوا عز وجل چۆن فەرمایشت دەكات و قسە دەفەرمویٚ، بەڵام بە تەئكید دەزانین، كە قورئان فەرمایشتی خوایە، چونكە خوای كاربەجیٚ بۆ خۆی ناوی لە قورئان ناوە:(كلام الله) وەك فەرموویەتی:

﴿وَإِنۡ أَحَدٞ مِّنَ ٱلۡمُشۡرِكِينَ ٱسۡتَجَارَكَ فَأَجِرۡهُ حَتَّىٰ يَسۡمَعَ كَلَٰمَ ٱللَّهِ﴾ التوبة: ٦.

واتە: ئەگەر یەكێك لە هاوبەش بۆ خوا دانەرەكان پەنای بە تۆ گرت - ئەی (محمد)! علیه الصلاة والسلام- تۆ پەنای بدە، بۆ ئەوەی، كە فەرمایشتی خوا ببیستیٚ. كەواتە: قورئان فەرمایشتی خوایە و، لە ڕێی پێغەمبەرەوە مرۆڤایەتیی پیٚ دواندوە و، قسەی پیٚ لەگەڵ سەرجەم ئینسان و جند دا كردوە.

## بەڵیٚ بەڕێزان!

ئەدەب نواندن لەگەڵ فەرمایشتی خوادا و، بەگەورە گرتنی و ڕێز لیٚ گرتنی، بەرهەمی ڕاستەوخۆی ئیمان پیٚ بوونیەتی و، كەسێك بەڕاستیی بزانیٚ، كە ئەم قورئانە فەرمایشتی خوایە و خوا ناردوویەتی و فەرموویەتی، بێگومان ئەگەر ئیمانی بە خوا هەبیٚ و، بەوە هەبیٚ، كە قورئان خوا خۆی فەرموویەتی: ڕێزی لیٚ دەگریٚ و بە گەورەی دەگریٚ و، لەگەڵی دا بە ئەدەب دەبیٚ.

ئنجا ئەدەب نواندنی ئینسانیش لەبەرانبەر كتێبی خواداو، ڕێز لیٚ گرتنی و بەگەورەگرتنی، بە ئە ندازەی ئیمان پیٚ بوونیەتی، كەواتە كەسێك بیەویٚ كتێبی خوا بە گەورە بگریٚ - كە ئەوە لەسەری فەرزە، بەڵكو بریتیە لە كاكڵی ئیمان پیٚ بوونی و، كەسێك ڕێز لە كتێبی خودا نەگریٚ، بێگومان ئیمانی پێی نیە - بەڵیٚ كەسێك بیەویٚ باش ڕێز لە كتێبی خوا بگریٚ و لەگەڵی دا بە ئەدەب بیٚ و بە بەرزی بگریٚ، دەبیٚ هەوڵ بدا، ئیمانەكەی بە خوای پەروەردگار قووڵ بكاتەوە، چونكە هەتا ئیمانی زیاتربیٚ، ئەدەب و تەعظیم و بەبەرز گرتنیشی بۆ قورئان زیاتر دەبیٚ و، ئەوكەسەش، كە ڕێز لە قورئان ناگریٚ، لە ڕاستی دا ڕێز لە خاوەنەكەی ناگریٚ و، ئیمانی پێی نیە و، كەسێك ڕێز و تەقدیری قورئان نەزانیٚ، ئەوە بەرلەوە ڕێزی لە خاوەنەكەی نەگرتوە و، ئیمانی پێی نەهێناوە، بەڵیٚ ڕەنگە بزانیٚ، كە خوا فەرموویەتی، بەڵام ئیمانی پێی نیە، چونكە ئیمان پیٚ بوون جیایە،



له زانین، هی وا هەیه دەزانێ خوای پەروەردگار هەیه، بەڵام ئیمانی به خوا نیه، بۆ نموونه: ئیبلیس دەزانێ، که خوا هەیه، بەڵام ئیمانی به خوا نیه، هەروەها فیرعەون و دارو دەستەکەی دەیانزانی (موسی) علیه السلام پێغەمبەری خوایه و وەحی له خواوه بۆ دێ، بەڵام ئیمانیان پێی نەبوو، وەك خوا عز وجل دەفەرموێ:

﴿وَجَحَدُواْ بِهَا وَٱسۡتَيۡقَنَتۡهَآ أَنفُسُهُمۡ ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗاۚ﴾ النمل: ١٤.

واته: فیرعەون و دارودەستەکەی یەقینیان هەبوو به پێغەمبەرایەتیی (موسی) علیه السلام و به موعجیزەکانی، بەو پەیامەی، که بۆ فیرعەون و دارو دەستەکەی هێنابووی، دڵنیابوون، که له خواوەیه، بەڵام دانیان پێدا نەهێناو نکووڵییان لێ دەکرد، بۆچی؟! خوا فەرموویەتی: (ظُلۡمٗا وَعُلُوّٗا) لەبەرئەوەی چاویان له ستەم و، خۆ بەزلگریی بوو، بۆیه فیرعەون و دارو دەستەکەی مل کەچ نەدەبوون بۆ ئەو پەیام و بەرنامەیەی، که (موسی) علیه السلام له خواوه هێناویەتی، چونکه ئەگەر ملکەچ بوونایه بۆ ئایین و پەیامەکەی (مووسا)، دەبووایه واز له فیرعەونایەتیی بێنن! کەواته: جاری وا هەیه مرۆڤ دەزانێ خوا قورئانی ناردوه، بەڵام ئیمانی پێی نیه.

ئیمان بەوە، که خوای زانا وشارەزا قورئانی ناردوه، ئەوەیه وەك گوتمان که: بەڕاستی بزانێ و به شێوەیەکی واش هەڵس و کەوتی لەگەڵ دا بکات، که بۆی شایستەیه، هەروەك، ئیمان بەخواش (جل شأنه) ئەوەیه، که تۆ بزانی و دڵنیابی، که خوا عز وجل تاکه بەدیهێنەرو پەروەردگارو پەرستراوه، وه به شێوەیەك هەڵس و کەوتی لەگەڵ بکەی، که بۆ خوا شایستەیه: له هەموو کەست خۆشتر بوێ، له هەموو کەس و شتێك زیاتر لێی بترسی، له هەموو کەس زیاتر شەرمی لێ بکەی، له هەموو کەسی به گەورەتر بگری، ئەوپەڕی بۆی ملکەچ بی، پشتی پێ ببەستی، به بەرنامەکەیەوه پابەند بی، ئەوه هەمووی دێته نێو چەمکی هەڵس و کەوت کردنێك لەگەڵ خوای پەروەردگاردا، که بۆی شایستەیه، ئەگەر نا کەسێك، که دەڵێ: دەزانم خوا هەیه، بەڵام ئەو شتانەی تێدا نەبن، که باسمان کردن، ئەوه ئیمانی به خوا نیه، بۆچی ؟! چونکه به شێوەیەك هەڵس و کەوتی

لەگەڵ خوادا نەکردوە، کە بۆی شایستەیە[١]، هەروەها کەسێکیش، کە دەڵێ دەزانم قورئان خوا ناردوویەتی، بەڵام پێیەوە پابەند نابێ، یان بە گەورەی ناگرێ و بەرامبەری بە ئەدەب نابێ و .. هتد، ئەوە لە ڕاستی دا ئیمانی پێی نیە.

## کورتەی قسان:

ئیمان هەبوون بە کتێبی خواو بە ڕاست زانینی، دەبێتە هۆی ئەدەب نواندن بەرامبەری و، بەگەورە گرتنی و بەبەرزو پیرۆز گرتنی، وە هەتا ئینسان ئیمانی زیاتر بە خوا هەبێ، ئیمانی زیاتر بە قورئان دەبێ، ئنجا هەتا ئیمانیشی زیاتر بە خوا سبحانه وتعالى و کتێبەکەی هەبێ، ئەوە لەگەڵ کتێبی خوادا بە ئەدەب تر دەبێ، وە زیاتر بەبەرزو گەورەی دەگرێ.

ئنجا ئینسان ئەگەر بیربکاتەوە لە قورئان، کە چۆن خوای بەرزو گەورە ئەو قورئانەی فەرمووەو بەبەرزترین و چاکترین و پاکترین فریشتەی خۆی دا، کە (جبريل)ە، بۆ گەورەترین پێغەمبەری خۆی، دایبەزاندوە، زیاتر بەرانبەری بەئەدەب دەبێ و بە بەرز و گەورەی دادەنێ.

چونکە هەموو زانایان لەسەر ئەوە یەکدەنگن، کە هەروەك چۆن سەروەری پێغەمبەران (محمد)ە، عليه الصلاة والسلام، وە گەورەی کتێبەکانی خوا، قورئانە، گەورەی هەموو فریشتەکانیش (جبريل)ە، عليه السلام، کە خوای پەروەردگار چوار ناوی بۆ بەکارهێناون: (الروح) و (الروح الأمين) و (جبريل) و (روح القدس).

---

(١) لە بەرگی یەکەمی: (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی لەبەر ڕۆشنایی قورئان و سوننەت دا) بە درێژیی باسی ئیمان و، پێکهێنەرەکانیمان کردوە و، ڕوونمان کردۆتەوە کە هەرکام لە: زانینی عەقل و، قبووڵکردنی دڵ و، دانپێداهێنانی زمان و، کردەوەی ئەندامەکان، پێویستن بۆ هاتنەدی ئیمان.
هەروەها لە بەرگی دووەمی کتێبی (الاسلام كما يتجلى في كتاب الله)دا باسێکی چڕوپڕمان لەبارەی ئیمانەوە کردوە.

ئنجا خوای زانا و شارەزا لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿ وَإِنَّهُۥ لَتَنزِيلُ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿١٩٢﴾ نَزَلَ بِهِ ٱلرُّوحُ ٱلْأَمِينُ ﴿١٩٣﴾ عَلَىٰ قَلْبِكَ لِتَكُونَ مِنَ ٱلْمُنذِرِينَ ﴿١٩٤﴾ بِلِسَانٍ عَرَبِيٍّ مُّبِينٍ ﴿١٩٥﴾ ﴾ الشعراء.

واتە: بێگومان ئەم قورئانە دابەزێنراوی پەرروەردگاری جیهانەکانە، گیانی ئەمیندار (الروح الأمين) دایبەزاندوە بۆ سەر دڵی تۆ، بۆ ئەوەی تۆ لە وریاکەرەوەکان بی، {خوای پەروەردگار ناوی لە پێغەمبەرانی خۆی ناوە ئاگادارکەرەوەکان، چونکە هاتوون، کە مرۆڤایەتیی هۆشیار بکەنەوەو ئاگاداری بکەنەوە، کە دنیا شاری بێ خاوەن نیە و، ئاگاداری بکەنەوە، کە ژیانی دنیا جێگای تاقی کرانەوەیەو ئینسان بەهەڵدا نەکراوە، بەڵکو لێپرسینەوەی لەگەڵدا دەکرێ و سزاو پاداشتێك چاوەڕێی دەکات} وە ئەو قورئانە بە زمانێکی عەرەبیی ڕوون و ئاشکرایە.

وشەی (عربي)ش واتە: ڕوون، وە وشەی (إعراب) واتە ڕوون کردنەوە، (أَعْرِبْ): واتە ڕۆشنی بکەوە.

وە بەڕاستی خوای کاربەجێ بۆیە زمانی عەرەبیی هەڵبژاردوە بۆ دوایین کتێبی خۆی، کە دیارە کتێبەکانی دیکەش بە زمانەکانی دیکەی مرۆڤایەتیی بوون:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا بِلِسَانِ قَوْمِهِۦ لِيُبَيِّنَ لَهُمْ ﴾ إبراهيم: ٤

بەڵێ سەرجەم ئەو کتێبانەی دیکەی خوا بە زمانەکانی دیکەی مرۆڤایەتی بوون، کە خەڵك قسەیان پێکردوون بە درێژایی مێژوو، بەڵام دوایین کتێبی خۆی، کە گەورەترینیانە زمانی عەرەبیی بۆ هەڵبژاردوە، چونکە کۆمەڵێك تایبەتمەندیی لە زمانی عەرەبیی دا هەن، کە لە زمانەکانی دیکەدا نین، کە دیارە ئەوانەی پسپۆڕو شارەزان، دەزانن چۆن چەندان وردەکاریی و لایەنی ڕەوانبێژیی و چاك تەعبیرکردن لە مەبەست، لە زمانی عەرەبیی دا هەن، کە لە زمانەکانی دیکەدا بەو شێوەیە نین.

ئنجا ئینسان کاتێك بیر دەکاتەوە، کە چۆن خوای بەرز و مەزن لە سەرووی حەوت ئاسمانانەوە (جبریل)ی بانگ کردوە، کە گەورەترین فریشتەی خۆیەتی و



سەرۆكی فریشتەكانە و، ئەو فەرمایشتانەی خۆی پێ فەرمووە و قورئانی فێركردوە، ئەویش بە (محمد)ی ڕاگەیاندوە، بەبێ كەم و زیاد، چۆن وەریگرتوە ئاوا دایبەزاندۆتە سەر دڵی پاك و پیرۆزی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، چونكە خوای پەروەردگار جیبریلی بە (الروح الأمين) وەسف كردوە، واتە (جبريل) ئەمینداره و یەك وشە و یەك پیتی تێدا زیاد و كەم نەكردوە.

بەڵێ كاتێك ئینسان بیر لەو مەسەلەیە دەكاتەوەو، دەیهێنێتە بەر ئاوێنەی عەقڵ و خەیاڵی خۆی، ئەوجار تێدەگات قورئان چەند بەرز و مەزن و بەڕێز و بە پێزە.

ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ، كە (جبريل) سەلامی خوای لێ بێ، وەك چۆن لە سەرەتاوە بە فەرمانی خوا عز وجل قورئانی بەڕێزی دابەزاندۆتە سەر دڵی موبارەكی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، مانگی ڕەمەزانی هەموو ساڵێكیش لەگەڵ پێغەمبەردا بە قورئانێ دا چۆتەوە، و لەگەڵیدا دەوری كردۆتەوە، وەك (أبو هريره) خوالێی رازی بێ لەو بارەوە گوتوویەتی:

(كان يَعرِضُ على النبي صلى الله عليه وسلم القرآنَ كُلَّ عامٍ مَرَّةً، فَعَرَضَ عَلَيهِ مَرَّتَينِ في العام الذي قُبِضَ..) رواه البخاري (برقم: ٤٩٩٨).

واتە: جیبریل هەموو ساڵێك جارێك قورئانی لەگەڵ پێغەمبەردا (صلى الله عليه وسلم) دەور دەكردەوە، بەڵام ئەو ساڵەی، كە تێیدا گیانی كێشرا، دووجار لەگەڵی پێداچۆوە.

بەڵگەش لەسەر ئەوە، كە جیبریل لە مانگی ڕەمەزانی هەر ساڵێك دا قورئانی لەگەڵ پێغەمبەردا دەور كردۆتەوە، ئەم قسەیەی (ابن عباس)ە خوا لە خۆی و بابی ڕازی بێ:

(كانَ النبيُّ صلى الله عليه وسلم أَجوَدَ الناسِ بالخيرِ، وأجودُ ما يكونُ في شهرِ رمضان، لأنَّ جبريل كانَ يَلقاهُ في كلِّ ليلةٍ في شهرِ رمضان حتى يَنسَلِخَ، يَعرِضُ عَلَيهِ رسُولُ الله صلى الله عليه وسلم القُرآن...) رواه البخاري (برقم: ٤٩٩٨).



واته: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) له هەموو کەس بەخشندەتر و سەخییتر بوو، بە تایبەت لە مانگی ڕەمەزان دا، چونکە جیبریل هەتا مانگی ڕەمەزان بەسەردەچوو، هەموو شەوێك پێیدەگەیشت، پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) قورئانی لەگەڵ دەور دەکردەوە.

## بەڵێ بەڕێزان!

ئینسان، کە بیر لەو مەسەلەیە دەکاتەوە، قسە لێکردن و تەعبیر لێ کردنی ئاسانە، بەڵام، کە دەیهێنیە بەرچاوی عەقڵ و خەیاڵ، یەکجار شتێکی گەورە و سەرسوڕهێنەرە! خوا بەو هەموو گەورەییەی، کە موڵکەکەی هێندە فراوانە هەر خۆی دەزانێ سنووری لە کوێیە؟، وە ئەوەندە وردەکاریی تێدایە، کە زانایان هەرکەسە لە بواری خۆیداو، کامەیان زۆر پسپۆڕە دەڵێ: ئەو وردەکارییەی، کە خوای پەروەردگار دایناوە لە دروستکراوەکانی خۆیدا، سنووری نیە! وەك فەرموویەتی:

﴿ صُنْعَ اللَّهِ الَّذِي أَتْقَنَ كُلَّ شَيْءٍ ﴾ النمل: ٨٨.

واته: دروستکراوی خوا، کە هەموو شتێکی زۆر بە وردەکاریی دروستکردوە، هەروەها دەفەرموێ:

﴿ مَّا تَرَىٰ فِي خَلْقِ الرَّحْمَٰنِ مِن تَفَاوُتٍ ﴾ الملك: ٣.

واته: لە دروستکراوی خوادا ناڕێکی نابینی. وە دەفەرموێ:

﴿ الَّذِي أَحْسَنَ كُلَّ شَيْءٍ خَلَقَهُ ﴾ السجدة: ١٧.

واته: ئەو خوایە هەر شتێك، کە دروستی کردوە، بە چاکترین شێوە دروستی کردوە.

دیارە زانایانیش ئەو شاهێدییە دەدەن و زۆر بە ڕاشکاویی دەڵێن: هەرچی کە خوا دروستی کردوە، دەبوو هەر بەو شێوەیە بووایە، کە هەیە، هەموویان کتێبی گەورە گەورەیان داناون، لەسەر وردەکارییەکانی دروستکراوەکانی خوا،



بەڵام دەڵێن: ئەوە گۆشەیەکە لەو ڕێك و پێکیی و وردەکارییەی، کە خوا لە درووستکراوەکانی خۆیدا دایناوە، ئنجا کاتێك ئەو خوایە عز وجل قسە بکات لەگەڵ گەورەترین فریشتەی خۆیدا و، ئەویش بە ئەمانەتەوە بۆ پێغەمبەری کۆتایی (علیه الصلاة والسلام) بیهێنێ، بەڕاستی ئینسان هەرچەندی دەکات مەسەلەکە هێندە مەزنە، بە زەحمەت لە عەقڵ و خەیاڵدا جێگای دەبێتەوە.

ئنجا ئایا قورئانێکی ئاوا چۆن نابێ ئینسان لە بەرانبەری دا بە ئەدەب بێ، وە چۆن نابێ هەتا ئەوپەڕی بە گەورەی بگرێ و بە بەرزی بگرێ؟! بۆیە خوای بێ وێنە لە سووڕەتی (الحشر)دا دەفەرموێ:

﴿ لَوْ أَنزَلْنَا هَٰذَا ٱلْقُرْءَانَ عَلَىٰ جَبَلٍ لَّرَأَيْتَهُۥ خَٰشِعًا مُّتَصَدِّعًا مِّنْ خَشْيَةِ ٱللَّهِ ۚ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٢١﴾ ﴾

دیارە لێرەدا خوای پەروەردگار دەیەوێ ئێمە تێبگەیەنێ و لەقەدەر عەقڵی ئێمە قسە دەکات، ئەگەر نا گەورەیی قورئان لەوە زۆرترە، وەك پێویست پێمان ئیستیعاب بکرێ، دەفەرموێ: ئەگەر ئەم قورئانەمان ناردبایە سەر چیایەك، تۆ ئەو چیایەت دەبینی زۆر بە ملکەچیی پارچە پارچە دەبوو. {چیا (جبل)، کە لە هەموو دروستکراوەکانی خوا لەسەر زەوی گەورەتر و سەخت ترو پتەوترە، دەتبینی لە ترس و سام و هەیبەتی خوا زۆر ملکەچ دەبوو، وە پارچە پارچەش دەبوو!} پاشان دەفەرموێ: (وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ لَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ )، ئەم وێنانە بۆ خەڵکی دێنینەوە بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە، واتە: بیری لێبکەنەوە؛ قورئان چەند بەرز و مەزنە!

هەروەها خوای پەروەردگار ستایشی خۆی کردوە لەسەر ئەوە، کە قورئانی ناردوە، دەفەرموێ:

﴿ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ عَلَىٰ عَبْدِهِ ٱلْكِتَٰبَ وَلَمْ يَجْعَل لَّهُۥ عِوَجَا ۜ ﴿١﴾ قَيِّمًا لِّيُنذِرَ بَأْسًا شَدِيدًا مِّن لَّدُنْهُ وَيُبَشِّرَ ٱلْمُؤْمِنِينَ ٱلَّذِينَ يَعْمَلُونَ ٱلصَّٰلِحَٰتِ أَنَّ لَهُمْ أَجْرًا حَسَنًا ﴿٢﴾ مَّٰكِثِينَ فِيهِ أَبَدًا ﴿٣﴾ ﴾ الكهف.



واتە: ستایش بۆ خوایەك، كە قورئانی ناردوە بۆ سەر بەندەی خۆی، وە هیچ لاریی و نارێكییەكی تێنەخستوە، ڕێك و ڕاستە (یان سەرپەرشتیارە)، بۆیەش ناردوویەتی تاكو خەڵكی لە كارەساتێكی گەورەو سامناك بترسێنێ، كە لە لایەن ئەو- خوا- ەوە دێتەدی (دیارە مەبەست پێی ڕۆژی دوایی و لێپرسینەوەو سزاو پاداشتە)، وە بۆ ئەوەش، كە موژدە بدات بەو كەسانەی ئیمانیان هێناوەو، كردەوە باشەكان ئەنجام دەدەن، كە پاداشتێكی زۆر باشیان هەیە، بە هەمیشەیی تێیدا دەمێننەوە (كە دیارە مەبەست پێی بەهەشتە).

شایانی باسیشە ئەو لاریی (عوج)یەی، كە خوا سبحانە وتعالی لە كتێبی خۆی دووری خستۆتەوە، هەموو جۆرە هەڵەو پەڵەو ناتەواوییەك دەگرێتەوە، چ پەیوەندی بە ڕواڵەتی قورئانەوە هەبێ، چ بە نێوەڕۆكییەوە.

وە وشەی (قَیِّم) بە مانای ڕێك و ڕاست و بێ گرێ و گۆڵ دێ، هەروەها بەمانای (سەرپەرشتیار و مشوورخۆر)یش دێ، هەروەها ئەو وشەیە بە (قِیَماً) یش خوێنراوەتەوە، كە مانای یەكەمی خوێندنەوە (قراءە)ی پێشوو دەگەیەنێ[1].

بەڵێ لێرەدا خوای پەروەردگار ستایشی خۆی دەكات، كە قورئانی ناردوە، كەواتە قورئان شتێكی زۆر بەرز و گەورەیە، خوا دەفەرموێ: ستایش بۆ من، كە قورئانم ناردۆتە خوارێ، دیارە گەورەیی و مەزنێتی و بەرزیی قورئانیش، ئەوە دەخوازێ، كە ئینسان لە بەرامبەریدا زۆر بە ئەدەب بێ و بە گەورەی بگرێ.

وە بەڵگەیەكی دیكە لە سەر پێویست بوونی بە گەورە گرتن و ڕێزلێگرتنی قورئان ئەوەیە، كە خوای بەخشەر لە سەرەتای سوورەتی (الرحمن)دا، كە سەرژمێری زۆرێك لە چاكە و نیعمەتەكانی تێدا كردوە، نیعمەتی فێركردنی قورئانی كردۆتە سەرڕشتەی سەرجەم نیعمەت و چاكەكانی و پێش هەموویانی خستوە؟! وەك دەفەرموێ:

﴿ٱلرَّحۡمَٰنُ ۝١ عَلَّمَ ٱلۡقُرۡءَانَ ۝٢ خَلَقَ ٱلۡإِنسَٰنَ ۝٣ عَلَّمَهُ ٱلۡبَيَانَ ۝٤﴾

---

(١) مختار الصحاح، ص ٤٨٣.

واته: (خوای ) خاوەنی بەزەیی. قورئانی فێری (مرۆڤ و جند) کردوه. مرۆڤی دروست کردوه. دەربڕین و قسەکردنی فێرکردوه.

پاشان خوای بەخشەر پاش خستنەڕووی ژمارەیەك لە چاکە و نیعمەتەکانی لەسەر مرۆڤ و جند، بۆ یەکەمجار ڕوویان تێدەکات و دەفەرموێ:

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ؟! ﴾ الرحمن: ١٣.

واته: بڕوا بە کام لە چاکەکانی پەروەردگارتان ناکەن و بە ڕاستی نازانن؟!
واته: کام لە چاکە و نیعمەتەکانی خوا هەیە، کە بتوانن پاڵی دەنە لای جگەلە خوای پەروەردگار، وە چ نیعمەتێکی خوا هەیە، کە بتوانن نکوڵیی لێ بکەن؟!.
شایانی باسە ئەم ڕستەیە:

﴿ فَبِأَيِّ ءَالَآءِ رَبِّكُمَا تُكَذِّبَانِ؟! ﴾

(سی و یەك) جار دووبارە بۆتەوە، (١٥) جاریان لەکاتی باس کردنی نیعمەتەکانی دنیادا، بەڕووداوەکانی قیامەتیشەوە، (١٦) جارانیش لەکاتی باس کردنی نیعمەتەکانی دواڕۆژدا، کەنیعمەتەکانی بەهەشتن، ئنجا سەرەتای هەموو نیعمەتەکانی چی باسی کردوە؟! دوای ئەوەی، کە خۆی ناساندوە، بەوە، کە خاوەنی ئەو پەڕی بەزەییە و خاوەنی ئەوپەڕی بەخشندەییە، ئەوەی بەر لەهەر شتێك باس کردوە، کە کە قورئانی فێری ئینسان و جند کردوە: (عَلَّمَ ٱلْقُرْءَانَ )! دیارە جێی سەرنجە، کە خوای کاربەجێ فێرکردنی قورئانی پێش دروستکردنی ئینسانیش خستوە، چونکە دوای ئەوە فەرموویەتی: ( خَلَقَ ٱلْإِنسَـٰنَ ،عَلَّمَهُ ٱلْبَيَانَ ) واته: ئینسانی دروستکردووەو ڕوونکردنەوەی مەبەستەکانی خۆی فێرکردوە. (بیان)یش ئەوەیە، کە ئینسان بتوانێ تەعبیر لەوە بکات، کە لە دڵی دایە، لە ڕێی قسە یان نووسین، یان هەر شێوازێکی دیکەی دەربڕینەوە.

**لێرەدا بۆمان هەیە بپرسین:** بۆچی خوای بەخشەر فێرکردنی قورئانی لەلایەن خۆیەوە بۆ ئینسان و جند، پێش هەموو نیعمەتەکانی خستوە؟!، چونکە لە ڕاستی دا بەبێ ئیمان و شارەزایی لە قورئان، ئینسان و جند لەسەر ئەسڵی دروستکرانی خۆشیان قەرزدار دەبنەوە و، کەسێك لە نیعمەتی قورئان بەهرەمەند



نەبێت، لەسەر ئەسڵی بوونەکەیشی، کە گەورەترین و بنەڕەتیی ترینی هەموو نیعمەتەکانە، قەرزدار دەبێتەوە، چ جای نیعمەتەکانی دی، وەك خوا دەفەرموێ:

﴿..وَتَرَى ٱلظَّٰلِمِينَ لَمَّا رَأَوُاْ ٱلۡعَذَابَ يَقُولُونَ هَلۡ إِلَىٰ مَرَدّٖ مِّن سَبِيلٖ ﴿٤٤﴾ وَتَرَىٰهُمۡ يُعۡرَضُونَ عَلَيۡهَا خَٰشِعِينَ مِنَ ٱلذُّلِّ يَنظُرُونَ مِن طَرۡفٍ خَفِيّٖۗ وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِۗ أَلَآ إِنَّ ٱلظَّٰلِمِينَ فِي عَذَابٖ مُّقِيمٖ ﴿٤٥﴾﴾ الشورى.

لێرەدا خوای پەروەردگار دیمەنی کافرەکان لە ڕۆژی دوایی دا دەخاتە بەرچاو و دەفەرموێ: تۆ کافرە ستەمکارەکان دەبینی لە ڕۆژی دواییدا کاتێك، کە ئازارو ئەشکەنجەی خوا دەبینن دەڵێن: هیچ ڕێیەك نیە و، ناتوانین بگەڕێینەوە بۆ دنیا و جارێکی دی تاقی کردنەوە بدەین و خوا تاقیمان بکاتەوە، (داخۆ ئەو جارە چ بەندەیەك دەبین و، چۆن فەرمانبەری خوا دەبین و، پابەند دەبین بە شەریعەتی خواوە!)، دەبینی کافرەکان، کە ڕادەنوێنرێن لەسەر ئاگری دۆزەخ، زۆر ملکەچ و زەلیل و بێ دەسەڵاتن، بە سیلە چاوێك سەیر دەکەن، (واتە: بە چاوێکی کز تەماشا دەکەن، ئینسان، کە ترسێك دەبینێ، ناوێرێ زۆر چاوی تێ ببڕێ و بەچاوێکی کز سەیری دەکات)، جا لێرەدا شوێنی مەبەست (بیت القصيد) ئەوەیە، کە دەفەرموێ: (وَقَالَ ٱلَّذِينَ ءَامَنُوٓاْ) وە ئەوانەی بڕوایان هێناوە، گوتیان: (إِنَّ ٱلۡخَٰسِرِينَ ٱلَّذِينَ خَسِرُوٓاْ أَنفُسَهُمۡ وَأَهۡلِيهِمۡ يَوۡمَ ٱلۡقِيَٰمَةِ)، واتە: بێگومان زیانباران تەنها ئەو کەسانەن خۆیان و کەس و کاریان لە دەست چووە لە ڕۆژی دواییدا، (چونکە کابرای کافر خۆی لەدەست چووە، واتە: لەسەر ژینەکەی خۆی و لەسەر دروستکرانەکەشی قەرزدار بۆتەوەو، سەربارەش کەس و کاریشی لەدەست دەچێ، چونکە ئەگەر کەس و کارەکەی کافر بن، ئەوە دیارە لەیەك دا دەبڕێن و، ئەگەر مسوڵمانیش بن، دیسان هەر لەیەك دادەبڕێن، ئەگەر کافر بن، هەریەکە لە جێی تایبەتی خۆیدا سجنە و، کەس لەگەڵ ماڵ و خێزانی خۆی نابێ، وە ئەگەر کەس و کارەکەی مسوڵمان بن، ئەوە دەچنە بەهەشت و یەکجاریی لەیەك دەترازێن!).



به‌ڵام بابای مسوڵمان خۆی و ماڵ و خێزان و وه‌چه و منداڵ و دایك و بابی و خزم و كه‌سی بۆ كۆ ده‌كرێته‌وه‌، بۆ ئه‌وه‌ی، كه زیاتر دڵی خۆش بێ، وه‌ك خوا فه‌رموویه‌تی:

﴿ وَٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ وَٱتَّبَعَتۡهُمۡ ذُرِّيَّتُهُم بِإِيمَٰنٍ أَلۡحَقۡنَا بِهِمۡ ذُرِّيَّتَهُمۡ .. ﴾ الطور: ٢١.

واته: وه ئه‌وانه‌ی ئیمانیان هه‌بووه و وه‌چه‌كه‌یشیان به ئیمانه‌وه شوێنیان كه‌وتوون، وه‌چه‌كه‌یانیان پێده‌گه‌یه‌نین..

ئنجا ده‌فه‌رمویٚ: ئه‌هلی ئیمان له‌و ڕۆژه‌دا ده‌ڵێن: خه‌ساره‌تمه‌ندانی ڕاسته‌قینه ئه‌و كه‌سانه‌ن، كه خۆیان و كه‌س و كاری خۆیانیان له‌ده‌ست داوه‌، له ڕۆژی دوایی دا. مه‌به‌ستمان ئه‌وه‌یه‌، كه خوای په‌روه‌ردگار بۆیه نیعمه‌تی فێركردنی قورئانی پێش هه‌موو نیعمه‌ته‌كانی دی خستوه‌، له سووره‌تی (الرحمن)دا، كه سووره‌تی باسكردنی نیعمه‌ته‌كانی خوایه‌، چونكه به‌بێ به‌هره‌مه‌ند بوون له نیعمه‌تی قورئان، كه به‌هۆیه‌وه ئینسان له ئیمان حاڵی ده‌بێ و، ئیمان دێنێ و هیدایه‌ت وه‌رده‌گرێ، به‌بێ ئه‌و نیعمه‌ته‌، ئینسان له‌سه‌ر هه‌موو نیعمه‌ته‌كانی دیكه قه‌رزدار ده‌بێته‌وه‌: ماڵ و سامان بێ، له‌ش ساغیی بێ، ده‌سه‌ڵات بێ، ده‌وڵه‌مه‌ندیی بێ، هه‌رشتێك بێ، به‌ڵكو هه‌ر له‌سه‌ر ئه‌سڵی بوونه‌كه‌یشی قه‌رزدار ده‌بێته‌وه‌، واته: هه‌ر نه‌بووایه باشتر بوو، بۆیه خوای كاربه‌جێ باسی ئینسانی كافر ده‌كا و ده‌فه‌رموێ:

﴿ .. وَيَقُولُ ٱلۡكَافِرُ يَٰلَيۡتَنِي كُنتُ تُرَٰبَۢا ﴿٤٠﴾ ﴾ النبأ.

واته: وه كافر ده‌ڵێ خۆزگه گڵ بوومایه‌، واته خۆزگه ده‌خوازێ، كه ببێته گڵ و، خۆزگه ده‌خوازێ، كه وه‌ك ئاژه‌ڵ و ماڵات چۆن دوای ئه‌وه‌ی حه‌شر و حیسابیان له‌گه‌ڵ ده‌كرێ، ده‌بنه‌وه به خاك و خۆڵ و سزاو پاداشتیان نیه‌، ئه‌ویش خۆزگه به چوار پێیان ده‌خوازێ، به‌ڵام دیاره ئه‌و خۆزگه‌یه‌شی بۆ نایه‌ته دی؟!

## چەند وەسفێكی گرنگی كتێبی خوا

### بەڕێـــزان !

خوای پەروەردگار باسی كتێبی بەڕێزو بەپێزی خۆی دەكات بە چەند وەسفێك، هەر كام لەو وەسفانە ئەوە دەخوازن، كە ئێمە لەگەڵ كتێبی خوادا بە ئەدەب بین و بە گەورەی بگرین:

١- یەكێك لەو وەسفانەی، كە خوای پەروەردگار بۆ كتێبی خۆی بەكاری هێناون، بریتیە لە مەزنیی (العظمة) وەك فەرموویەتی:

﴿ وَلَقَدْ ءَاتَيْنَـٰكَ سَبْعًا مِّنَ ٱلْمَثَانِى وَٱلْقُرْءَانَ ٱلْعَظِيمَ ﴿٨٧﴾ ﴾ الحجر.

واتە: وە ئێمە حەوت لەوانەی، كە دووبارە دەكرێنەوە، وە قورئانی مەزنمان بەتۆ بەخشیوە (ئەی (محمد) علیه الصلاة والسلام!)، ئەو حەوت دووبارەكراوانەش زۆربەی زانایان دەڵێن: مەبەستی پێ حەوت ئایەتی سوورەتی (الفاتحة)یە، كە نوێژكەران دووبارەی دەكەنەوە.

٢- وە خوای تاك و پاك قورئانی بە: (كریم) ناوهێناوە:

﴿ إِنَّهُۥ لَقُرْءَانٌ كَرِيمٌ ﴿٧٧﴾ ﴾ الواقعة.

(كریم)یش هەم بەواتای بەڕێز دێ، هەم بەواتای بەخشەر دێ[1]، دەڵێن: فڵان كەس (كەریم)ە، واتە:بەڕێز و بە حورمەتە، وە بەخشندەیە و دەبەخشێ و سەخییە، دیارە قورئانیش هەم بەڕێز و هەم بەخشندەیە.. جا چ فەرمایشتێك لە فەرمایشتی خوا بەڕێزترە؛ وە قورئان بەخشندەیە و، هەركەسێك بەڕاستی ڕوو

---

(١) مختار الصحاح، ص ٤٩٢.



له قورئان بكات و تێی بگات، قورئان هەموو خێرو چاكەیەكی پێ دەبەخشێ، شارەزایی پێدەبەخشێ، مەعریفەتی پێ دەبەخشێ، ئیمانی پێ دەبەخشێ، هیدایەتی پێ دەبەخشێ، ئەدەبی پێ دەبەخشێ، ئەخلاقی پێ دەبەخشێ، عیززەت و حیكمەت و هەرچی خێرو چاكەیە له دنیاو قیامەتدا، قورئان پێی دەبەخشێ.

**٣-٤-** وه خوای زانا و توانا قورئانی خۆی به بەرزیی و به حیكمەت، وەسف كردوه، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَإِنَّهُۥ فِىٓ أُمِّ ٱلْكِتَٰبِ لَدَيْنَا لَعَلِىٌّ حَكِيمٌ ﴿٤﴾ ﴾ الزخرف.

واته: ئەم قورئانه له لای ئێمه، له كتێبی بنەڕەتیی (لوح المحفوظ)دا، هەم بەرزه و هەم كاربەجێیه.

**٥-** هەروەها خوای بەبەزەیی قورئانی به زاڵ (عزیز) وەسف كردوه:

﴿ ..وَإِنَّهُۥ لَكِتَٰبٌ عَزِيزٌ ﴿٤١﴾ لَّا يَأْتِيهِ ٱلْبَٰطِلُ مِنۢ بَيْنِ يَدَيْهِ وَلَا مِنْ خَلْفِهِۦ ۖ تَنزِيلٌ مِّنْ حَكِيمٍ حَمِيدٍ ﴿٤٢﴾ ﴾ فصلت.

واته: وه ئەم قورئانه كتێبێكی بالادەست و زاڵه. هەڵەو ناهەقیی له هیچ لایەكییەوه ڕێی تێ نابات. نێرراوەخواری خوایەكی كاربەجێی ستایشكراوه. بەڵێ، قورئان كتێبێكی بالادەست و زاڵه، هیچ كەس و بەرنامەیەك نیه، كه له بەرامبەر قورئاندا بوەستێ و موونافەسەی بكات، یان كێبەركێی لەگەڵدا بكات!

هەروەها به گەلێك وەسفی دیكه خوای پەروەردگار وەسفی كتێبی خۆی كردوه، ئنجا ئایا ئەمه چی لێ وەردەگیرێ؟! له وەڵام دا دەڵێین: قورئانێك خوا بفەرموێ: (عظیم)و، (كریم)و، (علي)و، (حكیم)و، (عزیز)ه.

**یەكەم:** پێویسته مرۆڤ ئیمانی بەو كتێبه مەزن و بەڕێز و بەرز و...هتده هەبێ و ئەو پەڕی ڕێزو ئەدەب و حورمەتی بەرانبەر بنوێنێ، ئەوه لەلایەك.

**دووەم:** لەلایەكی دیكەشەوه: دەبێ بزانێ هەر كاتێك بەڕاستی ئیمانی به قورئان بوو و، بەو شێوەیه مامەڵەی لەگەڵدا كرد، كه خوا فەرموویەتی، ئەوه ئەو قورئانه، مەزنیی پێ دەبەخشێ و، عیززەتی پێ دەبەخشێ و، حورمەت و ڕێزی





پێ دەبەخشێ و، حیكمەت و بەرزیی پێ دەبەخشێ، وە بەهرەمەندی دەكا لەو وەسفانەی خۆی، چونكە ئەگەر لەگەڵ ئینسانی بەڕێزدا بەرێ دا بڕۆی، ڕێز پەیدا دەكەی، وە ئەگەر لەگەڵ بابای زانادا مامەڵە بكەی، زانیاریی وەدەست دەخەی و، وە ئەگەر لەگەڵ ئینسانی باش بیت، باشییت بۆ دێ و، لەگەڵ ئینسانی خراپ بی، خراپییت بۆ دێ، وەك پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) لە فەرمایشتێكی دا فەرموویەتی:

(إنّما مَثلُ الجليس الصالح والجليس السوء، كحامل المسك ونافخ الكير...) متفق عليه [1].

واتە: وێنەی هاوەڵی چاك و هاوەڵی خراپ، وەك هەڵگری میسك و كوورەچیی، وایە، بابای عەتر فرۆش یان لێی دەكڕی، یان دەتداتێ، وە ئەگەر نەشتداتێ بۆنی خۆشی ئەوت بۆ دێ، بەڵام كابرای ئاسنگەر و كوورەچیی هەر لێی نزیك بیەوە، ئەگەر بەرگ و پۆشاكیشت نەسووتێنێ، بۆنی ناخۆشی لێ دەكەی.

كەواتە: كەسێك لەگەڵ قورئاندا ببێتە هاوەڵ و لێی نزیك بێ، بێگومان سیفەت و شوێنەوارەكانی قورئانی تێدا دەردەكەون، بەمەرجێك بەڕاستیی لەگەڵ قورئاندا هاودەنگ بێ.

بەڵێ: ئەدەب نواندن لەگەڵ قورئان دا و، بەگەورە و بەرز و پیرۆز گرتنی، بێگومان وا لە ئینسان دەكا، كە سیفەتەكانی قورئانی تێدا بێنە دی، لە مەزنیی و بەرزیی و عیززەت و حیكمەت و كەرەم و ڕێز و...هتد، وە بەڕاستی بە درێژایی مێژووش ئەوانەی، كە لەگەڵ قورئاندا بە ڕاستی ئەدەبیان هەبووەو، بە گەورەیان گرتوە و لەگەڵی دا هاوەڵ و هاودەم بوون، ئەو سیفەتانەیان لە قورئان وەرگرتوە، دیارە هەر كەسە لە قەدەر خۆی.

هاوەڵانی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) خوا لێیان ڕازی بێ، تەماشا دەكەی پێش ئیسلام و قورئان، لەوپەڕی نەزانین و نەخوێندەواریی دابوون، بەڵام بەهۆی هاوەڵیی و هاودەمییان لەگەڵ قورئاندا، بوون بە مامۆستای

---

(١) البخاري برقم: ٥٥٣٤، ومسلم برقم: ٢٦٢٨.

مرۆڤایەتیی، لە زانست و شارەزایی دا، وە لەوپەڕی بێ سەرو بەریی سیاسیی و ئابووریی و کۆمەڵایەتییەوە، بوونە سەرقافڵەی مرۆڤایەتی لە دەوڵەتداریی و چاکەکاریی و دادگەریی و پاکیی و چاکیی و ڕەوشت بەرزیی و، لە هەموو شتێکی باشدا، وە گەلی عەرەب بە گشتی بەر لە ئیسلام و قورئان، لە هەموو میللەتان دواکەوتووتر و بێ سەروبەرتر بوون، بەڵام دوایی مرۆڤایەتیی هەموو شتێکی چاك لەوان فێر دەبوون، بۆچی؟! چونکە مامۆستایان قورئان بوو، وە سەرجەم سیفەتە بەرزەکانیان لە قورئانەوە بەدەست هێنا بوون !

## لە کۆتایی ئەم دەرسەشماندا دەڵێین:

یەکەمین هەنگاوی هەڵس وکەوتی ڕاست و دروست لەگەڵ قورئاندا، ئەوەیە، کە دەبێ لەگەڵی دا بە ئەدەب بین و، بە بەرزو گەورەی بگرین، کاتێکیش، کە لەگەڵ کتێبی خوادا بە ئەدەب دەبین و بە گەورەی دەگرین، ئەوە بێگومان ئەو وەسفانەی قورئان، کە خوای پەروەردگار کتێبی خۆی پێ مەدح کردوون، کەم و زۆر، بە ئەندازەی ئیمانمان و، بە ئەندازەی ئەدەب نواندنمان و، ڕێز لە قورئان گرتنمان و، بە گەورە گرتنی و، تەفاعول لەگەڵدا کردنیمان، لە ئێمەدا ڕەنگ دەدەنەوە.

خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە بەڕاستی ئەدەب دەنوێنن لەگەڵ کتێبی خوادا و، لەگەڵی دا بەڕێز دەبن و، بە گەورەی دەگرن و، بەو شێوەیە هەڵسو کەوتی لەگەڵدا دەکەن، کە بۆ کتێبی خوا، بۆ فەرمایشتی بەرز و پیرۆزی خوای پەروەردگار شایستەیە، تاکو هەرچی زیاترو چاکتر لێی سوودمەند و بەهرەمەند بین.

وصلى الله على محمد و على آله وصحبه أجمعين

والحمد لله رب العالمين



وانەی دووەم

## هەنگاوی دووەم:

# خوێندنەوە و گوێ بۆ گرتن

## (التلاوة والإستماع)

بەڕێـــزان!

لەوانەی یەکەمدا باسمان کرد، کە بۆ هەڵس و کەوت کردنی ڕاست و دروست لەگەڵ قورئان دا، بۆ ئەوەی باشتر لێی بەهرەمەند بین، یەکەمین هەنگاو و قۆناغ، بریتیە لە: (ئەدەب نواندن و بە گەورە گرتنی کتێبی خوای پەروەردگار). بەڵێ یەکەمین هەنگاو و قۆناغ بۆ هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ قورئاندا - هەڵس و کەوت کردنێکی ڕاست و شەرعییانە- ئەوەیە، کە ئینسان ئەو کتێبەی خوای پەروەردگار، کە فەرمایشتی خوایە، بە گەورەی بگرێ و ئەدەب و ڕێزو حورمەتی پێویستی لەگەڵدا بنوێنێ.

ئێستاش باسی هەنگاوی دووەم دەکەین، کە بریتیە لە: (خوێندنەوە و گوێ بۆ گرتن).

یەکەمین شتێك، کە ئینسان دەیکات، دوای ئەوەی، کە بڕوای هێنا، کە ئەو قورئانە کتێبی خوایە (سبحانه و تعالى) و بە (جبريل) دا (عليه السلام) بۆ پێغەمبەری کۆتایی خۆی(محمد) (عليه الصلاة والسلام) ناردوویەتی، وە دوای ئەوەی، کە ئەدەب و بە گەورەو بەرزگرتن و، ڕێزی شایستەو پێویستی لە بەرانبەردا دەنوێنێ، بریتیە لە (خوێندنەوەی) یاخود (گوێ لێگرتنی)، دیارە



خوای کاربەجێ بۆیە فەرمایشتی خۆی بۆ ئێمە ناردوە، تاکو لێی تێ بگەین و کاری پێ بکەین و، بەدڵنیاییشەوە، ئینسان نە لە فەرمایشتی خوای پەروەردگار و نە لە قسەی هیچ کەسی دیکەش، ناتوانێ تێبگاو پاشان کاری پێ بکا، هەتا نەیخوێنێتەوە، یان بەسەری دا نەخوێندرێتەوە، هەر بۆیەش خوای بەرز و مەزن لە قورئاندا، فەرمانی کردوە بە خوێندنەوەی قورئان، وە بە گوێ لێ گرتنی خوێندرانەوەشی.

ئنجا ئێمە سەرەتا چەند ئایەتێکی خوای بێ وێنە، وە چەند فەرمایشتێکی پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) دێنینەوەو باس دەکەین، کە فەرمانیان کردوە بە خوێندنەوەی قورئان، یان گوێ بۆ گرتنی و، پاشان چەند خاڵێکی گرنگ لەو بارەوە، کە لەو ئایەت و فەرمایشتانە دەفامرێنەوە، دەخەینەڕوو:

## چەند ئایەتێك لەبارەی خوێندنەوەو گوێ لێگرتنی قورئانەوە:

١- خوای بەخشندە لە سوورەتی (الكهف)دا فەرموویەتی:

﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلۡتَحَدٗا ﴿٢٧﴾ ﴾.

دیارە خوای بێ هاوتا لێرەدا ڕاستەوخۆ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) دەدوێنێ و فەرمانی پێ دەکا، کە کتێبی خوا بخوێنێتەوە، بەڵام زانایان وەك بنچینەیەکی شەرعیی لەسەری ڕێککەوتوون، کە هەموو دواندنەکانی خوا عزوجل لە قورئاندا بۆ پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، بریتین لە دواندن بۆ ئوممەتەکەیشی، وە ئەگەر دواندنێك تایبەت کرابێ بە پێغەمبەرەوە (علیه الصلاة والسلام) بە بەڵگەیەکی تایبەت، ئەگەرنا هەرچی خوای پەروەردگار ئاڕاستەی (محمد)ی کردوە، ئاڕاستەی ئوممەتەکەیشی کردوە لە دوای ئەوەوە.

ئنجا لێرەدا، کە دەفەرموێ: ﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ.. ﴾، ئەوە بێگومان وەك چۆن لەگەڵ (محمد)یەتی (علیه الصلاة والسلام)، لەگەڵ ئوممەتەکەشیەتی، چونکە خوا سبحانه وتعالی هیچ پێغەمبەرێکی نەناردوە،

مەگەر بۆ ئەوەی پەیڕەویی لێ بکرێ:

﴿ وَمَآ أَرْسَلْنَا مِن رَّسُولٍ إِلَّا لِيُطَاعَ بِإِذْنِ ٱللَّهِ ۚ .. ﴾ النساء: ٦٤.

واتە: هیچ پێغەمبەرێکمان نەناردوە، مەگەر بۆ ئەوەی فەرمانبەریی لێ بکرێ و، بە فەرمانی خوا گوێڕایەڵیی بۆ بکرێ. هەروەها خوای بێ هاوەڵ دەفەرموێ:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾ الأحزاب.

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا بۆ ئێوە سەرمەشقییەکی باش هەیە، بۆ هەر کەسێ بە ئومێدی خوا، (واتە ئومێدی ڕەحمەت و بەزەیی خوا) و دوارۆژ بێ، وە زۆر یادی خوا بکا. واتە: هەرکەسێ، کە ئیمانی هەبێ و مسوڵمان بێ، موحەممەد (علیە الصلاة والسلام) سەرمەشق و پێشڕەویەتی، وە مامۆستا و چاوساغیەتی، لەبەر ئەوە وەك بنچینەیەك با لە مێشکماندا بچەسپێ، کە هەرچی خوا لەسەر پێغەمبەری خۆی فەرزی، کردوە لە قورئان و لە سوننەتدا، ئۆممەتەکەیشی پێی مولزەمە و دەبێ پابەندی بێ، مەگەر شتێك تایبەت کرابێ بە پێغەمبەرەوە (علیە الصلاة والسلام) بە بەڵگە و نیشانەیەکی دیارییکراو و ڕوون.

بەڵێ خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ ۖ لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَٰتِهِۦ وَلَن تَجِدَ مِن دُونِهِۦ مُلْتَحَدًا ﴿٢٧﴾ ﴾ الكهف.

واتە: وە ئەوەی، کە بۆت ڕەوانە کراوە لە کتێبی پەروەردگارت، بیخوێنەوە، بێگومان بە هیچ جۆرێك گۆڕین و دەستکاریی کردن بۆ وشەکانی نیە، وە جگە لەویش پەنایەکی دیکەت نیە.



٢- هەروەها خوای زاناو کاربەجێ له ئایەتی ژماره (٤٥)ی (العنكبوت) دا فەرمان به پێغەمبەرەکەی (عليه الصلاة والسلام) و، له پشت ئەویشەوه به تێکڕای ئۆممەتەکەی دەکات و دەفەرموێ:

﴿ ٱتْلُ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ .. ﴾

واته: ئەوەی، که له کتێب بۆت ڕەوانەکراوه بیخوێنەوه. دیاره ئەلیف لامی سەر (الكتاب) ئەلیف و لامی (عهد)ه، واته: ئەو کتێبەی، که زانراو و، (معهود)ه، که قورئانه.

٣- وه له سوورەتی (المزمل)دا دیسان خوای بەرز و مەزن فەرمان به پێغەمبەری پێشەوامان دەکات، که قورئان بخوێنێ و دەفەرموێ:

﴿ وَرَتِّلِ ٱلْقُرْءَانَ تَرْتِيلًا ﴿٤﴾ ﴾

واته: قورئان بخوێنەوه به خوێندنەوەیەکی ڕوون و چاك و پوخت. دوایی باسی ماناو چەمکی وشەی (ترتيل) دەکەین.

٤- وه له ئایەتی (٩٨)ی سوورەتی (النحل)یشدا، خوای باڵادەست فەرمان به پێغەمبەری خۆی دەکات و دەفەرموێ:

﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾

واته: وه کاتێك قورئانت خوێند، پەنا بگره به خوا له شەیتانی دوور خراوه له ڕەحمەتی خوا. (رجيم) یانی: (مرجوم)، کەسێک، که دوورخراوەتەوه و نەفرەتی لێ کراوه، سوننەته ئینسان بڵێ: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) پێش ئەوەی، که قورئان بخوێنێ، وەك دوایی باسی دەکەین.

٥- وه له ئایەتی (٢٠٤)ی سوورەتی (الأعراف)دا دەفەرموێ:

﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾

واته: هەرکاتێ قورئان خوێنرایەوه، گوێ بگرن و بێدەنگ بن، بەڵکو ڕەحمتان پێ بکرێ و به زەییتان لەگەڵدا بنوێنرێ.



## چەند فەرموودەیەك لەبارەی قورئان خوێندنەوە:

پێغەمبەری خواش (علیه الصلاة والسلام) فەرمایشتی زۆرن، دەربارەی قورئان خوێندن و گەورەیی قورئان خوێندن، یان گوێ بۆ گرتنی:

١- یەكێك لەو فەرمایشتانە ئەوەیە، كە (الترمذي) لە عەبدوڵڵای كوڕی مەسعوودەوە خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە، كە پێغەمبەری خوا (صلی الله علیه وسلم) فەرموویەتی[١]:

{ مَن قَرَأَ حَرفاً مِن كتابِ اللهِ فَلَهُ بِهِ حَسَنة وَالحَسَنةُ بِعَشرِ أَمثالِها، لا أَقولُ (ألم) حَرفٌ، وَلكِن (ألف) حَرفٌ و (لام) حَرفٌ و(میم) حَرفٌ }.

واتە: هەركەسێك پیتێك لە كتێبی خوا بخوێنێتەوە، چاكەیەكی بۆ دەنووسرێ، وە چاكەش یەك بە دەیە، ناڵێم (ألم) هەمووی پیتێكە، بەڵكو ئەلیف (أ) پیتێكە، لام (ل) پیتێكەو، میم (م) پیتێكە.

بەڵێ هەر پیتێك لە كتێبی خوا بخوێنرێتەوە، چاكەیەك هەیە، چاكەش یەك بە دەیە، تاكو یەك بە حەوت سەدیش دەڕوا، وەك لە ئایەتی (٢٦١)ی سوورەتی (البقرة)دا لە بارەی ماڵ بەخشین (إنفاق)ەوە، خوای بەخشندە دەیگەیەنێتە یەك بە حەوت سەد:

﴿ مَّثَلُ ٱلَّذِينَ يُنفِقُونَ أَمْوَٰلَهُمْ فِي سَبِيلِ ٱللَّهِ كَمَثَلِ حَبَّةٍ أَنۢبَتَتْ سَبْعَ سَنَابِلَ فِي كُلِّ سُنۢبُلَةٍ مِّاْئَةُ حَبَّةٍ ﴾

واتە: وێنەی ئەوانەی لەڕێی خوادا ماڵ و سامانی خۆیان دەبەخشن، وەك دەنكە تۆوێك وایە، كە حەوت گوڵان دەردەكات، هەر گوڵەی سەد دەنكی تێدایە...

٢- وە فەرموودەیەكی دیكەش، كە (بخاري) و (مسلم) لە دایكی بڕواداران (عائیشە)ەوە خوای لێی ڕازی بێ دەیگێڕنەوە، پێغەمبەر (صلی الله علیه

---

(١) رواه الترمذي و قال: حديث حسن صحيح.

وسلم) تێیدا دەفەرموێ[1]:

( الماهِرُ بالقُرآن مَعَ السَّفَرَةِ الكِرامِ البَرَرَة، والذي يَقرأُ القُرآنَ وَيَتَتَعتَعُ فيه وَهوَ عَليهِ شَاقٌّ لَهُ أجران).

واتە: کەسێك شارەزا بێ لە خوێندنی قورئاندا، ئەوە لەگەڵ ئەو فریشتانە دایە، کە نوێنەری خوان، کە زۆر بەڕێز و چاکەکارن، (سَفَرة) کۆی (سفیر)ە، کە بەمانای نوێنەر دێ، وە (کرام) کۆی (کریم) واتە: بەڕێز، وە (بَرَرة)یش کۆی (برّ)ە، واتە: چاکەکار..

بەڵێ وەك پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕایگەیاندوە: کەسێك لە قورئان شارەزا بێ، لە خوێندنی و تێگەیشتنی شارەزابێ، ئەوە لە ڕیزی ئەو فریشتانە دایە، کە (وحي)یان بۆ پێغەمبەران هێناوە، ئەدی کەسێك، کە تێیدا کارامە و شارەزا نەبێ؟

(والذي يَقرأُ القُرآنَ وَيَتَتَعتَعُ فيه وَهوَ عَليهِ شَاقٌّ لَهُ أجران).

وەکەسێك قورئان بخوێنێ، بەڵام لەسەری قورس بێ و بە زەحمەت بۆی بێ، یان هەڵە بکاو بگەڕێتەوە، بەبێ ئەوەی، کە هەڵەکە بە دەست خۆی بێ، واتە: هەر ئەوەندەی لێ بزانێ و بە زەحمەت بۆی بخوێنرێ، ئەوە ئەو کەسە دوو جۆرە پاداشتی هەیە، پاداشتی خوێندنەوەکەو، پاداشتی ناڕەحەتییەکە، کە دێتە ڕێی.

کەواتە: هەرچۆنێك بێ، قورئان خوێندن پاداشتی هەر هەیە، دیارە بە پێی توانا بابای مسوڵمان دەبێ هەوڵبدات قورئانەکەی بەو شێوەیە بخوێنێ، کە خوای زانا فەرموویەتی و پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فێری کردووین و، بنچینەکانی چاکخوێندن (تجوید)ی تێدا ڕەچاو بکات، بەڵام لەبەرئەوەی، چاك نازانێ بیخوێنێ، نابێ دەستی لێ هەڵگرێ و، ئەم فەرموودەیە بەڕاشکاویی پێی دەڵێ:، کە هەر چۆن بێ، هەر خوێندنی باشترە، چونکە ئەگەر ئینسان بەهەڵەش بیخوێنێ و خراپیش بیخوێنێ، بەڵام وردە وردە بیخوێنێ، هەر چاکی دەکات، بەڵام لەبەرئەوەی، بە هەڵە دەیخوێنێ، وازی لێ بێنێ، هەرگیز فێرنابێ.

---

(١) بڕوانە: صحيح البخاري رقم (٤٩٣٧)، وصحيح مسلم رقم (٧٩٨).

**٣-** هەروەها (عقبة بن عامر) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە، کە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) ڕووبەڕوو بە هاوەڵەکانی فەرموویەتی:

( أَيُّكُم يُحِبُّ أن يَغدوَ إلى بُطحَانَ أَو إلى العَقيقِ فَيَأتِيَ مِنهُ بِنَاقَتَينِ كَومَاوَينِ فِي غَيرِ إثمٍ ولا قَطيعَةِ رَحِمٍ ؟! فقلنا: يا رسولَ الله كُلُّنا نُحِبُّ ذلك، قال: أَفَلا يَغدو أَحَدُكُم إلى المَسجِدِ فَيَعلَمَ أو يقرأَ آيتينِ من كتابِ اللهِ عزَّوجلَّ خيرٌ له مِن ناقتين، وثلاثٌ خير له من ثلاث، وأربعٌ خير له من أربع، ومن أعدادهن من الإبل) رواه مسلم برقم: ٨٠٣.

واتە: کامەتان حەزدەکات هەموو ڕۆژێك زوو بچێ بۆ (بوطحان) یان (عەقیق) و دوو حوشتری دونگدار بێنێ، بێئەوەی گوناه بێت و پچڕاندنی خزمایەتیی تێدا بێ؟ گوتمان: هەموومان حەزدەکەین ئەی پێغەمبەری خوا! فەرمووی: ئەدی بۆچی یەکێکتان ناچێتە مزگەوتێ و دوو ئایەتان لە کتێبی خوا عز وجل بزانێ یان بخوێنێ، بۆی چاکترە لە دوو حوشتر، سیانیش لە سێیان و، چواریش لە چواران و، زیاتریش لە ژمارەی خۆیان لە حوشتران، زیاتر.

**٤-** هەروەها (أبو أمامه الباهلي) خوا لێی ڕازی بێ گێڕاویەتەوە، کە گوێی لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بووە فەرموویەتی:

(إقرأوا القرآن فإنه يأتي يوم القيامة شفيعاً لأصحابه...) رواه مسلم برقم: ٨٠٤.

واتە: قورئان بخوێنن، چونکە ڕۆژی هەڵسانەوە تکا بۆ هاوەڵەکانی دەکات.

**٥-** وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(يقول الله سبحانه وتعالى: من شغله القرآن وذكري عن مسألتي، أعطيته أفضل ما أعطي السائلين، وفضل كلام الله سبحانه على سائر الكلام، كفضل الله تعالى على خلقه) رواه الترمذي وقال حديث حسن.

واتە: خوا سبحانە وتعالی دەفەرموێ: هەر کەسێك لەبەر قورئان و یادی من نەیپەرژێتە سەر داوالێکردنم،چاکتر لەوەی دەدەمێ، کە دەیدەمە داواکەران، وە



پلەو گەورەیی فەرمایشتی خوا، بەسەر قسەی دیکەدا، وەك پلەو گەورەیی خوای بەرزە بەسەر دروستکراوەکانی دا.

٦- هەروەها پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) فەرموویەتی:

(يقال لصاحب القرآن: إقرأ وارتق ورتِّلْ كما كنت ترتل في الدنيا، فإن منزلتك عند آخر آية تقرؤها) رواه أبوداود والترمذي والنسائي، وصححه الترمذي.

واتە: بە خاوەنی قورئان دەگوترێ، بخوێنە و بەرز بەوە و بەرێکیی بیخوێنە، وەك چۆن لە دنیادا دەتخوێند، چونکە پلەت لەلای کۆتا ئایەتە، کە دەیخوێنی.

## چوار مەسەلەکە لەم ئایەت و فەرموودانە وەردەگیرێن:

ئنجا لە ئایەتە بەپێزەکانی خوای پەروەردگار و فەرمایشتە شیرینەکانی پێغەمبەری پێشەوادا (علیه الصلاة والسلام)، چەند شتێکمان دەستگیر دەبن، کە ئێمە لەم چوار خاڵەدا کورتیان دەکەینەوە:

### ١- قورئان خوێندن لەسەر ئینسانی مسوڵمان فەرزە:

مسوڵمان وەك چۆن نوێژی لەسەر فەرزەو، ڕۆژووی لەسەر فەرزە، قورئان خوێندنیشی لەسەر فەرزە، وە وێڕای ئەو ئایەتانەی هێنامانەوە،ئەم ڕستە قورئانییەش بەڵگەیە لەو بارەوە، خوای کاربەجێ دەفەرموێ:

﴿فَٱقۡرَءُواْ مَا تَيَسَّرَ مِنَ ٱلۡقُرۡءَانِۚ..﴾ المزمل: ٢٠.

واتە: دەجا ئەوەی، کە بۆتان ئاسان دەبێ و بەدەستانەوە دێ لە قورئان، بیخوێنن. زۆربەی زانایان دەڵێن مەبەست لە (مَا تَيَسَّرَ)، سوورەتی (الفاتحة)یە، (أبو حنيفە)ش ڕەحمەتی خوای لێ بێ دەڵێ: مەبەست ئەوەیە چەندەت بۆ دەگونجێ و دەتوانی فێری بی، بۆیە ئەگەر نەیتوانی فێری سوورەتی ( الفاتحة) بێ،



بەئەندازەی ئەو سوورەتە، ئایەتی دیکەش فێر بێ، هەر دروستە، کە لە نوێژدا لە جیاتی سوورەتی (الفاتحة) بیانخوێنێ، ئەمەش تەنیا قسەی (أبو حنيفه)یە، چونکە ئەو ڕایەی دیکە زۆربەی زانایانی لەسەرن و پێغەمبەریش (صلی الله علیه وسلم) چەند فەرموودەیکی هەن، کە ئیسپاتی ئەوە دەکەن، ڕای زۆربەی زانایان ڕاستە، بۆ نموونە:

(لا صلاة لمن لم يقرأ بفاتحة الكتاب) متفق عليه عن عبادة بن صامت.

واتە: هەر کەسێك فاتیحەی کتێبی خوا {کە سوورەتی (حمد)ە }، نەخوێنێ، ئەوە نوێژەکەی دروست نیە. هەروەها فەرموویەتی:

(ومَن صَلّى صلاةً، لم يقرأ فيها بِأمّ القرآن، فهي خِدَاجٌ، ثلاثاً، غير تمام) رواه مسلم

واتە: هەر کەسێك نوێژێك بکات، سوورەتی دایکی قورئانی تێدا نەخوێنێ، ئەوە ناتەواوە، ناتەواوە، ناتەواوە، کەم و کورتە.

**ئنجا بەڕێزان!** ئەوەی، کە لە سەرجەم ئایەتەکانی قورئاندا، کە فەرمان بە قورئان خوێندن دەکەن، وەردەگیرێ، ئەوەیە، کە قورئان خوێندن لەسەر یەکەیەکەی مسوڵمانان فەرزە، واتە: نەك هەر لەسەر ئەوانە، کە شارەزای قورئانن، بەڵکو لەسەر هەموو مسوڵمانێك فەرزە، کەم و زۆر کتێبی خوا بخوێنێ.

وە لەسەر ئۆممەتی پێغەمبەر (عليه الصلاة والسلام) فەرزە، [فەرزی (كفاية)یە]، کە کەسانێکی تێدابن، هەموو قورئان بخوێننەوەو لەبەریان بێ و لێی شارەزا بن، هەر بۆیەش هەموو زانایان بە پەسەندیان زانیوە، کە بەلای کەمەوە ساڵانە جارێك قورئان خەتم بکرێ و بەگوێی مسوڵماناندا بدرێ، وە زۆربەیان بە سوونەتیان داناوە، کە لە نوێژەکانی (تراويح)ی مانگی ڕەمەزاندا، هەموو شەوێك (جزء)ێك بخوێنرێ، بۆ ئەوەی، کە بەلای کەمەوە، هەموو ساڵێك جارێك مسوڵمانان بەگشتی کەلامی خوایان هەموو بەگوێدا بچێت.



**هەڵبەتە یەکسانە:** ئینسان چ کتێبی خوای پەروەردگار بۆخۆی بخوێنێ، وە چ گوێبیستی بێ، واتە: ئەوەی بۆی دەکرێ، بیخوێنێ، ئەوەش بۆی ناکرێ، لەسەری پێویستە، کە گوێبیستی هەمووی بێ، چونکە ئامانج لە خوێندنەکەشی ئەوەیە، کە تۆ تێبیگەی و شارەزاییت هەبێ لە فەرمایشتی خوا، چ بۆ خۆت بیخوێنیتەوە، چ بەسەرتدا بخوێندرێتەوە، ئامانجەکە دێتە دی.

دیارە، کە مسوڵمانانیش نوێژ دەکەن و، خوای زانا لەسەری فەرز کردوون، کە کەم و زۆر قورئانی تێدا بخوێنن، ئەو فەرزە جێ بەجێ دەکەن، چونکە بەلایەنی کەمەوە سوورەتی (الفاتحة) دەخوێنن، وە چەند سوورەتی دیکەش ئەگەر کورتیش بن، یان چەند ئایەتێك لەدوای سوورەتی فاتیحەوە دەخوێنن، واتە ئەوەی کە لەسەر یەکەیەکەی مسوڵمانان فەرزە، بەهۆی نوێژکردنەوە دێتە دی، کە خوێندنەوەی بە شێکی قورئانە، بەڵام ئەوەی کە بەگشتی لەسەریان فەرزە (واتە فەرزی کیفایەیە و بەکردنی لەلایەن هەندێکیانەوە، گوناه لەسەر هەموویان لادەچێ) ئەوە دیارە، کە بە هۆی هەندێکیانەوە - کە بریتین لە خوێنەران و لەبەرکەران و شارەزایانی هەموو قورئان- جێبەجێ دەبێ.

شایانی باسیشە، کە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) عادەتی وا بووە، لە نوێژە فەرزەکاندا، بە تایبەتی لە نوێژی بەیانی و خەوتناندا، هەوڵی داوە هەموو قورئان بە گوێی مسوڵماناندا بدات، بەڵکو زۆر جاران لە وتاری (جمعة)دا، وە لە وتاری جەژنەکاندا، سوورەتێك یان چەند سوورەتێکی قورئانی خوێندوون، وە لە ڕاستیی دا ئەگەر سەیری پێغەمبەر ( صلی الله علیه وسلم) بکەین: وتارەکانی، نوێژەکانی، ئاڕاستەکانی، هەموویان بریتی بوون لە قورئان و، هەموویان لە قورئان هەڵهێنجراون.

کە بەداخەوە ئەوە ئێستا تا ڕاددەیەکی زۆر لە نێو مسوڵماناندا کاڵ بۆتەوە، مسوڵمانان لە قورئان دوورن و، ئەو دوورییەشە لە قورئان، کە مسوڵمانانی تووشی زۆر بیدعەت و هەڵەو لادانی فیکریی و ئەخلاقیی و عەقیدەیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی کردوە.

## ٢- قورئان دەبێ بە ڕێك و پێكی (ترتیل) بخوێنرێ:

لەچەند شوێنێكدا خوای شارەزا فەرمانی كردوە، كە قورئان دەبێ بە تەرتیل بخوێنرێ، جارێ خوای بەرزو مەزن فەرموویەتی:، كە ئێمە قورئانمان بە تەرتیل خوێندۆتەوە - لەڕێی جیبریلەوە - وەك فەرموویەتی:

﴿ وَرَتَّلۡنَٰهُ تَرۡتِيلٗا ﴾ الفرقان: ٣٢.

### بەڵێ بەڕێزان!

خوای بەرزو بێ وێنە عز وجل قورئانی بەسەر موحەممەد دا (صلی الله علیه وسلم) خوێندۆتەوە بە (ترتیل)ەوە و، فەرمانیشی پێ كردوە، ئەویش بە (ترتیل) بیخوێنێ، وەك دەفەرموێ:

﴿ وَرَتِّلِ ٱلۡقُرۡءَانَ تَرۡتِيلًا ٤ ﴾ المزمل

### ئنجا ئایا بە (ترتیل) خوێندنەوەی قورئان یانی چی؟!

وشەی (رَتْل) لە زمانی عەرەبیی دا بە مانای ڕێك وپێكیی دێ، هەر بۆیەش زار (دەم)ی كەسێك ددانەكانی ڕێك و پێك و بە ڕیزو جوان بن، واتە: شاش و نارێك نەبن، پێی دەگوترێ:(ثغرٌ مُرتَّل) واتە زارێكی ڕێك و پێك و جوان[1].

بەڵێ ئەصڵی (ترتیل) واتە: ڕیز كردن و پوخت و ڕێك و پێك كردنی شتێك، وە لێرەدا دیارە مەبەست لە خوێندنی قورئان بە (ترتیل) ئەوەیە، كە پیتەكانی بەڕێك و پێكیی گۆ بكرێن و، وشەكانی بە ڕێكیی بە دوای یەكدا بێن و، وەك خوای زانا و شارەزا چۆن قورئانی ناردۆتە خوار، بەو شێوەیە بخوێنرێ و، هەر پیت و وشەیەك مافی خۆی پێ بدرێ.

---

(١) (رتل رتْلاً: استوى وانتظم وحسن تأليفه، ويقال رتل الثغر أو الأسنان ورتل الكلام... و رتّل الشيء: نسَّقه ونظَّمه، والكلام: أحسن تأليفه و جوَّد تلاوتَهُ...) المعجم الوسيط ص٣٢٧.



**لە بارەی چاک و ڕێک و پێک خوێندنەوەی قورئانیشەوە، دەتوانین ئاماژە بەم چەند فەرموودەو شوێنەوارانە بکەین:**

١- پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم فەرموویەتی:

(زَيِّنوا القرآنَ بأصواتكم) رواه البخاري.

واتە: قورئان بەدەنگی خۆتان جوان بکەن.، کە دیارە مەبەست بە دەنگی خۆش و بە ڕێك و پێكیی خوێندنیەتی.

٢- هەروەها فەرموویەتی:

(ليسَ مِنّا من لم يتغنَّ بالقرآن) رواه البخاري.

واتە: هەر کەسێك قورئان بە دەنگ و سەدای خۆش نەخوێنێ، لە ئێمە نیە.

٣- عائیشە خوای لێ ڕازی بێ لە وەسفی قورئان خوێندنی پێغەمبەردا صلى الله عليه وسلم گوتوویەتی:

(كان يقرأ السورة فيرتلها حتى تكون أطول من أطول منها) رواه مسلم.

واتە: ئەو سوورەتێکی قورئانی بە ڕێك و پێکیی و بە ڕێ و جێ دەخوێند، هەتا درێژتر دەبوو لە سوورەتێکی لەخۆی درێژتر - ئەگەر کەسێکی دیکە خوێندبای -.

٤- هەروەها (أنس) خوای لێ ڕازی بێ، کە لە بارەی قورئان خوێندنی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لێ کراوە گوتوویەتی:

( كانت مَدًّاً، ثم قرأ: (بسم الله الرحمن الرحيم) يمد (بسم الله) ويمد (الرحمن) ويمد (الرحيم) رواه البخاري.

واتە: قورئان خوێندنی وی (صلى الله عليه وسلم) لێك کێشراوە و بەکاوەخۆ بوو، پاشان:(بسم الله الرحمن الرحيم) ی خوێند هەرکام لە (بسم الله) و (الرحمن) و (الرحيم)ی لەیەك کێشایەوە.

٥- هەروەها (أُمُّ سلمة) خوا لێی ڕازی بێ کاتێك لەبارەی قورئان خوێندنی پێغەمبەرەوە (صلى الله عليه وسلم) پرسیاری لێ کرا، گوتی:



(كان يقطع قراءَته آية آية: ( بسم الله الرحمن الرحيم. الحمد لله رب العالمين. الرحمن الرحيم. مالك يوم الدين...) رواه أحمد وأبوداود والترمذي

واتە: پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) عادەتی وابوو ئایەتەکانی جیا جیا دەخوێندن: (بسم الله الرحمن الرحيم. الحمد لله رب العالمين. الرحمن الرحيم. مالك يوم الدين)، کە دیارە مەبەست بە هێواشیی و ڕێکوپێکیی خوێندنی ئایەتەکانە..

دیارە هەر قسەیەکیش چ فەرمایشتی خوای پەروەردگار بێ، چ هەر قسەیەکی دیکە، ئەگەر بە ڕاست و دروستی نەخوێندرێتەوە، بە ڕاست و دروستیش فام ناکرێ و وەرناگیرێ، ئنجا قورئانیش، کە قسەی خوایە، دەبێ ڕاست و دروست و وەك خۆی فام بکرێ، ئەوەش کاتێك دەبێ، کە وەك خۆی بخوێندرێتەوەو، هەق بدرێتە هەموو پیت و وشەکانی، دیارە زانایان بۆ ئەم مەبەستە زانیارییەکی تایبەتیان داناوە، کە پێی دەگوترێ: (علم التجويد) (تجويد) واتە: چاککردن، چونکە (جيد) واتە چاك، واتە: زانیارییەك، کە فێرت دەکات: چاك قورئان بخوێنی.

هەڵبەتە ئێستا بواری ئەوەمان نیە باسی (تجويد) بکەین، بەڵام بێگومان لەسەر مسوڵمانان، بەتایبەتی ئەوانەی، کە ئەهلی زانستن و خەڵك دینیان لێ وەردەگرێ و بانگەوازیکارن و، بە تایبەتی تر ئەوانەی، کە ئیمامن و پێشنوێژیی بۆ خەڵك دەکەن، لەسەریان فەرزە، بایی ئەوەندە ( تجويد) بخوێنن، کە فەرمایشتی خوای پەروەردگار بە ڕاست و دروستی بخوێننەوە، چونکە زۆر جار، کە هەڵە بکرێ لە خوێندنەوەدا، هەڵە دەبێ لە ماناشدا، کەواتە: ئەوە دەبێ وا لە ئینسان بکا، کە بە ڕاست و دروستی قورئان بخوێنێتەوە، هەر بۆیەش جاری وا هەیە، کە یەکێك قورئان بە ڕاست و دروستی دەخوێنێ، باشتر سەرنجت ڕادەکێشێ و باشتر تێی دەگەی.



## ٣- پەنا بە خوا گرتن پێش دەست بە قورئان خوێندن:

شتێکی دیکە، کە لەو ئایەت و فەرموودانە وەردەگیرێ، ئەوەیە، کە قورئان خوێندن دەبێ بە پەنا بەخوا بردن دەست پێبکرێ، وەک یەکێك لەو ئەدەبانە، کە خوای پەروەردگار لە ئایەتی (٩٨)ی سوورەتی (النحل)دا فەرمانی پێکردوە، کە پێش دەست پێ کردنی قورئان، دەبێ ئینسان (إستعاذة) بکات، واتە پەنا بە خوا بگرێ لە شەیتانی ڕەجم کراو:

﴿ فَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ ﴿٩٨﴾ ﴾

ئنجا خوێندنەکە چ لە سەرەتای سوورەت بێ، یان لە نێوەڕاستی سوورەت.

دیارە هەندێ لە زانایان دەڵێن: ئەمە سوننەتە، بەڵام وا پێ دەچێ، کە فەرز بێ، چونکە خوای عزوجل فەرزی کردوە:(فَٱسْتَعِذْ بِٱللَّهِ مِنَ ٱلشَّيْطَٰنِ ٱلرَّجِيمِ)، بۆیە ئەو ڕایە بەهێزترە، کە هەر کاتێك قورئان خوێندرا، پێش دەست پێ کردنی قورئان، ئینسان بڵێ:(أعوذ بالله من الشيطان الرجيم)، کە ئەمە یەکێکە لە (صيغة)کانی، یان بڵێ: (أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم من هَمزِهِ وَنفخِهِ وَنفثِهِ)، یان (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم من هَمزِهِ وَنفخِهِ وَنفثِهِ)، ئەو سێ (صيغة)یە هەرسێکیان لە پێغەمبەرەوە (عليه الصلاة والسلام) هاتوون و ئەمەش دەقی ئەو فەرمایشتانەیە، کە تێیایاندا هاتوون:

١- عن أبي سعيد الخدري قال: كان رسول الله (صلى الله عليه وسلم) إذا قام من الليل فاستَفتَحَ صلاتَهُ وكَبَّرَ، قال: (سبحانك اللهم وبحمدك، وتبارك اسمك، وتعالى جدك، ولا إله غيرك، ثم يقول: لا إله إلا الله -ثلاثاً- ثم يقول: أعوذ بالله السميع العليم من الشيطان الرجيم من هَمزِهِ وَنفخِهِ وَنفثِهِ) رواه أحمد وأهل السنن الأربعة، وقال الترمذي: وهو أشهر شيء في هذا الباب.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم)، کە لە شەوێدا هەڵدەستا - بۆ شەونوێژ- و نوێژەکەی دەست پێ دەکرد (الله أكبر)ی دەکرد دەیفەرموو: ئەی





خوایە! پاکیی وستایش بۆ تۆ، وە ناوت بەرز و پایەت بڵندە، جگە لە تۆ هیچ پەرستراو نین، ئنجا سێ جاران دەیفەرموو: جگە لە خوا هیچ پەرستراو نین، پاشان دەیفەرموو: پەنا بە خوای بیسەری زانا دەگرم، لە شەیطانی نەفرین کراو، لە خوتخوتەی و، فووی خۆ بەزلگریی بەبەرداکردنی و، شیعر و قسەی خراپ فێرکردنی.

٢- عن ابن مسعود عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: (اللهم إني أعوذ بك من الشيطان الرجيم وهمزه ونفخه ونفثه) رواه ابن ماجة.

٣- عن سليمان بن صرد (رضي الله عنه) قال: استبّ رجلان عند النبي صلى الله عليه وسلم ونحن عنده جلوس فأحدهما يَسُبُّ صاحِبَهُ مُغْضَباً وقد احـمَرَّ وجهه فقال النبي (صلى الله عليه وسلم): (إني لأعلم كلمة لو قالها لذهب عنه ما يجد، لو قال: أعوذ بالله من الشيطان الرجيم) رواه البخاري ومسلم وأبوداود والنسائي.

واتە: ئێمە لە خزمەت پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) دانیشتبووین، دوو پیاو بووبە دەمەقاڵێ و قسە بەیەکدی گوتنیان، یەکێکیان بە تووڕەیی جنێوی بەوی دیکە دەگوت و، ڕووی سوور هەڵگەڕابوو، پێغەمبەریش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: من وشەیەک دەزانم ئەگەر بیڵێ ئەو حاڵەتەی نامێنێ، ئەگەر بڵێ: پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتانی نەفرین لێکراو.

وەك دەبینین پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بابایەکی ڕق هەڵساوی لەلایەن شەیطانەوە زەفەر پێبراوی، ڕێنمایی کردوە، کە بڵێ: (أعوذ بالله من الشيطان الرجيم). واتە: پەنا بە خوا دەگرم لە شەیتانی ڕەجم کراو، ئنجا ئایا ئەو ئەدەبە بۆچی فەرز کراوە؟

چونکە شەیتان لە کاتێکدا، کە ئینسان سەرگەرمی ئەنجامدانی کارێکی خێرە، دەیەوێ لێی تێکدا، هیچ کارێکی خێریش لەوە گەورەتر نیە، کە ئینسان فەرمایشتی خوای پەروەردگار بخوێنێتەوە، وە بزانێ چی پێ فەرمووە و، خوا عز وجل ئەو کەلامەی، کە ناردوویەتی چی تێدایە؟!، ئەوە لە هەموو کردەوەیەك گەورەترە، بۆیە زانایان دەڵێن: گەورەترین (ذكر)، خوێندنی کتێبی خوایە، چونکە قورئان خوێندن هەموو جۆرە زیکرەکانی تێدایە، وەك خوا بەیەکگرتن (توحيد) و داوای لێبوردن کردن (إستغفار) و بەپاکگرتن (تسبيح) و ستایش

کردن (تحمید) و بەگەورەگرتن (تعظیم) و...هتد، وە زۆر شتی دیکەش، کە لە ویرد و زیکرەکاندا نین.

بۆیەش پێویستە ئینسان پەنا بە خوای باڵادەست بگرێ، لە شەیتانی ڕەجم کراو، تاکو شەیتان نەتوانێ ئەو خواپەرستییەی لێ تێك بدا، دیارە ئێمەش هەر ڕواڵەت دەبینین، ئەگەرنا کاتێك ئینسان دەڵێ: (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم) ئەوە خۆی دەخاتە نێو قەڵایەکەوە، وە قەڵغانێك لەسەر سەری خۆی دروست دەکات، لە بەرانبەر وەسوەسەی شەیتاندا، بە مەرجێك لە دڵ و دەروون و ناخییەوە بیڵێ، ئەوە شەیتانی لێ دوور دەخاتەوە، وەك خوای پەنهانزان لە سوورەتی (المؤمنون)دا بە پێغەمبەر دەفەرموێ:

﴿وَقُل رَّبِّ أَعُوذُ بِكَ مِنْ هَمَزَاتِ الشَّيَاطِينِ ﴿٩٧﴾ وَأَعُوذُ بِكَ رَبِّ أَن يَحْضُرُونِ ﴿٩٨﴾﴾

واتە: (تۆ بڵێ ئەی پەروەردگارم! پەنا دەگرم بە تۆ لە وەسوەسەی شەیتانەکان، وە پەنا بە تۆ دەگرم، کە لێم نزیك ببنەوەو لەلام ئامادەبن).

(همزات) کۆی (هَمْز)ە، کە بریتیە لە دنەدان و هاندان بەرەو خراپە و تاوان[1]، شایانی باسیشە، کە شەیطان وێڕای دنەدان و خوتخوتەی خراپی توانای ئامادەبوونیشی لەلای مرۆڤ هەیە، وەك لەم دوو فەرمایشتەی پێغەمبەردا صلی الله علیه وسلم دیارە:

٤- عن أبي هريرة (رضي الله عنه ) عن النبي (صلى الله عليه وسلم) قال: إن عفريتاً من الجن تفلَّت عليَّ البارحة - أو كلمة نحوها- ليقطع عليَّ الصلاة فأمكنني الله منه فأردت أن أربطه إلى سارية من سواري المسجد، حتى تصبحوا وتنظروا إليه كلكم، فذكرت قولَ أخي سليمان عليه الصلاة والسلام: (رب اغفر لي وهب لي ملكاً لا ينبغي لأحد من بعدي) رواه مسلم.

واتە: دوێنێ شەو عیفریتێکی جند لێم بەلەسەبوو - یان وشەیەکی وەك ئەوەی فەرموو - تاکو نوێژەکەم لێ ببڕێ، خوای بەرزو پایەداریش بۆی بەردەست

---

(١) مختار و الصحاح، ص٦٠٠.



کردم، ئنجا ویستم بە کۆڵەکەیەك لە کۆڵەکەکانی مزگەوتەوە بیبەستمەوە، تاکو بەیانی هەمووتان تەماشای بکەن، بەڵام قسەکەی سولەیمانی برام (علیه الصلاة والسلام) بیرکەوتەوە، کە دەڵێ: (پەروەردگارم دەسەڵاتێکم پێبدە، کە پاش من بۆ هیچ کەس نەشێ).

٥- عن أبي الدرداء رضي الله عنه قال: قام رسول الله (صلى الله عليه وسلم) فسمعناه يقول: أعوذ بالله منك ثم قال: ألعنك بلعنة الله - ثلاثاً، وبسط يده كأنه يتناول شيئاً، فلما فرغ من الصلاة قلنا يا رسول الله! قد سمعناك تقول في الصلاة شيئاً لم نسمعك تقوله قبل ذلك، ورأيناك بسطت يدك، قال: صلى الله عليه وسلم: (إن عدو الله إبليس جاء بشهاب من نار ليجعله في وجهي، فقلت: أعوذ بالله منك ثلاث مرات، ثم قلت: ألعنك بلعنة الله التامة، فلم يستأخر ثلاث مرات، ثم أردت أن آخذه، والله لولا دعوة أخينا سليمان لأصبح موَّثقاً يلعب به صبيان المدينة) رواه مسلم.

واتە: پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەڵسا نوێژی کرد، گوێمان لێبوو سێ جاران فەرمووی: پەنات لێ بەخوا دەگرم، پاشان فەرمووی: بە نەفرینی خوا نەفرینت لێ دەکەم، وە دەستی درێژکرد وەك بیەوێ شتێك بگرێ، کاتێك لە نوێژ بۆوە گوتمان: ئەی پێغەمبەری خوا! لە نوێژدا بیستمان شتێکت فەرموو، پێشتر شتی وامان لێت نەبیستبوو، وە بینیمان دەستت درێژ کرد، ئەویش (صلى الله عليه وسلم) فەرمووی: ئەوە ئیبلیسی دوژمنی خوا، بڵێسە ئاگرێکی هێنا، کە بەدەم و چاومیەوە بنێ، منیش سێ جاران گوتم: پەنات لێ بە خوا دەگرم، پاشان سێ جاران گوتم: بە نەفرینی تەواوی خوا نەفرینت لێ دەکەم، کەچی هەر نەکشایەوە، ئنجا ویستم بیگرم، بەخوا ئەگەر داوای سولەیمانی برام نەبووایە، بەیانی بەدەست منداڵانی مەدینەوە دەبوو، بە پەلبەستکراویی یارییان پێدەکرد!



کەواتە: ئەو پەنا بەخواگرتنە لە شەیتانی نەفرین لێکراو، لەکاتی قورئان خوێندندا، بۆیە پێویستە، چونکە دەبێتە قەڵاو پەرژینێك و، بابای قورئان خوێن و نوێژکەر لە شەیتانی دەپارێزێ.

دیارە خوای پەروەردگاریش ئەو دەسەڵاتەی داوەتە شەیتان بۆ ئەوەی ئینسانی مسوڵمانی پێ تاقی بکاتەوە، کەواتە: پەنا بە خواگرتن مەسەلەیەکی گەورە و گرنگە و، دیارە ئەویش هەرئەوە نیە بە دەم بڵێ: (أعوذ بالله من الشیطان الرجیم)، بەڵکو دەبێ حاڵەتی خۆی وا ئامادە بکا، کە ئەوە فەرمایشتی خوا دەخوێنێتەوە، هەر بۆیە هەندێ لە زانایان دەڵێن وا باشترە قورئان خوێن بەرەو قیبلە دابنیشێ[١]، وە زۆربەی زانایان دەڵێن بە دەستنوێژەوە نەبێ پەسندنیە قورئان بخوێنرێ، بە تایبەت قورئان، کە دەستی لێ بدەی، ئەگەرنا مادام لەبەر بیخوێنی، دیارە بەبێ دەستنوێژیش دروستە، بەڵام ئەویش دیسان هەر بە دەست نوێژەوە باشترە[٢]، ئنجا بێگومان ئەگەر ئینسان دەستنوێژی هەبێ و، بەرزیی و گەورەیی کتێبی خوای پەروەردگار لە دڵی خۆیدا ئامادە بکاو، پەنا بە خوا بگرێ لە شەیتان، ئەوجار دەست پێ بکات، ئەوە بێگومان یارمەتی دەدات، کە چاکتر لە ئایەتەکان تێبگات و لێیان بەهرەمەند بێ.

---

(١) وەك (نووي) لە (التبیان في آداب حملة القرآن) دا هێناویەتی.

(٢) (نووي) گوتوویەتی: (یستحب أن یقرأ وهو على طهارة فإن قرأها مُحْدَثاً جاز بإجماع المسلمین). بڕوانە (التبیان على هامش مفردات القرآن) ص٥٦٣. واتە: واپەسندە بە دەستنوێژەوە بیخوێنێ، بەڵام زانایانی ئیسلام لەسەر ئەوە یەکدەنگن کە ئەگەر دەستنوێژیشی نەبێ هەر دروستە.

شایانی باسیشە کە لەلای حەنەفییەکان دروستە ئافرەتی بێ نوێژو زەیستان مادام وشە وشە بێ و بۆ فێربوون بێ، قورئان بخوێنن، مالیکییەکانیش مۆڵەتیان داوە، کە ئافرەتی بێ نوێژو زەیستان قورئان بخوێنن و دەستیشی - لێ بدەن لەبەر پێویستی دەرس خوێندن و فێربوون و لەترسی لەبیرچوونەوە. بڕوانە: پەراوێزی (مفردات القرآن: تفسیر وبیان) ص٥٦٣.



## ٤- بێدەنگیی و گوێ ڕاگرتن بۆ خوێندنی قورئــان:

مەسەلەیەکی دیکە، کە ئایەتەکان دەلالەتی لەسەر دەکەن ئەوەیە، کە لەسەر بابای مسوڵمان پێویستە لە کاتێکدا، کە قورئانی بەسەردا دەخوێنرێ، بێدەنگ بێ و گوێی بۆ ڕادێرێ:

چونکە خوای بێ وێنە و هاوتا فەرموویەتی:

﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلْقُرْءَانُ فَٱسْتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ﴿٢٠٤﴾ ﴾ الأعراف.

(إنصات) بریتیە لە بێدەنگیی و خۆ بێ هەست کردن[1]. (إستماع)یش بریتیە لە گوێگرتن بە بیر لێ کردنەوە و گرنگیی پێدانەوە[2].

شایانی باسیشە بەشێك لە زانایان دەڵێن: لێرەدا مەبەست گوێڕاگرتنە بۆ قورئان خوێندن بەگشتی و لە هەموو حاڵێك دا، بەڵام زۆربەی زانایان دەڵێن: مەبەست لێرەدا قورئان خوێندنی ئیمامە، کاتێك ئیمام لە نوێژە دەنگ تێدا بەرزکراو (جَهْرِي)ەکاندا قورئان دەخوێنێ، لەسەر (مأموم)ەکان فەرزە گوێی بۆ ڕابگرن.

هەر بۆیەش هەندێك لە زانایان دەڵێن (مأموم)ەکان نابێ لە کاتێکدا، کە ئیمام قورئان دەخوێنێ، قورئان بخوێنن، بەڵکو دەبێ گوێی بۆ بگرن، بەڵام ئەدی دەبێ چۆن و کەی سوورەتی فاتیحە بخوێنن، کە خوێندنی فەرزە؟!

دەبێ ئەو هەلە بقۆزنەوە، کە ئیمام بێدەنگ دەبێ، لەو کاتەدا ئەوان هەوڵ بدەن سوورەتی (الفاتحة)ی خۆیان بخوێنن، یان دەبێ سوورەتی (الفاتحة) لەگەڵ ئیمامدا بخوێنن، یان ئەگەر ئیمام بێدەنگ بوونێکی هەبوو، لەو کاتەدا سوورەتی (الفاتحة) بخوێنن، بۆ ئەوەی فاتیحە خوێندنەکە دژ نەوەستێ لەگەڵ ئەو فەرمانەی خوای پەروەردگاردا، کە دەفەرموێ: (کاتێك، کە قورئان خوێنرا بێدەنگ بن و گوێی بۆ ڕادێرن).

---

(١) مختار الصحاح، ص٥٦٩.

(٢) مختار الصحاح، ص٢٨٢.

بەڵێ، بابای نوێژكەر دەبێ بێدەنگ بێ و گوێ بۆ قورئان خوێندنەكەی ئیمام ڕابگرێ، وە بۆ زانیاریی زیاتریشتان: گوێ ڕاگرتن بۆ قورئان خوێندنی هەركەسێك، وەك ئەوە وایە، كە بۆخۆت بیخوێنی، بۆیەش خوا پاش فەرمان كردن بە گوێ ڕاگرتن، فەرموویەتی: (لعلكم ترحمون)، واتە: كاتێك، كە قورئان دەخوێنرێ، گەر گوێی بۆ ڕادێرن و بێدەنگ بن، دەبێتە مایەی ئەوە، كە خوای بەبەزەیی، بەزەیی پێتاندا بێتەوەو ڕەحمتان پێ بكات.

**بەڵام وەك گوتمان:** ئەوە هەموو حاڵەتەكان ناگرێتەوە، بۆ نموونە: تۆ بە ڕێگادا دەڕۆی، گوێت لە ڕادیۆیەك دەبێ لە مزگەوتێكەوە یان لە تەسجیلێكەوە، قورئان دەخوێنرێ، تۆ لەسەرت فەرز نیە بێدەنگبی و ڕابوەستی، بەڵكو وەك زۆربەی زانایان گوتوویانە: مەبەست قورئان خوێندنی ئیمامە، یان قورئان خوێندنی مەجلیسێكی تایبەت، كە دادەنیشی، یەكێك قورئان دەخوێنێ، لەو كاتەدا فەرزە گوێی لێ بگری و، نابێ ئینسان خۆی بە شتێكی دیكەوە مەشغووڵ بكا، وە واباشە هەركاتێك، كە قورئان دەخوێنرێ، ئەگەر تەسجیلە یان ڕادیۆیە، یان بێدەنگی بكەی، یان دەبێ گوێی بۆ بگری، چونكە هیچ مەعقووڵ نیە خوای پەروەردگار فەرمایشت بفەرموێ، خەڵكی دیكەش لەكاتی قسەكردنی خوای بەرز و مەزن دا، قسەی بێنێتە نێوان!! بەڵكو ئەوە بێئەدەبییە، بۆیە ئامۆژگارییمان ئەوەیە هەر كاتێك لە ماڵەوە بە تەسجیل یان بە ڕادیۆ قورئان لێدرا، دەبێ ئینسان بێدەنگ بێ، ئەگەر نا بكوژێندرێتەوە، ئەوجار قسە بكات، نەك قورئان بخوێنرێ و دەنگە دەنگ و غەڵبە غەڵب و قسەی دیكە بكرێ، چونكە ئەوە پێچەوانەی ئەو فەرمانەی خوای كاربەجێیە، كە دەفەرموێ:

(كاتێك قورئان خوێنرا، بێدەنگ بن و گوێڕادێرن) وە بەڕاستی جۆرێكیشە لە بێئەدەبیی نواندن لەگەڵ كەلامی خوادا.

**ئەمجار لە كۆتایی دا دەڵێم:** قورئان خوێندن و گوێگرتن بۆ قورئان خوێندنی خەڵكی دیكە، هەردووكیان پێویستن و، فەرزە مسوڵمان بۆخۆی قورئان بخوێنێ و، كاتێ قورئانیشی بەسەردا خوێنرا، گوێی بۆ بگرێ، دیارە لە حاڵەتە تایبەتییەكاندا نەك بەگشتی، چونكە ئەوە مایەی سەغڵەتییەكی گەورەیە.

**ئنجا وەک باسیشمان کرد:** قورئان خوێندن دەبێ بەو شێوەیە بێ، کە شایانی فەرمایشتی خوایە، واتە جوان و چاك بخوێندرێ، بەڵام لێرەدا ئامۆژگارییتان دەکەم، کە گرنگی دان بە چاکخوێندن (تجوید)، با هەرئەوەندە بێ، کە ئینسان، قورئان بە ڕاست و دروستی بخوێنێتەوە، بۆ ئەوەی بە ڕاست و دروستی بتوانێ تێی بگات.

کەواتە: هەندێ کەس، کە دێنێ هەموو هەوڵی خۆی چڕدەکاتەوە، لەسەر چۆنیەتی قورئان خوێندن و بەوەندە وازدێنێ، بابزانێ، کە ئەو جۆرە هەڵس و کەوتەی، هەڵس و کەوت کردنێکی ڕواڵەتیی و ڕووکەشییە لەگەڵ قورئاندا! بەڵێ تۆ دەبێ قورئان بە ڕاست و دروستی و بە پێی بنەماکانی (تجوید) بخوێنی و، یاساکانی (تجوید)ی تێدا ڕەچاو بکەی، بەڵام نابێ هەموو هەوڵی خۆت لەوەدا چڕ بکەیەوە، هەر خەریکی ئەوە بی، کە چۆن پیت و وشەکان ڕاست بڵێی و، سەرەنجام بنەمایەکانی تەجوید بەسەر قورئان خوێندنەکەتدا جێبەجێ بکەی و، ئاگات لە ماناکەی نەمێنێ!! واتە نابێ ڕەچاوکردنی چاکخوێندنی قورئان، بێئاگات بکا لە تێوەڕامان (تأمل) و وردبوونەوە (تدبُّر)، کە ئەوە ئامانجی سەرەکیی (بیت القصید)ی قورئان خوێندنە، چونکە خوای پەروەردگار دەفەرموێ: قورئان بخوێنە، بۆ ئەوەی تێوەی ڕامێنی و لێی تێبگەی و کاریگەریی لەسەرت هەبێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ٢٩ ﴾ ص.

ئاشکراشە، کە پیت و وشەکانی هەر قسەیەك لە جێی بەرگ و توێکڵ و، ماناو مەبەستەکەیشی لە جێی ڕووح و کاکڵن، بۆیە زۆر شتێکی هەڵەیە لەسەر حیسابی نێوەڕۆك، زێدەڕۆیی بکرێ لە سەرگەرمبوون بە ڕواڵەتەوە.

کەواتە: بەڵێ قورئان فەرزە دەبێ بخوێنرێ، وە کاتێك خوێندرا، فەرزە گوێی بۆ بگیرێ، بەتایبەتی لە نوێژدا، کاتێك، کە ئیمام قورئان دەخوێنێ، یان، کە لە کۆڕێکی تایبەتدا قورئان دەخوێنرێ، بەڵام وەك گوتمان: قورئان خوێندن و چۆنیەتی قورئان خوێندن و چاك خوێندنیشی، نابێ لەسەر حیسابی لایەنەکانی دیکەی بێ، بە تایبەتی لایەنی لێحاڵی بوون و پێدا قووڵ بوونەوە (التدبر والتأمل).



چونکە ئامانجی خوێنرانی قورئان و بەسەردا خوێنرانەوەی، ئەوەیە، کە لێی تێ بگەی، ئەوەشمان بۆ مەیسەر نابێ، بەبێ لێ ورد بوونەوەو پێدا قووڵ بوونەوەی و تێوەڕامانی، بۆیە ئەوانەی هەر خەریکی وشە و پیتەکانی قورئانن و، خەریکی فێربوونی (تجوید)ن و، بێئاگان لە تێگەیشتنی قورئان، لە ڕاستی دا تەنیا ئەرکێکیان لە چەندان لەبەرانبەر قورئاندا جێبەجێ کردوە، بەڵام ڕاست ئەوەیە، کە هەڵسو کەوتێکی هاوسەنگانە بکەین لەگەڵ قوررئاندا و، هەم بەرانبەر بە ڕواڵەتەکەی، کە خوێندنیەتی، ئەدەب ڕەچاو بکەین، بەو شێوەیەی، کە شەرع دەفەرموێ بیخوێنین، وە هەم بەرانبەر بە نێوەڕۆکەکەی، کە مانا و مەبەستیەتی و، هەم بەرانبەر بە ئیش پێ کردنەکەی، وەك لە وانەکانی داهاتوودا باسی دەکەین.

خوای بەبەزەیی بە کەرەم و لوتفی خۆی تەوفیقمان بدات بەو شێوەیە قورئان بخوێنین، کە بۆخۆی پێی خۆشە و، بەڕاست و دروستی بە شێوەیەکی جوان و پەسند و ڕێك و پێکی وا، کە شایستەی کتێبی بەرزو بەڕێزو پیرۆزی خوا عز وجل بێ بیخوێنین و، بۆ خوێندنەوەی گوێ ڕادێرین و، لە هەردوو حاڵەتی خوێندنەوەو بەسەردا خوێندنەوەدا، ئەو ئەدەب و ڕێزو حورمەتە لەگەڵ کەلامی بێ وێنە و ناوازە و بەرزو مەزنی خوای تاك و پاك دا بنوێنین، کە شایستەیەتی.

وصلّى الله تعالى على محمد و على آله المهتدين بهديه المبين.

و الحمد لله رب العالمين.



وانەی سێیەم

هەنگاوی سێیەم:

# بیرلێکردنەوە و تێوەڕامان

(التفكُّـر والتدبُّـر)

بەڕێـــزان!

ئەم وانەیەمان وانەی سێیەمە لە زنجیرە وانەی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟!) وە لەم وانەیەماندا باسی هەنگاوی سێیەمی چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردنی ڕاست و دروست دەکەین لەگەڵ قورئاندا.

لەوانەکانی یەکەم و دووەمدا باسی ئەوەمانکرد، کە یەکەمین هەنگاو ئەوەیە، کە ئینسان لە بەرانبەر کتێبی خوادا، ئەو پەڕی ئەدەب و بە گەورەگرتن و ڕێزی هەبێ، هەنگاوی دووەمیش ئەوەیە، کە ئینسان هەوڵ بدا قورئان بخوێنێ و گوێ بۆ خوێنرانەوەی قورئان بگرێ، ئێستاش باسی بیرلێکردنەوەو لێوردبوونەوەی قورئان دەکەین، کە بەبێ ئەم هەنگاوەی سێیەم، دیارە خوێندنەوەی قورئان یان گوێگرتن بۆ خوێنرانەوەی، ئەو مەبەستەی خۆی نایەنێتە دی، کە بریتیە لە: (تێگەیشتنی قورئان).

دیارە خوا تبارك وتعالی کتێبی خۆی بۆیە ناردۆتە خوار، وەك لێرەدا باسی دەکەین، بۆ ئەوەی خەڵك لێی تێبگەن و دوای تێگەیشتنیش کاری پێ بکەن. ئنجا بە بێ بیرکردنەوەو قووڵ بوونەوەو تێوە ڕامان، دیارە ئینسان لە قورئان تێناگا، بۆیە هەنگاوی سێیەمی هەڵس و کەوتی ڕاست و دروست لەگەڵ کتێبی خوادا، بریتیە لە:



بیر لێ کردنەوەو تێوەڕامان، یان لێوردبوونەوەو پێدا قووڵ بوونەوە، (التفکر و التدبر) دیارە ئێمە مەبەستمان ئەوە نیە، کە کەسێك نەخوێندەوارەو دەزانێ قورئان بخوێنێ، بەڵام توانای تێگەیشتنی نیە، لەبەرئەوەی، کە شارەزای زمانی عەرەبیی نیە، با قورئان نەخوێنێ! چونکە خوێندنی قورئان بۆخۆی یەکێکە لە عیبادەتەکان، واتە: قورئان وەك زانایان گوتوویانە: (تلاوته تعبد)، هەر خوێندنی قورئان بۆخۆی جۆرێکە لە جۆرەکانی عیبادەت، وە گوێ لێ گرتنیشی هەر جۆرێکە لە جۆرەکانی خوا پەرستیی.

بۆیە خوای بەخشەر فەرمانی بە هەردووکیان کردوە، فەرمانی کردوە، کە قورئان بخوێنرێ، دیارە جێبەجێ کردنی فەرمانی خوای پەروەردگاریش خواپەرستییە، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَٱتۡلُ مَآ أُوحِيَ إِلَيۡكَ مِن كِتَابِ رَبِّكَ ﴾ الکهف: ٢٧.

هەروەها فەرمانیشی کردوە، کە گوێ بۆ خوێندنی قورئان بگیرێ، وەك فەرموویەتی:

﴿ وَإِذَا قُرِئَ ٱلۡقُرۡءَانُ فَٱسۡتَمِعُواْ لَهُۥ وَأَنصِتُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ٢٠٤ ﴾ الأعراف.

واتە: هەم خوێندنەوەی و قورئان، هەم گوێ لێ گرتنی، جۆرێکن لە جۆرەکانی خواپەرستیی، جا تێگەیشتنی لەگەڵدابێ یان لەگەڵدا نەبێ، بەڵام لە ڕاستی دا کاتێك ئەو عیبادەتە، کە بریتیە لە خوێندنەوەو گوێ لێ گرتنی قورئان، ئامانجی خۆی چاك دەپێکێ، کە بیرکردنەوەو لێ ورد بوونەوەو تێوەڕامانی لەگەڵدا بێ، کە ئەوەش عیبادەتێکی دووەمە، ئەصڵی قورئان خوێندن عیبادەتە، ئەصڵی گوێلێگرتنی عیبادەتە، وە بیرلێکردنەوەو تێوە ڕامان و لێ ورد بوونەوەو پێدا قووڵ بوونەوەشی، جۆرێکی دیکەی خوا پەرستییە، کە لەگەڵ کتێبی خوادا ئەنجام دەدرێ.

ئێستاش پێش ئەوەی بچینە نێو قووڵایی باسەکەمان، با بزانین مەبەستمان لە لێوردبوونەوە و بیر لێ کردنەوەی قورئان، کاتێك دەیخوێنێ، وە یان بەسەرتدا دەخوێنرێتەوە، چییە ؟!





## پێناسەی بیرکردنەوە و تێوەڕامانی قورئـــان

وشەی (تفكُّر)، کە خوای زانا لە قورئاندا بەکاری هێناوە، لە سەر کێش (وزن)ی (تفعُّل)ە، واتە جووڵاندنی فیکر، فیکریش بەرهەمی عەقڵە، خوای شارەزا عەقڵی بە ئینسان داوە، کە بریتیە لە هێزێك ئینسان شتێ پێ دەرك دەکات، جا جووڵاندنی عەقڵ و ئیش پێ کردنی پێی دەگوترێ: (فكر)، وە ئەصڵی پڕۆسەکەش پێی دەگوترێ: (تَفكُّر) یان (تَعقُّل).

(تَعقُّل) ئەوەیە تۆ عەقڵی خۆت بەکار بێنی لە زانینی شتدا[1]، لە ئەنجامی بەکارهێنانی عەقڵیشدا، شتێك بەرهەم دێ، کە پێی دەگوترێ: (فِكْر)، وە کردارەکەش پێی دەگوترێ: (تَعقُّل) یان (تَفكُّر).

کەواتە (تَفكُّر) واتە: بەکارهێنانی عەقڵ، دیارە، کە دەڵێین (تَفكُّر) لە قورئاندا، واتە بەکارهێنانی (عەقڵ) بۆ لێ تێگەیشتنی قورئان.

(تدبُّر)یش هەر بە مانای لێورد بوونەوەو تێوەڕامان دێ، بەڵام بە ئیعتیباری ئەنجامی کۆتایی[2]، واتە ئایەتێك لێی ورد دەبیەوە، داخۆ ماناکەی، ئەنجامەکەی چییە؟

چونکە (تَدبُّر) واتە: بیرکردنەوە لە شت، بۆ ئەوەی ئەنجامەکەی بزانی، دیارە هەر بیرکردنەوەیەکیش بۆ ئەوەیە، کە ئەنجامێکت دەست بکەوێ، بۆ نموونە: خوای پەروەردگار فەرموویەتی: ﴿قُلْ هُوَ ٱللَّهُ أَحَدٌ ①﴾ ئەم ڕستەیە، کە ئایەتێکە لە ئایەتەکانی سووڕەتی (الإخلاص) مەبەست پێی چییە؟

دیارە ئەگەر لێی ورد نەبیەوە و پێیدا قووڵ نەبیەوە، نازانی مەبەستەکەی چییە؟ واتە ئامانجێکت دەست ناکەوێ.

کەواتە: هەردووك وشەی (تَفكُّر) و (تَدبُّر)، مەبەست پێیان بەکارهێنانی عەقڵ و وەکارخستنیەتی، بۆ ئەوەی، کە وردبیەوە لە ئایەتەکانی خوا، داخۆ خوای زانا و

---

(١) مختار الصحاح، ص ٤٤٣.

(٢) مختار الصحاح، ص ١٨٥.

شارەزا، مەبەستی پێیان چییە؟، کە ئەنجامەکەشی بریتیە لە (فقە)ی قورئان، واتە تێگەیشتنێکی ورد و قووڵ.

## چەمکی وشەی (فقە):

لە زمانی عەرەبیدا وشەی (فهم)مان هەیە، هەروەها (فقه)یشمان هەیە، خوای کاربەجێ لە قورئاندا وشەی (فقه)ی لە جیاتی (فهم) بەکارهێناوە، دیارە (فهم)یش بریتیە لە تێگەیشتن، بەڵام (فقه) بریتیە لە ورد تێگەیشتن[1]!

(راغب الأصفهاني)یش دەڵێ: (فقه) بریتیە لە زانینی شتێک بەهۆی شتێکی زانراوەوە: الفقه: هو التوصُّلُ الى علمٍ غائبٍ بعلمٍ شاهدٍ، فهو أَخصُّ من العلم)[2].

هەندێکی دیکەش لە زانایان و شارەزایانی زمانی عەرەبیی گوتوویانە:

{الفقه: هو فهم مراد المتكلِّم من كلامه} واتە: (فقه) بریتیە لە تێگەیشتن لە مەبەستی قسە بێژ لە قسەکەی.

ئنجا (تَفكُّر) و (تَدبُّر) لە قورئاندا ئەنجامەکەیان بریتیە لە (فقه)ی قورئان، واتە: چاك لێ تێگەیشتنی و ورد تێگەیشتنی وە حاڵی بوون لە مەبەستی خوای زانا و شارەزا لە فەرمایشتەکانی.

ئێستاش با سەیری ئەو ئایەتانە بکەین، کە خوای پەروەردگار باسی هەموو ئەو شتانەی تێدا کردوون:

١- خوای بێ وێنە فەرموویەتی:

﴿وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلذِّكْرَ لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ ﴿٤٤﴾﴾ النحل.

واتە: وە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتە خوار، تاکو ئەوەی بۆ خەڵکی نێرراوەتە خوار، بۆیان ڕوون بکەیەوە، وە بەڵکو بیر بکەنەوە و لە قورئان وردبنەوە.

وشەی (ذکر) یەکێکە لە ناوەکانی قورئان، خوای پەروەردگار چوار ناوی بۆ

---

(١) مختار الصحاح، ص ٤٤٣

(٢) مفردات ألفاظ القرآن، ص٦٤٢،٦٤٣.



قورئان بەکارهێناون: (قرآن)، (کتاب)، (فرقان)، (ذکر).

ئنجا خوا عز وجل کە فەرموویەتی: ئێمە زیکرمان بۆ لای تۆ ناردۆتەخوار، بۆچی خوای بێ هاوەڵ ناوی لە قورئان ناوه (ذکر)؟! چونکە قورئان ڕاستییەکان بیری ئینسان دەخاتەوە، خوای تاك و پاکی بیر دەخاتەوە، سەرەنجامی خۆی بیردەخاتەوە، حەقیقەتی خۆی بیر دەخاتەوە، حەقیقەتی شتەکان و ژیانی دنیای بیر دەخاتەوە، ئەو حەقیقەتانەی، کە خوا لە فیطرەتی دا دایناون.

دەفەرموێ: زیکرمان بۆ لای تۆ ناردوە: (لِتُبَيِّنَ لِلنَّاسِ مَا نُزِّلَ إِلَيْهِمْ) بۆ ئەوەی بۆ خەڵکی ڕوون بکەیەوە، ئەوەی کە بۆیان نێرراوەتە خوار.

ئەرکی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بریتی بووه لە ڕوونکردنەوە (تَبْيين)ی قورئان، ئنجا وەك جاری دیکەو لە شوێنی دیکەدا باسمان کردوە، ڕوونکردنەوەی پێغەمبەری خوا بۆ قورئان، دوو شێوەی هەن: ڕوونکردنەوە بە فەرمایشتی خۆی، وە ڕوونکردنەوە بە کردەوە و هەڵوێستەکانی.

پێغەمبەری ئێمە (علیه الصلاة والسلام)، هەم بە فەرمایشتی خۆی و هەم بەکردەوەی، کتێبی خوای ڕوون کردۆتەوە، کە ئایا مەبەست لە فلان ئایەتە چییە؟! وە مەبەست لە فلان حەقیقەتە چییە؟!، کە خوای پەروەردگار فەرموویەتی، وە چۆن جێ بەجێ دەکرێ ؟! وە چۆن دەبێ مامەڵەی لەگەڵدا بکرێ؟!

دوایی دەفەرموێ: (وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ)، وە بۆ ئەوە قورئانمان ناردوە بۆ لای تۆ {ئەی موحەممەد! (صلی الله علیه وسلم)} بۆ ئەوەی بیر بکەنەوە، ئەرکی پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام) بریتیە لە ڕوونکردنەوەی قورئان، بە قسەو بە کردەوەی خۆی بۆ ئۆممەتەکەی ڕوون بکاتەوە، قورئان چی دەوێ؟ ئەو یاسایانەی، کە قورئان هێناونی چی و چین و چۆنن؟ ڕاستییەکانی قورئان کامانەن؟! وە ئایا قورئان چۆن پیادە دەکرێ؟! ئەرکی ئۆممەتیش ئەوەیە بیر بکەنەوە، بیر کردنەوە هەم لە خودی قورئان، هەم لەو شەرح و تەفسیرەی، کە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام لەسەر قورئانی کردوە، ڕستەی: (وَلَعَلَّهُمْ يَتَفَكَّرُونَ) هەردووکیان دەگرێتەوە.

واتە: دەبێ هەم بیر لە خودی قورئان بکەنەوە و، بۆ خۆیان عەقڵی خۆیان بەکار بێنن، هەم لەو شەرح و بەیان و تەفسیرەش، کە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام



کردوویەتی لە چوار چێوەی سوننەتی خۆیدا (سوننەتی قەولیی و عەمەلیی) و بیری لێ بکەنەوە.

کەواتە: ئەوەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام کردوویەتی، بۆ ڕوونکردنەوەی قورئان بە تەنیا بەس نیە بۆ ئەوەی، ئیش بە قورئان بکەین، ئەگەر بیرکردنەوەی خۆشمانی نەخەینە پاڵ، بەڵکو ئەگەر بیرکردنەوەی خۆمانی نەخەینە پاڵ، هەر لەوەی پێغەمبەریش حاڵی نابین، یان لەوانەیە بە هەڵە لێی حاڵی بین!!

**٢-** هەروەها خوای بەرزو مەزن دەفەرموێ:

﴿ كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ إِلَيۡكَ مُبَٰرَكٞ لِّيَدَّبَّرُوٓاْ ءَايَٰتِهِۦ وَلِيَتَذَكَّرَ أُوْلُواْ ٱلۡأَلۡبَٰبِ ﴿٢٩﴾ ﴾ ص.

شارەزاو زانایانی زمان دەڵێن: (کتاب) (خبر)ی (مبتدأ)ێکی (محذوف)ە، واتە: (هذا کتاب)، کەواتە: مانای ئایەتەکە ئاوایە: ئەم قورئانە کتێبێکە ناردوومانە بۆ لای تۆ - ئەی موحەممەد - پڕ بەرەکەتە و بە پێزە، بۆ ئەوەی لە ئایەتەکانی ورد ببنەوە و دیققەتی بدەنێ، وە تاکو ئەوانەی عاقڵمەندن پەندی لێ وەربگرن.

کەواتە: تێوەڕامانی قورئان و بیرلێ کردنەوەی، بە کێ دەکرێ ؟ بە خاوەن عەقڵان دەکرێ، ئینسان هەتا عەقڵی زیاتر بێ، زیاتر دەتوانێ لە قورئان ورد بێتەوەو لێی تێبگاو پەندی لێ وەرگرێ و، ئەو زانیاریی و حەقیقەتانەی، کە تێیدان، وەریان بگرێ.

ئنجا ئەنجامی (تفكُّر) و (تدبُّر)یش بریتیە لە (فقه)ی قورئان و لێ تێگەیشتنی، وەك خوای زاناو شارەزا لەو بارەوە فەرموویەتی:

﴿ قَدۡ فَصَّلۡنَا ٱلۡأٓيَٰتِ لِقَوۡمٖ يَفۡقَهُونَ ﴾ الأنعام: ٩٨.

واتە: بەڕاستی ئایەتەکانی خۆمانمان ڕوونکردوونەوە، بۆ کەسانێك، کە لێیان تێبگەن.

(تفصیل) لەبەرانبەری (إجمال) دایە، (إجمال) واتە: گوتنی شتێك و باسکردنی بە کورتیی، (تفصیل)یش ئەوەیە، کە بە ڕوونیی و بە درێژیی بێ، جا خوای بێ هاوتا دەفەرموێ: ئایەتەکانی خۆمانمان (تفصیل) داون، بۆ کەسانێك، کە لێیان تێبگەن، ئنجا ئایا لە ئەنجامی چی دا ئینسان تێ دەگا؟ لە ئەنجامی بیرکردنەوەو ڕاماندا، ئینسان دەتوانێ لە کتێبی خوا تێبگا، لێ تێگەیشتنێکی وردو قووڵ.



## هۆکارەکانی چاك تێگەیشتنی قورئان

**خواپشتیوان بێ لە پێنج خاڵان دا باسی هۆکارەکانی چاک لێتێگەیشتنی قورئان دەکەنی:**

یەکەم و دووەم : بیرکردنـەوە و تێوەڕامـان لە قورئـان و، پێکەوە سـەرنجدانی ئایەتەکان و پێکەوە گرێدانیان:

چۆنیەتی بیر لێ کردنەوەی قورئانیش لە کاتێکدا، کە دەیخوێنی، یان بەسەرتدا دەخوێنرێتەوە، ئەوەیە، کە ئینسان بیر لە پیتەکانی قورئان بکاتەوە، چونکە هیچ پیتێك لە قورئاندا بەبێ هۆو حیکمەت دانەنراوە، وە بیر لە وشەکانی بکاتەوەو، بیر لە ڕستەکانی بکاتەوەو، بیر لە ئایەتەکان بکاتەوە، وە بیر لە سیاق و ڕیزبەندیی ئایەتەکان بکاتەوە، ئەوە هەمووی بە تەرتیب، هیچ پیتێك لە قورئاندا بە خۆڕایی دانەنراوە، حیکمەتێکی تێدایە، دیارە لێرەدا بوار نیە نموونەی زۆر بخەینە ڕوو و، تەنیا یەك نموونە دێنینەوە:
خوای پەروەردگار دەفەرموێ:

﴿ وَٱتۡلُ عَلَيۡهِمۡ نَبَأَ ٱلَّذِيٓ ءَاتَيۡنَٰهُ ءَايَٰتِنَا فَٱنسَلَخَ مِنۡهَا فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ فَكَانَ مِنَ ٱلۡغَاوِينَ ١٧٥ ﴾ الأعراف.

واتە: هەواڵی ئەو کەسەیان بەسەردا بخوێنەوە، کە ئایەتەکانی خۆمانمان پێدابوون، بەڵام ئەو لەخۆی دایڕنین و، یەکسەر شەیطان شوێنی کەوت و گرتی و چووە ڕیزی سەرگەردانانەوە.

ئایا لێرەدا بۆچی خوا فەرموویەتی: (فَأَتۡبَعَهُ ٱلشَّيۡطَٰنُ) و بۆچی نەیفەرمووە: (فَتَبِعَهُ الشَيْطان) یان (فاتَّبَعَهُ الشیطان) ؟ چونکە وشەی (أَتْبَعَ) ئەوەیە، کە کەسێك بەدوای شتێك بکەوێت و بیشیگرێ[1]، واتە: ئەو کەسەی، کە ئایەتەکانی خوا لە خۆی دادەڕنێ و ئیشیان پێ ناکا، شەیتان شوێنی دەکەوێ و دەشیگرێ. بەڵێ لێرەدا بۆیە وشەی (أتبع) بەکارهێنراوە لەجیاتی وشەیەکی دیکە، چونکە (فَأَتْبَعَهُ) واتە بەدوای کەوت و گرتیشی.

---

(١) مختار الصحاح، ص ٧٨.

کەواتە: کەسێك بیەوێ لە ڕاز و نهێنییەکانی قورئان تێبگات، پێویستە بیر لە هەموو پیت و وشەو بڕگەو ڕستەکانی بکاتەوە و، سەرنجی وردیان لێ بدات.

وە پاشان بیر بکاتەوە لە ڕیزبەندیی و سیاقی ئایەتەکانیش، ئەو ئایەتە بۆچی بەدوای ئەو ئایەتە دا هاتوە؟ بۆچی ئەو ئایەتە لە پێش ئەو ئایەتەوە هاتوە؟ دیارە هەمووی نهێنیی و حیکمەتی لە ژێردا هەیە.

## بەڵێ بەڕێـــزان!

دەبێ بیرلێکردنەوەکە ئاوابێ، دەبێ بیر لە پیتەکانی قورئان بکەیەوە و، بیر لە یەك یەکی وشەکان بکەیەوە، وە بیر لە ڕستەکان بکەیەوە، وە سەرەنجام بیر لە موناسەبەتی هاتنەخواری ئایەتەکانیش بکەیەوە!، ئنجا بێگومان لە ئەنجامی هەموو ئەو جۆرە بیرکردنەوەو ڕامانانەدا، وردتر لە قورئان حاڵی دەبی و نهێنی و حیکمەتی زۆرت دەست دەکەون.

**با نـــموونـەیەك بێنیـــنـەوە:**

یەکێك لە بنچینەکانی (أصول الفقه) ئەوەیە، کە زانایان دەڵێن: دواندنەکان (خِطابات)ی قورئان، بۆ وێنە: کە خوای کاربەجێ دەفەرموێ: (يا أيها الذين آمنوا) ئەی ئەوانەی ئیمانتان هێناوە!، مەبەستی پێ ئافرەتانیشە، بەڵام ئایا بۆچی ئاوا هاتوە؟! چونکە لە زمانی عەرەبیی دا یاسایەك هەیە، کە هەر کاتێك کۆمەڵێك پیاو و ئافرەت پێکەوە دوێنران، بۆ ئاسانکاریی قسەکان، قسەکە بە صیغەی نێرینە (مذَكَّر) دەگوترێ، بەڵام مەبەستی پێی هەردووکیانە[1]، ئەوە یەکێکە لەو بنچینانەی، کە زانایانی (أصول الفقه) لەسەری یەك دەنگن.

ئنجا ئەگەر ئینسان لە قورئان ورد بێتەوە، ڕاستیی و تەواویی ئەو بنچینەیەی بۆ دەردەکەوێ، بۆ نموونە: (بخاري و مسلم) لە (عبدالله بن عباس)ەوە خوا لێیان ڕازی بێ گێڕاویانەتەوە، کە شەوێك (عبدالله) لە لای (میمونة)ی هاوسەری پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم)، کە پووری (خوشکی دایکی عەبدوڵڵا) بووە،

---

(١) ئەم یاسا زمانەوانییە پێی دەگوترێ (تغليب الذكور على الإناث) زاڵکردنی نێرینان بەسەر مێینان‌دا.



ماوەتەوە و ئەو لەباری پانی جێگای خەوتنەکەیاندا وو پێغەمبەرو هاوسەریشی له باری درێژییەکەیدا خەوتوون، ئیدی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەتا شەوگار بە نیوە بوو، یان تۆزێك پێشتر، یاخود تۆزێك دواتر، بێداربۆتەوەو دانیشتوەو، شوێنەواری خەوی لە دەم وچاوی سڕیوە، پاشان دە (١٠) ئایەتی کۆتایی لە سووڕەتی (آل عمران)دا خوێندوون و، دوایی هەڵساوە لە کوندە ئاوێکی هەڵواسراو دەستنوێژێکی چاکی گرتوە، پاشان هەڵساوە شەونوێژی کردوون...[1].

جا دیارە دە ئایەتەکانی کۆتایی (آل عمران) بەم دوو ئایەتە دەست پێ دەکەن:

﴿ إِنَّ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ وَٱخْتِلَٰفِ ٱلَّيْلِ وَٱلنَّهَارِ لَءَايَٰتٍ لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ قِيَٰمًا وَقُعُودًا وَعَلَىٰ جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضِ ﴾.

وە بەم ئایەتەش کۆتاییان دێ:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱصْبِرُواْ وَصَابِرُواْ وَرَابِطُواْ وَٱتَّقُواْ ٱللَّهَ لَعَلَّكُمْ تُفْلِحُونَ ﴿٢٠٠﴾ ﴾

جا هەرچەندە وەك دەبینین هەم دوو ئایەتەکەی سەرەتاو، هەم ئایەتەکەی کۆتایی، تەنیا صیغەی نێرینەیان تێدا بەکارهاتوە: (لِّأُوْلِي ٱلْأَلْبَٰبِ ﴿١٩٠﴾ ٱلَّذِينَ يَذْكُرُونَ ٱللَّهَ ..)، ( يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ )؛ بەڵام کاتێك بە وردیی سەرنجی سەرجەم ئایەتەکان دەدەین و، هەموویان وەك ئاڵقەکانی زنجیرێك پێکەوە گرێی دەدەین، دەبینین، کە دوێنراو (مُخاطَب) لەم ئایەتانەدا، تەنیا نێرینەکان (الذكور) نین، بەڵکو مێینەکان (الإناث)یشن!

چونکە لە ئایەتی ژمارە (١٩٥) هەمان کۆمەڵە ئایەت و سیاق دا خوا عز وجل فەرموویەتی:

---

(١) صحيح البخاري برقم ٤٥٧٢، وە پێغەمبەر (صلى الله عليه وسلم) لەبارەی بیرلێکردنەوەی ئەم دە ئایەتانەوە فەرموویەتی: (ويلٌ لِمَن قرأها ولم يتدّبر فيها) رواه ابن مردويه عن عطاء، واتە: سزای سەخت بۆ کەسێك کە دەیانخوێنێتەوە و لێیان ورد نابێتەوە، بڕوانە (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير)، ص٢٦٦،٢٦٧.



﴿ فَٱسْتَجَابَ لَهُمْ رَبُّهُمْ أَنِّى لَآ أُضِيعُ عَمَلَ عَٰمِلٍ مِّنكُم مِّن ذَكَرٍ أَوْ أُنثَىٰ ۖ بَعْضُكُم مِّنۢ بَعْضٍ ۖ .. ﴾ آل عمران.

واته: ئنجا پەروەردگاریان وەڵامی دانەوە كە: من كردەوەی هیچ ئیشكەرێك بە زایە نادەم، لە نێر یان مێ، هەندێكتان لە هەندێكتانن...

كەواتە: مەبەست لەوانەی، كە خوای پەروەردگار عز وجل لەو ئایەتانەدا مەدحیان دەكات و بە عاقڵمەندان (أولي الألباب) وەسفیان دەكات و، پاشان بە ئەهلی زیكرو فیكر دەیانناسێنێ (یذكرون الله.. ویتفكرون..)، وە دوایی چەندان دووعاو پاڕانەوەو كڕووزانەوەی بە كوڵیان لێ دەگێڕێتەوە: پەروەردگارمان ئەم بوونەوەرەت بە هەوەنتە دروست نەكردوە، پاكیی بۆ تۆ، لە ئازاری ئاگر چەپاڵەمان بدە:

﴿ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَٰذَا بَٰطِلًا سُبْحَٰنَكَ فَقِنَا عَذَابَ ٱلنَّارِ ﴾...هتد، بەڵێ مەبەست لەو بەندە چاك و بەئەمەكانەی خوا، پیاوان و ئافرەتانێكن، كە خاوەنی ئەو خەسڵەت و هەڵوێست و جۆرە بیركردنەوەیەن، كە پێی مەدح كراون.

دیارە بە قیاس بۆ سەر ئەم شوێنەش، لە هەر جێیەكی دیكەی قورئانیشدا، بەو شێوەیەو بە صیغەی نێرینە (صیغە المذكر) باسی بەندەكانی خوا عز وجل كرابێ، یان ڕووی دواندن (خطاب) یان تێكرابێ، ئەوە مەبەست پێی هەردوو ڕەگەزی نێرو مێیە، بەبێ جیاوازیی، مەگەر بە بەڵگەو نیشانەیەكی ڕوون و بێ چەند و چوون، تایبەت كرابێ بە یەكێكیانەوە (واتە پیاوان یان ئافرەتان).

ئنجا ئایا لە ئەنجامی چی دا ئەوەمان دەست دەكەوێ ؟! بێگومان لە ئەنجامی بیر لێ كردنەوەو پەیوەستكردنی ئەو ئایەتەی دوایی لەگەڵ ئەوانی پێش خۆیدا، چونكە هەمووی یەك سیاقە، بەڵام ئەگەر ئینسان بیری لێ نەكاتەوە، ئەو ڕاستییەی بۆ دەرناكەوێ و، ڕەنگە چەندان جارئینسان بیخوێنێتەوە، بەڵام هەر بە خەیاڵیشیدا نەیەت، كە ئەو بنچینەیەی زانایانی (أصول الفقە)ی تێدایە، كە زۆریان هەوڵداوە لە قورئاندا بەڵگەی بۆ بێننەوە، یانی: ئەوە كە دواندنەكان (خطابات)ی قورئان لەگەڵ هەردوو ڕەگەزەكەن، هەرچەندە بە (صیغة)ی (مذكر) هاتبن، بەڵام مەبەست تەنها پیاوان نیە، بەڵكو مەبەست پێی ئافرەتانیشە.

بەڵێ، لە ئەنجامی تێفکرین و بیر کردنەوەدا، ئینسان دەگاتە ئەو ئەنجامە و ئەگەر بیری لێ نەکاتەوەو لێی ورد نەبێتەوەو ڕانەمێنێ و، هەر سەرکێڵانە بیخوێنێتەوە، یاخود ئایەتەکان پێکەوە گرێ نەدات، ئەو ئایەتانەی پێشێ بەجیا حاڵی بێ و، ئەوانی دوای وانیش بە جیا، ئەوەی، باسمان کرد، ئەوە دەستگیریی نابێ.

کەواتە: چۆنیەتی بیرلێکردنەوەکە، ئەوەیە کە ئینسان بیر لە هەرکام لە پیتەکان بکاتەوە، هیچ پیتییێك لە قورئاندا بە خۆڕایی دانەنراوە، وە ئەگەر لە شوێنێك پیتێك کەم کراوەتەوە، بە خۆڕایی نیە و، حیکمەتێکی لە ژێر دایە، هەروەها لە شوێنێك دا پیتێك زیادکراوە، یان گۆڕدراوە بە پیتێکی دیکە، دیارە حیکمەتێکی لەژێردایە. هەروەها هەر وشەیەك و هەر ڕستەیەك لە قورئاندا بەهەمان شێوە، وە ڕیزبەندیی ئایەتەکان و سیاقیان لەبەرچاو بگرێ.

## ئێستاش بۆ زیاتر ڕوونکردنەوەی با وێنەیەکی دیکە بێنینەوە:

زۆرجاران بۆ ئیسپاتی ئەوە، کە مسوڵمانان لەسەریان پێویستە چاو لە پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) بکەن و، بۆ هەموو شتێك بیکەنە سەرمەشقیان، ئەم ئایەتە بە بەڵگەو دەلیل دەهێنرێتەوە:

﴿ قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِي يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ .. ﴾ آل عمران: ٣١.

واتە: (ئەی موحەممەد!) بە ئۆممەتەکەت بفەرموو: ئەگەر ئێوە خواتان خۆشدەوێ، شوێنم بکەون، تاکو خواش خۆشی بوێن.

هەروەها ئەم ئایەتەش هەر بە بەڵگە دەهێنرێتەوە:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾ الأحزاب: ٢١.

واتە: بێگومان لە پێغەمبەری خوادا بۆ ئێوە سەرمەشقییەکی باش هەیە.

بەڵێ، زۆر جاران ئەم دوو ئایەتانە بە بەڵگە دێنینەوە، لەسەر ئەوەی، کە مسوڵمان لەسەری پێویستە بەدوای پێغەمبەر بکەوێ و بیکاتە سەرمەشق، ئنجا شوێنکەوتنی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام، زۆربەی خەڵکی زیاتر بەمەفهوومێکی شەخسیی و ئەخلاقیی لێی حاڵی بووە، بەڵام ئەگەر سەرنجی



هەرکام لەم دوو ئایەتە بدەین و، سیاقی ئایەتەکان تەماشا بکەین، شتی دیکەمان دەست دەکەوێ !

بۆ وێنە: ئایەتی یەکەم خوای بەرزو مەزن لە پێشیەوە فەرموویەتی:

﴿لَّا يَتَّخِذِ ٱلْمُؤْمِنُونَ ٱلْكَٰفِرِينَ أَوْلِيَآءَ مِن دُونِ ٱلْمُؤْمِنِينَ ۖ وَمَن يَفْعَلْ ذَٰلِكَ فَلَيْسَ مِنَ ٱللَّهِ فِى شَىْءٍ إِلَّآ أَن تَتَّقُوا۟ مِنْهُمْ تُقَىٰةً ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَإِلَى ٱللَّهِ ٱلْمَصِيرُ ﴿٢٨﴾ قُلْ إِن تُخْفُوا۟ مَا فِى صُدُورِكُمْ أَوْ تُبْدُوهُ يَعْلَمْهُ ٱللَّهُ ۗ وَيَعْلَمُ مَا فِى ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَمَا فِى ٱلْأَرْضِ ۗ وَٱللَّهُ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴿٢٩﴾ يَوْمَ تَجِدُ كُلُّ نَفْسٍ مَّا عَمِلَتْ مِنْ خَيْرٍ مُّحْضَرًا وَمَا عَمِلَتْ مِن سُوٓءٍ تَوَدُّ لَوْ أَنَّ بَيْنَهَا وَبَيْنَهُۥٓ أَمَدًۢا بَعِيدًا ۗ وَيُحَذِّرُكُمُ ٱللَّهُ نَفْسَهُۥ ۗ وَٱللَّهُ رَءُوفٌۢ بِٱلْعِبَادِ ﴿٣٠﴾﴾ آل عمران .

واتە: با بڕواداران کافران لە جیاتی بڕواداران بە دۆست نەگرن و، هەر کەسێك ئەوە بکات، مەگەر خۆتانیان لێ بپارێزن، ئەگەرنا ئەوە هیچ پەیوەندیی بە خواوە نەماوە، وە خوا لەبارەی (سزا)ی خۆیەوە دەتانترسێنێ، وە سەرەنجامیش هەر بۆ لای خوایە.

پێیان بڵێ: ئەگەر ئەوەی لە سینەکانتان دایە، پەنهانی بکەن، یان ئاشکرای بکەن، خوا هەر دەیزانێ، وە هەرچی لە ئاسمانەکان و زەویش دایە، دەیزانێ، وە خوا لەسەر هەموو شتێك توانایە.

ڕۆژێك دێ، کە هەر کەسێك چی لە چاکە کردبێ بە ئامادەکراویی دەیبینێ، وە ئەو خراپەیەش، کە کردوویەتی حەزدەکات ماوەیەکی زۆری لێ دوور بێ، وە خوا لە (سزا)ی خۆیتان دەترسێنێ، وە خوا بەرانبەر بەندە (چاکە)کانی زۆر میهرەبانە.

ئنجا پاش ئەم دوو ئایەتە ئەوجار فەرموویەتی:

﴿قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى يُحْبِبْكُمُ ٱللَّهُ ..﴾ آل عمران: ٣١

ئنجا ئەم ئایەتانە، کە پێکەوە تەماشایان دەکەین بۆمان دەردەکەوێ کە: بەڵێ، مسوڵمان دەبێ دوای پێغەمبەر (صلی الله علیه وسلم) بکەوێ، بەڵام ئایا ئەوە لە چ سیاقێکدا هاتوە؟! وەك خستمانە ڕوو: لە سیاقی باسی دۆستایەتیی کردن



(الموالاة)دا، کەواتە: دەبێ لە دۆستایەتیی کردن و دوژمنایەتیی کردندا، دوای پێغەمبەر بکەوێ، چونکە سیاقی ئایەتەکان ئەوەیە، ئایەتەکان ئاوا دەست پێ دەکەن: با بڕواداران کافران لە جیاتی بڕواداران بە دۆست نەگرن (واتە: پشتیان پێ نەبەستن و، پەیوەندیی و خۆشەویستیی تایبەتییان لەگەڵیان نەبێ) وە هەر کەس دۆستایەتی بگرێ لەگەڵ ئەهلی کوفردا، لە جیاتی ئەهلی ئیمان، ئەوە هیچ پەیوەندیی بە خوای پەروەردگارەوە نامێنێ!

پاشان دوای ئەوە دەفەرموێ: ( قُلْ إِن كُنتُمْ تُحِبُّونَ ٱللَّهَ فَٱتَّبِعُونِى ) واتە: لە دۆستایەتیی کردندا، تەنیا ئەهلی ئیمان بە دۆستی خۆتان بزانن، ئا ئەوە شوێنکەوتنی پێغەمبەرە علیه الصلاة والسلام، مەبەستمان ئەوەیە: ئێستا بابایەکی مسوڵمان دەبینی، تەماشا دەکەی ڕەنگە لە ڕووی سیاسییەوە، گوێ نەداتێ سەر بە چ حیزبێکە، بەڵام زۆر بیر لەوە دەکاتەوە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام سیواکی کردوە، ئەویش سیواك بکا، ئەویش ڕیشی وەك ڕیشی وی بێ، ئەخلاقی شەخسی وەك هی وی بێ، بەڵام لە ڕووی سیاسییەوە سەر بەکێ بێ و سەر بەکێ نەبێ و، دۆستایەتیی لەگەڵ کێ دا بکا و، دوژمنایەتیی لەگەڵ کێ دا بکا؟!، ڕەنگە گوێی لەوە نەبێ! بەڵام تەماشا دەکەین: خوای کاربەجێ، کە باسی شوێن کەوتنی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام دەکات، وای باس دەکات، کە ئەو لەگەڵ کێ دۆست بووە، تۆش لەگەڵ ئەو دۆست بی، وە دوژمنایەتیی کێی کردوە، تۆش دوژمنایەتیی بکەی.

ئنجا ئایەتەکەی سوورەتی (الأحزاب)یش، کە دەفەرموێ:

﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِى رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ لِّمَن كَانَ يَرْجُوا۟ ٱللَّهَ وَٱلْيَوْمَ ٱلْءَاخِرَ وَذَكَرَ ٱللَّهَ كَثِيرًا ﴿٢١﴾ ﴾

واتە: بەڕاستی ئێوە سەرمەشقییەکی چاکتان هەیە لە (هەڵوێست و ئاکاری) پێغەمبەری خوادا، بۆ هەر کەسێك، کە بە هیوای (بەزەیی) خواو (پاداشتی) ڕۆژی دوایی بێت و زۆریش یادی خوا بکات.



سیاقی پێش و دوای ئەویش هەمووی باسی جەنگ و جیهادە و، لەم ئایەتانەوە دەست پێ دەکات:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ ٱذۡكُرُواْ نِعۡمَةَ ٱللَّهِ عَلَيۡكُمۡ إِذۡ جَآءَتۡكُمۡ جُنُودٞ فَأَرۡسَلۡنَا عَلَيۡهِمۡ رِيحٗا وَجُنُودٗا لَّمۡ تَرَوۡهَا ﴾ الأحزاب: ٩.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! یادی چاکەی خوا بەسەر خۆتانەوە بکەنەوە، کاتێك، کە سوپایەك بەسەری دادان ئێمەش (با) و سەربازانێك کە نایانبینن، ناردمانە سەریان.

ئیدی لێرەوە، کە باسی جەنگی (خەندەك) یان (ئەحزاب) دەکات، خوای باڵادەست باسی دەکات و دەیهێنێ و، هەمووی باسی جەنگ و جیهادە و باسی هەڵوێستی مونافیقەکان دەکات، دوایی دەفەرموێ:

﴿ لَّقَدۡ كَانَ لَكُمۡ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسۡوَةٌ حَسَنَةٞ ﴾ الأحزاب: ٢١.

کەواتە: لە ڕاوەستان لە بەرامبەر ئەهلی کوفرداو، لە دیفاع کردن لە دینی خواو لە حورمەتی مسوڵماناندا، لەو بوارەدایە، کە لە پێغەمبەری خوادا سەرمەشقییەکی باش هەیە بۆ ئێوە، چونکە دوای ئەویش یەکسەر دەفەرموێ:

﴿ وَلَمَّا رَءَا ٱلۡمُؤۡمِنُونَ ٱلۡأَحۡزَابَ قَالُواْ هَٰذَا مَا وَعَدَنَا ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥ وَصَدَقَ ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥۚ وَمَا زَادَهُمۡ إِلَّآ إِيمَٰنٗا وَتَسۡلِيمٗا ٢٢ مِّنَ ٱلۡمُؤۡمِنِينَ رِجَالٞ صَدَقُواْ مَا عَٰهَدُواْ ٱللَّهَ عَلَيۡهِۖ فَمِنۡهُم مَّن قَضَىٰ نَحۡبَهُۥ وَمِنۡهُم مَّن يَنتَظِرُۖ وَمَا بَدَّلُواْ تَبۡدِيلٗا ٢٣ ﴾ الأحزاب.

تەماشا دەکەین سیاقەکە هەمووی باسی جەنگ و جیهادە، کەواتە: شوێن پێ هەڵگرتنی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام لە دیفاع کردن لە دینی خوادا، لێرەدا ئەوە مەبەستی هەرە گەورەیە، کەچی ڕەنگە زۆر کەس ئەو ئایەتە بخوێنێتەوە و، هەر ئەوەی بەبیردا نەیەت کە مەبەست پێی کاتی جەنگ و جیهاد و دیفاع کردن لە دینی خواو، ڕاوەستان لە بەرامبەر ئەهلی کوفرو پیڕو تاقمە کافرەکان دایە، ئەوانەی کاتی خۆی ویستوویانە و ئێستاش دەیانەوێ گەلە کۆمەکێ لە دژی ئیسلام بکەن! ئا لەوەدا دەبێ بەدوای پێغەمبەر بکەوی!



ئنجا ئایا ئەو تێگەیشتنەت چۆن چۆنی دەست دەکەوێ؟! دیارە بەوە، کە ئایەتەکان بە یەکەوە ببەستیەوە و بیریان لێ بکەیەوە، دەنا ئەگەر بەیەکیانەوە گرێ نەدەی و، تەنیا ئەم ئایەتە بێنی: ﴿ لَّقَدْ كَانَ لَكُمْ فِي رَسُولِ ٱللَّهِ أُسْوَةٌ حَسَنَةٌ ﴾، مرۆڤ وا دەزانێ کە مەبەست پێی ئەوەیە کە لە ڕووی ڕیش هێشتنەوەوە، وەك پێغەمبەر بکەی علیه الصلاة والسلام، یان لە سیواك کردندا! کە بێگومان لێرەدا مەبەستی سەرەکیی ڕیش و سیواك نیە و[1]، مەبەست جیهاد کردن و دیفاع کردنە لە دینی خواو، ڕاوەستانە لە بەرانبەر ئەهلی کوفردا و بە چۆك دا نەهاتن و، سەنگەر چۆڵ نەکردنە، لەوەدا دەبێ وەك پێغەمبەر بکەی.

**چاوتان لێیە بەڕێزان!** کەواتە: ڕاستە ئەگەر لە قورئان بیر نەکەینەوە، بەحەقیقەت هەر تێگەیشتنێکی ڕووکەش و سەرکێڵمان دەبێ، وە ئەگەر ئایەتەکانی پێکەوە نەبەستینەوە و بەیەکەوەیان گرێ نەدەین و، تەماشای سەرەتاو کۆتاییان نەکەین، زۆر مەبەست، کە خوای پەروەردگار مەبەستی بوون و، زۆر ڕاستییمان، دەستناکەون.

هەڵبەتە هەر بۆیەشە، کە خوای کاربەجێ هێندە بە جەختکردنەوە، فەرمانی کردوە بە تێفکرین و لێوردبوونەوەو سەرنج دانی قورئان، چونکە بە ڕاستی تەنیا لە ئەنجامی سەرنج دان و تێفکرینی قووڵ دا، بە شێوەیەکی ڕاست و دروست لە کتێبی خوا تبارك وتعالی تێدەگەین، ئەگەرنا هەر قسەیەك بێنە، باچاکترین و ڕاستترین مەبەستیشی گرتبێتە خۆی، کاتێك، کە هەر بە سەرکێڵیی تەماشای دەکەی و لێی ورد نابیەوە، یاخود لەجیاتی پێکەوە بەستنەوەی بڕگەکانی لە یەکیان دەپچڕێنی، ئەوە تەنانەت ئەگەر کەلامی ڕاست و بێ وێنەی خواش بێ، ماناو مەبەستێکی هەڵە بەدەستەوە دەدات، بۆ نموونە:

﴿ يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقْرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ وَأَنتُمْ سُكَٰرَىٰ حَتَّىٰ تَعْلَمُواْ مَا تَقُولُونَ ﴾ النساء:٤٣.

---

(١) هەرچەندە لە ڕیش هێشتنەوەو سیواک کردنیشدا، شوێنکەوتنی پێغەمبەری خوا (صلى الله عليه وسلم) هەر سوننەتە و پاداشتی هەیە.



واته‌: ئه‌ی ئه‌وانه‌ی بڕواتان هێناوه‌! به‌سه‌رخۆشیی توخنی نوێژ مه‌كه‌ون، تاكو بزانن چی ده‌ڵێن.

ئێستا ئه‌م ڕسته‌ قورئانییه‌، كه‌ به‌سه‌ر یه‌كه‌وه‌ باشترین مه‌به‌ست ده‌گه‌یه‌نیٚ، وه‌ره‌ تۆ لێكی بپچڕێنه‌ و ڕسته‌ی: (يَٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ لَا تَقۡرَبُواْ ٱلصَّلَوٰةَ) بڵیٚ و ڕسته‌ی (وَأَنتُمۡ سُكَٰرَىٰ)ی لیٚ بقرتێنه‌، ماناكه‌ی هه‌ڵه‌ ده‌رده‌چیٚ!

یـــــان:

﴿فَوَيۡلٞ لِّلۡمُصَلِّينَ ۝٤ ٱلَّذِينَ هُمۡ عَن صَلَاتِهِمۡ سَاهُونَ ۝٥ ٱلَّذِينَ هُمۡ يُرَآءُونَ ۝٦﴾ الماعون.

واته‌: سزای سه‌خت بۆ نوێژكه‌رانێك، كه‌ له‌ نوێژه‌كانیان بیٚ ئاگان، ئه‌وانه‌ی ڕووپامایی ده‌كه‌ن.

ئه‌گه‌ر یه‌كسه‌ر ئایه‌ته‌كه‌ی دوای خۆی له‌گه‌ڵ نه‌خوێنیه‌وه‌، هه‌ڵه‌ ده‌رده‌چیٚ و ده‌بێته‌ (سزای سه‌خت بۆ نوێژكه‌ران) به‌ڵام بێگومان خوای زانا وای نه‌فه‌رمووه‌، به‌ڵكو فه‌رموویه‌تی: (سزای سه‌خت بۆ نوێژكه‌رانی كه‌مته‌رخه‌می ڕیاباز).



## سێیەم: چەکداربوونی عەقڵ بە زانیاریی و شارەزایی:

ئنجا پێویستە ئەوەش بگوترێ کە: تێگەیشتنی قورئان، پێویستی بە زانیاریی و شارەزایی دەکات و، تەنیا بەوە مەدارمان ساز نابێ، عەقڵ بەکاربێنین، بەڵکو دەبێ ئەو (عقل)ە، چەکدار (مُسلَّحْ) بێ بە زانراوەکان (معلومات) و هەتا ئەو عەقڵە دەوڵەمەند تر بێ بە زانیاریی و شارەزایی، زیاتر دەتوانێ لە قورئان ورد بێتەوە، ئەگەرنا کەسێك، کە هیچ شارەزای زمانی عەرەبیی نەبێ، هەزار ساڵ بیر لە قورئان بکاتەوە، لێی تێناگا، چونکە کلیلەکەی بەدەستەوە نیە، کە بریتیە لە زمان، بۆیە دەبێ لە زمانی عەرەبیی دا شارەزا بێ و، هەتا زیاتریش لە زمانی عەرەبی و بەتایبەت لە بواری ڕەوانبێژیی (بلاغة)دا شارەزا بێ، زێتر لە نهێنییەکانی قورئان تێ دەگات.

بەڵێ بۆ حاڵی بوونی قورئان، شارەزایی لە زماندا پێویستە، دەنا ئەگەر عەقڵ بە تەنیا بەکاربێنێ و بە چەکی شارەزایی چەکدار نەبێ، ئەوە بێگومان بە تەنیا هیچی پێ لەگەڵ قورئان ناکرێ، ئەوە یەك، دووەمیش هەبوونی زانراوەکان (معلومات)، ئنجا لەهەر ڕوویەکەوە بتەوێ لە قورئان تێبگەی دەبێ شارەزاییت لەو بوارەدا هەبێ:

١- ئەگەر بتەوێ لە ڕووی فیزیا و گەردووناسییەوە، لە قورئان تێبگەی، دەبێ شتێك دەربارەی فیزیا و گەردووناسیی بزانی.

٢- وە ئەگەر بتەوێ دەربارەی لایەنی پزیشکیی لە قورئان تێبگەی، دەبێ شتێك دەربارەی زانستی پزیشکیی (علم الطب) بزانی.

٣- وە ئەگەر بتەوێ دەربارەی کۆمەڵناسیی و یاساکانی خوای پەروەردگار لە ژیانی بەشەردا شارەزا بی، دەبێ شارەزای کۆمەڵناسیی بی.

٤- وە ئەگەر بتەوێ دەربارەی ڕاستییەکانی مێژوو لە قورئان تێبگەی، دەبێ شارەزای مێژوو بی.. وە هەروەها.



بەڵێ بە ئەندازەی ئەوە، کە ئینسان مەعلووماتی فراوانی هەیە، چاکتر و قووڵتر لە قورئان تێدەگات، بۆیەش خوای زاناو پەنهانزان فەرموویەتی:

﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: ئەم وێنانە دێنینەوە بۆ خەڵکی، بەڵام تەنیا زاناکان لێیان تێ دەگەن.

دیارە لە ئایەتی پێشتردا باسی جالجالۆکە دەکات و دەفەرموێ:

﴿ مَثَلُ ٱلَّذِينَ ٱتَّخَذُوا۟ مِن دُونِ ٱللَّهِ أَوْلِيَآءَ كَمَثَلِ ٱلْعَنكَبُوتِ ٱتَّخَذَتْ بَيْتًا ۖ وَإِنَّ أَوْهَنَ ٱلْبُيُوتِ لَبَيْتُ ٱلْعَنكَبُوتِ ۖ لَوْ كَانُوا۟ يَعْلَمُونَ ﴿٤١﴾ ﴾ العنكبوت.

واتە: وێنەی ئەوانە، کە جگە لە خوا دۆست و پشتیوانانی دیکە دەگرن، وەك جاڵجاڵۆکەیە، کە ماڵ دروست دەکات و، بێگومان بێهێزترین ماڵیش ماڵی جاڵجاڵۆکەیە، ئەگەر بزانن.

دوای ئەوە دەفەرموێ:

﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَٰلِمُونَ ﴿٤٣﴾ ﴾ العنكبوت

ئنجا ئێستا دەرکەوتوە، کە ژیانی جاڵجاڵۆکە زۆر جێی پەند و عیبرەتە و، خوای کاربەجێ بۆیە کەسێك کە: پەنا دەباتە بەر جگەلە خوا، وە جگەلە خوا بە دۆست دەگرێ، تەشبیهی کردوە بەو زیندەوەرانەی، کە پەنا دەبەنە بەر ماڵی پیرەمۆتە[1]، چونکە وەك زانایانی زیندەوەرناس پاش لێکۆڵینەوەیان لە ژیانی جاڵجاڵۆکە دەڵێن: ماڵی جاڵجاڵۆکە کانگایەکی بێرەزای هەراو، گێژاوێکی سامناکی بێ سەرەوبەرەیی (فوضا)یە، چونکە شوێنی سەر تێدا بەفەتارەت چوونە، نەك تەنیا بۆ ئەو مێش و مەگەزانەی هەڵدەخەڵەتێن و ڕووی تێ دەکەن، بگرە بۆ ئەندامانی ماڵی جاڵجاڵۆکە خۆشیان.

کەواتە: ئەم نموونەیەی قورئان کاتێك لێی تێدەگەی، کە بزانی ژیانی جاڵجاڵۆکە چۆنە، بۆیەش خوای زانا دەفەرموێ: ئەوەی زانا (عالم) نەبێ و شارەزانەبێ، لە: وێنە هێنانەوە (ضرب المثل)ەکانی قورئان، تێناگات.

---

(١) پیرەمۆتە: جاڵجاڵۆکە.



وە خوای بەرزو بێ وێنە هەر لەو بارەوە دەفەرموێ:

﴿ وَيَرَى ٱلَّذِينَ أُوتُواْ ٱلْعِلْمَ ٱلَّذِيٓ أُنزِلَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ هُوَ ٱلْحَقَّ وَيَهْدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطِ ٱلْعَزِيزِ ٱلْحَمِيدِ ۝٦ ﴾ سبأ.

واتە: ئەوانەی زانیارییان پێدراوە، دەزانن کە ئەوەی بۆ تۆ نێرراوە لە پەروەردگارتەوە، ئەوە حەقە، وە خەڵك ڕێنمایی دەکات بۆ ڕێبازی خوایەکی زاڵی ستایش کراو.

## بە گوێرەی ئەم ئایەتە:

کێ دەزانێ، کە قورئان حەقە؟ ئەوەی، کە زاناو شارەزایە، کەواتە: ئینسان تاکو زانیاریی زیاتر بێ، باشتر ڕاستیێتیی قورئانی بۆ دەردەکەوێ، واتە: بەبێ زانیاریی (علم) ئینسان لە قورئان تێناگاو، لە نهێنییەکانی قورئان حاڵی نابێ، وە لە حیکمەت و ڕاستییەکانی بەهرەمەند نابێ.



چوارەم: ئیمانێکی باش بە خوا و پەیوەندییەکی چاك لەگەڵیدا، کە لە عیبادەت و تەقوا و تەزکیە و.. هتد دا بەرجەستە دەبێ:

چونکە هەتا ئینسان لە کەسێك نزیکتر بێ، چاکتر لە قسەی تێدەگا، واتە: جگە لە فەرمایشتی خوای بەرز و مەزنیش، کەسێك ئەگەر زۆر شارەزای بی و لێی نزیك بی و، تێکەڵاوی ژیانی بی، چاکتر لە قسەی تێدەگەی، لە کەسێ، کە نایناسی و پێی ئاشنا نی، چونکە ئەوەی دەیناسی، پێکەوە ڕاهاتوون و کۆمەڵێك زاراوەتان بەکارهێناون، یان لە سروشتی یەکدی شارەزاترن و، لەوانەیە هەر لە ئیشارەتێکی یەکدی حاڵی بن!.

کەواتە: (ولله المثل الأعلى) ئینسانیش تاکو لە خوا نزیکتر بێ، چاکتر لە فەرمایشتەکەی تێدەگات، ئنجا ئایا چۆن ئینسان لە خوا نزیك دەبێتەوە ؟!، خۆ خوا (جل شأنە) هیچ نەسەب و پەیوەندییەکی لەگەڵ خەڵکی دا نیە، جگە لەوە، کە بەندایەتیی بۆ بکەن، ئەگەرنا خەڵك هەمووی بۆ خوا وەك یەکە و، هەمووی دروستکراوی خوایە و، کێ بەندەی چاکتر بێ بۆ خوا، لە خوا نزیکترە، وەك فەرموویەتی:

﴿إِنۡ أَوۡلِيَآؤُهُۥٓ إِلَّا ٱلۡمُتَّقُونَ ...﴾ الأنفال: ٣٤.

واتە: دۆستەکانی خوا بەس پارێزکارانن.

کێ دۆستی خوایە و لە خوا نزیکە؟ ئەوەی، کە زیاتر پارێزکار بێ، زیاتر پابەندبێ بە شەریعەتی خوای پەروەردگارەوە، بنچینەی پارێز و عیبادەتیش بریتیە لە ئیمان بە خوا (جل شأنە)، وە عیبادەت و تەقواش لە ڕاستی دا هەردووکیان بەرهەمی ئیمانن.

کەواتە: ئەگەر ئینسان بیەوێ باش لە قورئان تێ بگا، دەبێ هەوڵبدا ئیمانێکی باشی هەبێ، بە واتایەکی دی: پەیوەندییەکی توندو تۆڵ و گەرم و گوڕی لەگەڵ خوای پەروەردگاردا هەبێ، هەتا پەیوەندییمان لەگەڵ خوادا قایم تر بێ، پەیوەندیی عەبدایەتیی بۆ خوا، ئیمان بە خوا، تەقوا بۆ خوا، تەزکیەی نەفس، بۆ خوا سوڵحان، ئەوە بێگومان چاکتر لە کەلامی خوای پەروەردگار تێدەگەین.



**لێرەدا دەمەوێ پێتان بڵێم:** ئێوە وا تێنەگەن ئەو هاوەڵە بەڕێزانەی پێغەمبەر خوا لێیان ڕازی بێ، ئەوانیش هەر بەقەدەر ئێمە لە قورئان تێگەیشتوون، چونکە ئینسان جاری وا هەیە حاڵەتێکی ڕووحیی وای هەیە، کاتێك سوورەتی (الفاتحة) دەخوێنێ، هێندەی مەعلوومات و نهێنیی و ڕووناکیی دێنە عەقڵ و دڵەوە، پێی سەیرە، کە پێشتر هەر بە فیکری دا نەهاتوون، ئنجا ئایا دەبێ ئەو هاوەڵانە خوا لێیان ڕازی بێ، کە ئیمانێکی زۆر چاکیان هەبووە و، تەقوای زۆر چاك و عیبادەتی زۆر چاك و ئیخلاصی زۆر چاك، وە زۆر خاوەنی نەفسێکی تەزکیەکراو بوون، چەند قووڵترو ڕاستتر لە قورئان تێگەیشتبن!

## ئێستا با نموونەیەکتان بۆ بێنمەوە:

تۆ بە چاوی ڕووت تەماشای گوڵێك دەکەی، هەر گوڵەکە دەبینی، یان تەماشای میوەیەك، یان زیندەوەرێك دەکەی، بەهەمان شێوە، بەڵام بە مایکرۆسکۆب تەماشای بکە، شتی زۆر عەجایب دەبینی، یان دڵۆپە ئاوێك ئەگەر بە زەڕەبین سەرنجی بدەی، چەندان زیندەوەری تێدان.

ئنجا ئێمەش ئەگەر هەر بە عەقڵێکی ئاسایی تەماشای قورئان بکەین، شتی کەم تێدا دەبینین، بەڵام ئەگەر بە عەقڵێکی چەکدار بە ئیمانێکی باش، بەعەقڵێکی منەووەر و هۆشیار بە زانست تەماشای بکەین، ئەو کاتە تێگەیشتنمان بۆ کەلامی خوای بێ وێنە، زۆر جیاواز دەبێ لەوەی پێشێ.

ئەوەش، کە باسمانکرد، خوای بە بەزەیی زۆر بە ڕوونیی بەیانی کردوە، کە مرۆڤ تاکو زیاتر ئەهلی تەقوا بێ و، زیاتر ئەهلی ئیمان بێ، زیاتر لە تێگەیشتنی قورئان بەهرەمەند دەبێ:

١- وەك خوای بەخشندە لە سەرەتای سوورەتی (البقرة)دا دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكَ ٱلۡكِتَٰبُ لَا رَيۡبَۛ فِيهِۛ هُدٗى لِّلۡمُتَّقِينَ ٢ ﴾ .

واتە: ئەم قورئانە گومانی تێدانیە ڕێپیشاندەرە بۆ پارێزکاران.

دیارە قورئان بۆ هەموو بەشەر هاتوە:



﴿...إِنۡ هُوَ إِلَّا ذِكۡرٞ لِّلۡعَٰلَمِينَ ١٠٤﴾ یوسف.

واتە: (قورئان) جگە لە بیرخەرەوە بۆ هەموو جیهانییان شتێکی دیکە نیە، بەڵام لێرەدا هیدایەتەکەی تایبەت کردوە بە ئەهلی تەقواوە، واتە: تەنها ئەهلی تەقوا ڕێی پێ دەردەکەن و بەرپێی خۆیانی پێ دەبینن، بۆچی؟ چونکە مرۆڤ بەبێ تەقواو، پارێز، وەك پێویست لە قورئان بەهرەمەند نابێ، ڕواڵەتەکەی دەبینی، بەڵام پێیدا قووڵ نابێتەوە.

٢-هەروەها لە سوورەتی یونس ئایەتی (٥٧)دا دەفەرموێ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧﴾ .

واتە: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگارییتان بۆ هاتوە، وە شیفا و چارەسەر، بۆ ئەوەی کە لە دەروونەکاندا هەیە، ئەوە بۆ خەڵکی بەگشتی قورئان ئامۆژگاریی و شیفایە، بەڵام بۆ ئەهلی، ئیمان چییە؟ (وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ )، وە ڕێنماییە وە مایەی ڕەحمەت و بەزەیی خوای بەبەزەییە بۆ بڕواداران.

کەواتە: بۆ خەڵکی، ئامۆژگاریی و شیفایە، بەڵام بۆ ئەهلی ئیمان هیدایەتە و مایەی ڕەحمەت و بەزەیی خوای بەخشەرە.

٣- هەروەها لە سوورەتی (فصلت) لە ئایەتی (٤٤)دا دەفەرموێ:

﴿قُلۡ هُوَ لِلَّذِينَ ءَامَنُواْ هُدٗى وَشِفَآءٞ﴾

واتە: - ئەی موحەممەد! علیه الصلاة والسلام - بڵێ ئەم قورئانە بۆ ئەهلی ئیمان، ڕێنمایی و شیفا و چارەسەرە (بۆ نەخۆشییەکانی، کە لە عەقڵ و دڵیاندا دەبن).

ئەوە بە نسبەت هۆکاری چوارەمەوە، کە جگە لە: بیرلێ کردنەوەی قورئان و، پێکەوە گرێدانی ئایەتەکان و وێکڕاسەرنجدانیان و، هەبوونی شارەزایی و زانیاریی، پێویستیمان بەوەش هەیە، کە ئیمانێکی باشمان هەبێ بۆ ئەوەی چاك لە قورئان تێ بگەین.



پێنجەم: ڕزگاربوونی عەقڵ و دڵمان لە کۆت و بەندی ئەو بیرو بۆچوون و داب و نەریتـانەی، کە خەڵك گیرۆدەیان بوون:

چونکە زۆر جاران ئەو عادەت و بیرو بۆچوون و فیکرانەی دەبنە باوو، ڕەواج پەیدا دەکەن لە نێو خەڵکدا، دەبنە پەردەیەك لە نێوان تۆو تێگەیشتنی قورئاندا، بۆ وێنە: قورئان باسی (عالِمْ) دەکات، ئنجا ئەگە لە مێشکی خۆتدا وا حاڵی بووبی، کە (عالِمْ) یانی (مەلا - مامۆستا)، ئەوەی، کە مەندیلێکی لەسەر بێ و، کەواو سەڵتەیەکی لەبەربێ!

دوایی، کە دەبیستی خوای بەخشندە دەفەرموێ:

﴿ وَتِلْكَ ٱلْأَمْثَـٰلُ نَضْرِبُهَا لِلنَّاسِ ۖ وَمَا يَعْقِلُهَآ إِلَّا ٱلْعَـٰلِمُونَ ﴾ العنکبوت: ٤٣.

وا تێدەگەی کە: مانای وایە: بەس مەلایەکان لە وێنە هێنانەوەکانی قورئان تێدەگەن! بەڵام بێگومان ئەو تێگەیشتنە غەڵەتە لە خۆتەوەیە و، خوای پەروەردگار باسی (مەلا)ی نەکردووە، باسی زانا (عالِم)ی کردوە[1]، (عالِم)یش لێرەدا واتە: شارەزا بەو شتەی، قسەی لەبارەوە دەکرێ، چونکە وشەی (عالِم) لە قورئاندا بە پێی شوێنەکە مانای دەگۆڕێ و، دەزانرێ مەبەست پێی چ جۆرە زانایەکە.

بۆ وێنە: لە سوورەتی (فاطر)دا، کە دەفەرموێ:

﴿ .. إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَـٰٓؤُا۟ .. ﴾ فاطر: ٢٨.

مەبەست پێی عالمێکە، کە شارەزایە بە بوونەوەرو نیشانەکانی خواو دروستکراوەکانی، بۆچی؟ چونکە ئەم ڕستە قورئانییە: (.. إِنَّمَا يَخْشَى ٱللَّهَ مِنْ عِبَادِهِ ٱلْعُلَمَـٰٓؤُا۟ .. ). واتە: تەنیا بەندە زانایەکان لە خوا دەترسێن، لەدوای ئەوە هاتوە، کە دەفەرموێ:

﴿أَلَمْ تَرَ أَنَّ ٱللَّهَ أَنزَلَ مِنَ ٱلسَّمَآءِ مَآءً فَأَخْرَجْنَا بِهِۦ ثَمَرَٰتٍ مُّخْتَلِفًا أَلْوَٰنُهَا ۚ وَمِنَ ٱلْجِبَالِ

---

(١) هەڵبەتە لێرەدا مەبەستمان ئەوە نیە کە (مەلا) زاناو شارەزا نیە، هەرچەندە لەم ڕۆژگارەدا مەلای نەزانیشمان هەن، بەڵکو مەبەستمان ئەوەیە کە خوا عزوجل باسی زانایان و شارەزایانی ژیانی جاڵجاڵۆکەی کردوە، کە مەرج نیە مەلا و مامۆستا بن.



جُدَدُۢ بِيضٌ وَحُمۡرٌ مُّخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهَا وَغَرَابِيبُ سُودٌ ﴿٢٧﴾ وَمِنَ ٱلنَّاسِ وَٱلدَّوَآبِّ وَٱلۡأَنۡعَٰمِ مُخۡتَلِفٌ أَلۡوَٰنُهُۥ كَذَٰلِكَ ﴾

ئنجا فەرموویەتی: (.. إِنَّمَا يَخۡشَى ٱللَّهَ مِنۡ عِبَادِهِ ٱلۡعُلَمَٰٓؤُاْ.. ) فاطر. واتە: (سەرنج نادەی! چۆن خوا ئاوی لە ئاسمانەوە (واتە: لە بەرزییەوە) ناردۆتە خواری، ئنجا چەندان میوەی ڕەنگ جیا جیامان پێ دەرهێناون، وە لە چیاکانیش هێڵی سپی و سووری ڕەنگاوڕەنگ و ڕەشی تۆخ. هەروەها خەڵك و ئاژەڵ و ژیاندارانیش ڕەنگاوڕەنگن، بێگومان تەنیا بەندە زانایەکانی خوا، لێی دەترسن..).

کەواتە: مەبەست لەزانایان (علماء ) لێرەدا ئەوانەن، کە زانا (عالم)ن بە سروشت، بە بوونەوەرو دروستکراوەکانی خوا و بە چۆنیەتی باران بارین و، ڕووانی دارو درەخت، زانا و شارەزا لە بوارەکانی زەویناسیی و زیندەوەرزانیی و...هتددا.

کەواتە: دەبێ بزانین، کە وشەی (عالِمْ) یان (عِلمْ) بە پێی سیاقی ئەو ئایەتە، کە تێیدا هاتوە، مانایەکەی دەزانرێ، کە ئایا مەبەست پێی چ جۆرە (عالِمْ)ێکە و، چ جۆرە (علم)ێکە؟ مەبەستم ئەوەیە، کە لە زەینی ئێمەدا وشەی (مەلا) لەگەڵ وشەی (عالم)دا پێکەوە بوون بە هاوواتا (مترادف)و، ئیدی بەهۆی ئەو غەڵەتە وە، ئەو کاتە تۆ دەڵێی: باشە بۆچی ئەو مامۆستایە ئەو (ضرب المثل)ەی خوێندۆتەوەو لێشی حاڵی نەبووە؟! کەچی قورئانیش دەفەرموێ: (وَمَا يَعۡقِلُهَآ إِلَّا ٱلۡعَٰلِمُونَ)، ئەوەتا ئەو (مەلا)یەش (عالم)ەو، لێشی تێنەگەیشتوە!! دەبێ خوای کاربەجێ بۆچی وای فەرمووبێ؟! لێرەدا دەکەویە گومانەوە!!

بەڵام، کە زانیت (عالِمْ) لێرەدا یانی ئەوەی (عالِمْ)ە بە ژیانی جاڵجاڵۆکە و دەبێ تێبگا، کە لە ماڵەکەی دا چ باسە؟ کە لێرەدا بوارمان نیە باسی بکەین، کە چ هەراو فەوزایەکی تێدایە، خوای مەزن بۆچی کەسێ پەنا دەباتە بەر جگەلە خۆی و جگەلە ئیسلام، دەی شوبهێنێ بەو زیندەوەرە بێعەقڵە، کە پەنا دەباتە بەر تەونی جاڵجاڵۆکە و، ئەویش ورد و باریك لەوێ دەیخواو، تەڕاییەکەی تێدا دەمژێت و، دوایی وەك کەلاکێکی بێ ڕووح، بە تەونەکەی خۆیەوە هەڵی دەواسێ و.. هتد، بەڵێ کەسێ لەوە تێدەگا، کە لە ژیانی جاڵجاڵۆکە حاڵی بێ و زیندەوەرزانیی خوێندبێ و، بزانێ لە ماڵی جاڵجاڵۆکەدا چ باسە؟!



بەڵێ، دەبێ زەینی خۆمان و دڵی خۆمان ڕزگار بکەین، لەو زانراوە هەڵانەی، کە لە نێو خەڵکی دا باون، دیارە ئەویش خوای بەرزو بێ وێنە زۆر بە ڕاشکاویی و ڕوونی کردۆتەوە، بۆ وێنە فەرموویەتی:

﴿ وَإِذَا قَرَأْتَ ٱلْقُرْءَانَ جَعَلْنَا بَيْنَكَ وَبَيْنَ ٱلَّذِينَ لَا يُؤْمِنُونَ بِٱلْءَاخِرَةِ حِجَابًا مَّسْتُورًا ﴿٤٥﴾ وَجَعَلْنَا عَلَىٰ قُلُوبِهِمْ أَكِنَّةً أَن يَفْقَهُوهُ وَفِىٓ ءَاذَانِهِمْ وَقْرًا ۚ وَإِذَا ذَكَرْتَ رَبَّكَ فِى ٱلْقُرْءَانِ وَحْدَهُۥ وَلَّوْا۟ عَلَىٰٓ أَدْبَٰرِهِمْ نُفُورًا ﴿٤٦﴾ ﴾ الإسراء.

واتە: کاتێك، کە قورئان دەخوێنیەوە - ئەی موحەممەد! صلی الله علیه و سلم - لە نێوان تۆو ئەو کەسانەدا، کە بڕوایان بە خواو بە ڕۆژی دوایی نیە، پەردەیەکی داپۆشراومان داناوە، وە لەسەر دڵیشیان کیفمان داناوە، بۆ ئەوەی لێی تێ نەگەن. لە گوێشیاندا قورساییمان داناوە. (قوڕقوشمیشمان بەگوێدا کردوون، بۆ ئەوەی هەر هیچ نەبیستن). وە کاتێك، کە بە تەنیا باسی پەروەردگارت دەکەی، ئەوانە پشت هەڵدەکەن و دوور دەکەونەوەو دەسڵەمنەوە.

خوای پەروەردگار سێ ئامێری داوە ئینسان، بۆ ئەوەی دەرکی شتیان پێ بکا: چاو بۆ بینین، عەقڵ بۆ تێگەیشتن، گوێ بۆ بیستن.

ئنجا لێرەدا خوای کاربەجێ باسی ئەو کافرانە دەکات، کە لە ئەنجامی کوفرو یاخیبوونیانەوە، دەیانشوبهێنێ بە کەسانێك کە: پەردە بەسەر چاویان هەڵکشاوە و، عەقڵیان جامکراوەو خراوەتە نێو کیفێکەوەو داخراوە، قورقوشمیشیان بەگوێدا کراوە! ئیدی سەرەنجام نە دەبینن، نە تێدەگەن، نە دەبیستن.

ئنجا ئایا لێرەدا مەبەست لەو تەعبیرە چییە؟ یانی: ئەو بیرو بڕوا پووچ و هەڵەو عادەت ونەریتە نەفامییانەی، کە هەیان بوون، لێیان بۆتە پەردەو قوڕقوشم و بەرگ و کیف و، عەقڵ و چاوو گوێیان لە کار خستوون.

کەواتە: ئینسان هەتا خۆی لە بیرو بۆچوونە هەڵەکان و کلتووری سەقەت ڕزگار نەکاو، وا لە خۆی نەکات، کە نەکەوێتە ژێر کاریگەریی هیچ فیکرێك و هیچ عەقیدەیەك و هیچ داب و نەریتێك و، ئازاد نەبێ، ناتوانێ باش لە قورئان تێ بگا.



**ئێستاش لە کۆتایی ئەم دەرسەمان دا، بە کورتی هۆکارە گرنگەکانی چاک لێ تێگەیشتنی قورئانتان، کە باسمان کردن، دەخەمەوە بەرچاو:**

١- تێفکرین و لێوردبوونەوەی یەك یەکی پیت و وشەو بڕگەو ڕستەو ئایەتەکان و، هەڵوەستەکردن لە بەرانبەریاندا.

٢- پێکەوەو وێکڕا سەرنج دان و تێوەڕامانی هەموو ئەو ئایەتانەی، کە لەبارەی بابەتێکەوە دەدوێن، واتە: سەرنج دانی ئایەتەکان لەو سیاقەدا، کە تێیدا هاتوون و، لێوردبوونەوەی ئایەتەکانی پێش و دوای و، پێکەوە گرێدانیان.

٣- خۆ چەکدارکردن بە زانیاریی و شارەزایی جۆراوجۆر، لە هەموو بوارەکانی زانستدا.

٤- ئیمان و تەقواو تەزکیەو لە خوا نزیکبوونەوەی زیاتر و، بەندایەتیی تۆختر بۆ خوا سبحانە وتعالی، چونکە بە ئەندازەی نزیکییمان لە خوا، لە فەرمایشتەکەی تێدەگەین.

٥- خۆ دەربازکردن لە فشارو کاریگەریی هەر جۆرە بیروبۆچوون وعادەت و نەرێت و، هەڵوێستێکی لە نێو کۆمەڵگادا باوو بەمیرات گیراو، یان پێش وەخت دەستنیشانکراو و تەبەننیی کراو.

بەڕێـــزان!

ئەوە پوختەی وانەی سێیەم بوو، کە وەك گوتمان، ئینسان بۆ ئەوەی لە قورئان تێبگا، دەبێ بیری لێ بکاتەوەو لێی ورد بێتەوەو پێیدا قووڵ بێتەوە، بەو شێوەیەی باسمان کرد.

خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە یارمەتییان دەدات و تەوفیقیان دەدات، کە وەك بۆ خۆی فەرمانی پێ کردوە، ئاوا بەو شێوەیە لە قورئان ورد دەبنەوە و تێوەی ڕادەمێنن، وە خوا عز وجل ئەو هۆکارانەشمان بۆ ئاسان بکات، کە مایەی چاك لێتێگەیشتنی کتێبی بەرزو بەڕێزینی. ئـــامـــین.

وصلَّى الله على محمد وآله وصحبه أجمعين

والحمد لله رب العالمين



وانەی چوارەم

## هەنگاوی چوارەم:

# کارتێکران و پەند وەرگرتن

## (التأثر والتذكر)

بەڕێـــزان !

ئەم وانەیەمان وانەی چوارەمە لە زنجیرە وانەی: (چۆن باشتر لە قوڕئان بەهرەمەند دەبین؟!). لە سێ وانەی ڕابردوودا باسی سێ هەنگاومان کرد، لە هەنگاوەکانی چۆنیەتی هەڵس و کەوتکردن لەگەڵ قوڕئانی بەڕێزدا، لێرەشدا باسی هەنگاوی چوارەم دەکەین، هەنگاوی چوارەمی هەڵس و کەوتکردنی ڕاست و دروست لەگەڵ قوڕئاندا، بریتیە لە: (کارتێکران و پەند وەرگرتن) کاتێك، کە قوڕئان دەخوێنی، یان بەسەرتدا دەخوێنرێتەوە، دەبێ وات لێ بکات کارت تێ بکا و، پاشان پەندی لێ وەربگری و، سوودی لێ ببینی و، لێی بەهرەمەند بی.

لە سەرەتاوەش دەڵێین: هەرکاتێك ئەو سێ هەنگاوەی ڕابردوو، بە شێوەی ڕاست و دروست نران، بۆ چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ قوڕئاندا واتە: هەنگاوی یەکەم، کە بریتی بوو لە ئەدەب نواندن و ڕێز و قەدرگرتنی قوڕئان (التأدب و التعظيم)، هەنگاوی دووەم، کە بریتی بوو لە خوێندنەوەی قوڕئان و گوێ بۆ گرتنی (التلاوة و الإستماع)، وە هەنگاوی سێیەم، کە بریتی بوو لە بیر لێ کردنەوەی قوڕئان و لێ ورد بوونەوە و پێدا قووڵ بوونەوەی، هەرکاتێك



ئەم سێ هەنگاوەی پێشوو، بە شێوەیەکی ڕاست و دروست بۆ چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ قورئاندا، نران، ئەوە هەنگاوی چوارەم بەرهەم دێنن.

واتە: ئەم هەنگاوی چوارەمە، بەرهەم و ئەنجامی سێ هەنگاوی پێشووە، چونکە ئەگەر ئینسان بە ڕاستی ئەدەبی هەبێ بەرانبەر بە کتێبی خوا و، بزانێ ئەم کتێبە فەرمایشتی کێیە؟ پاشان قەدر و ڕێزی تایبەتی لێ بنێ و، قورئان لە دڵی دا بەگەورەگیراو (مُعَظَّم) بێ و بەڕێز (مُحْتَرَم) بێ و، دواییش بیخوێنێ و گوێی بۆ بگرێ، بەو شێوەیەی، کە شەرع فەرمانی پێ کردوە و، پاشان بیری لێ بکاتەوە و تێیەوە ڕابمێنێ و پێیدا قووڵ بێتەوە، وەك لە ڕابردوودا باسمان کرد، ئەوە ئەم هەنگاوەی چوارەم، کە بریتیە لە کارتێکرانی ئیجابیی و بەهرە وەرگرتن لە قورئان، دێتە دی، ئێستاش با هەندێك پێناسەی هەرکام لە کارتێکران (تأثُّر) و پەندوەرگرتن (تذكُّر) بکەین.

## پێناسەی کارتێکران (تأثُّـر) و پەندوەرگرتن (تذكُّـر)

مەبەستمان لە کارتێکران ئەوەیە، کە بکەوینە ژێر کاریگەریی و تاووتینی ئەو شتانەی، کە کتێبی خوا باسیان دەکات، بۆ نموونە: کتێبی خوا باسی خوا سبحانە و تعالی دەکا، باسی بەدیهێنەرایەتیی خوا دەکات، باسی پەروەردگاریێتیی خوا دەکات، باسی پەرستراویێتیی خوا دەکات، باسی خاوەنداریێتیی خوا دەکات، وە باسی ناو و سیفەتە بەرزەکانی خوای بێ وێنە و هاوەڵ دەکا، وەك: بەزەیی خوا، حیکمەتی خوا، بەخششی خوا، عیززەتی خوا، زانیاریی خوا، توانای خوا، خواست و ویستی خوای پەروەردگار سبحانە و تعالی، وە قورئان باسی کردەوەکانی خوای باڵادەست دەکات، وە باسی کاروباری خوای میهرەبان لە بوونەوەردا دەکات، وەك فەرموویەتی:

﴿ يَسْـَٔلُهُۥ مَن فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِۚ كُلَّ يَوۡمٍ هُوَ فِي شَأۡنٖ ٢٩ ﴾ الرحمن.

وە باسی حاکمیەتی خوا دەکات بەسەر هەموو شتێکدا.



وە دوایی باسی ئەو سەرەنجامە دەکات، کە خوای کاربەجێ دایناوە بۆ مرۆڤ و جند، کە لە ڕۆژی دوایی دا چاوەڕێیان دەکات و، لە بەهەشت و دۆزەخدا خۆی دەبینێتەوە، ئنجا قورئان خوێنی ڕاستەقینە، کارلێك (تفاعل) لەگەڵ هەموو ئەم ڕاستییانەدا دەکات و کاری تێدەکەن، بەڵێ کارتێکران بە قورئان، چ بیخوێنی چ بەسەرتدا بخوێندرێ، ئەوەیە، کە پێی کارتێکراو (منفعل) بی و کارت تێ بکا.

(محمد إقبال) خوا لێی خۆش بێ لەو بارەوە وتەیەکی جوانی هەیە، دەڵێ: (من بچووك بووم، بابم ئامۆژگاریی کردم و گوتی: ڕۆڵە گیان! کە قورئان دەخوێنی وا بزانە، کە خوای پەروەردگار ئەم قورئانەی بەتایبەتیی بۆ تۆ ناردۆتە خوار، کە دەفەرموێ: (يا أيها الذين آمنوا)، بزانە کە بەتایبەتیی لەگەڵ تۆیەتی).

ئنجا لەڕاستی دا هەرواشە، چونکە تۆ خۆت بە ئیماندار دەزانی، خوای پەروەردگاریش دەفەرموێ: (ئەی ئیماندارینە!)، تۆش یەکێکی لە ئیمانداران، کەواتە لەگەڵ تۆیەتی، مادام خۆت بە ئیماندار دەزانی، لەگەڵ تۆیەتی، بەڵام بێگومان قورئان تایبەت نیە بە بڕوادارانەوە، بەڵکو وێڕای بڕواداران لەگەڵ هەموو بەشەریش دا دەدوێ، چونکە، کە دەفەرموێ: (يا أيها الناس) ئەی خەڵکینە! تۆش هەر چۆن بی، یەکێکی لە خەڵك، یان، کە دەفەرموێ: (يا أيها الإنسان) تۆش ئینسانێکی، یان، کە دەفەرموێ: (يا بني آدم) تۆش هەر وەچەی ئادەمی، کەواتە: هەر چۆن بێ، دواندن (خطاب)ی قورئان هەر دەتگرێتەوە، ئەگەر ئیمانداربی، وەك ئیماندار، ئەگەرنا وەك ئینسان و خەڵك و وەچەی ئادەم!

بۆ زیاتر ڕوون کردنەوەی چەمك و واتای کارتێکران و پەند وەرگرتن بەهۆی قورئانەوە دەڵێین: کاتێك خوا باسی پەروەردگاریتیی خۆی دەکات، بیری لێ بکەوە بە عەقڵ و بە دڵ، بۆ نموونە: خوای بێ وێنە دەفەرموێ:

﴿ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ رَبِّ ٱلْعَـٰلَمِينَ ﴿٢﴾﴾

واتە: ستایش بۆ خوای پەروەردگاری جیهانەکان، لێرەدا تۆ دەبێ هەموو جیهانەکان: جیهانی مرۆڤ، جیهانی جند، جیهانی فریشتە، جیهانی ڕووح، جیهانی ماددە، جیهانی ڕووەك، جیهانی ژیانداران، جیهانی زیندەوەران.. هتد ئەو هەموو عالەمانە،

کە خوای پەروەردگار خوڵقاندوونی، کە هەر بۆخۆی هەموویان دەزانێ، دەبێ بیانهێنیە بەرچاوی خۆت، خوای بەرز و مەزن خاوەن و مشوورخۆری هەموو ئەو جیهانانەیە، کەواتە: خاوەنی هەموو ئەو عالەمانە، بەرنامەی بۆ تۆ ناردوە و بەندایەتیی لەسەر تۆ پێویست کردوە.

وێنەیەکی دیکە: خوای بەبەزەیی دەفەرموێ:

﴿ فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾ الجاثية.

واتە: ئنجا ستایش بۆ خوا، خاوەنی ئاسمانەکان و خاوەنی زەوی و خاوەنی جیهانەکان. لێرەدا خوا سێ جۆرە پەروەردگارێتیی (ربوبیة)ی خۆی بەیان دەکا: لە پێشدا ستایش بۆ خۆی بڕیار دەدا، (فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ)، کە دەڵێ (ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ) واتە جینسی ستایش، مەدح و سەنا، هەمووی بۆ خوایە، بەڵام لێرەدا (الله)ی پێش خستوە و فەرموویەتی: (فَلِلَّهِ ٱلْحَمْدُ)، واتە: حەمد و ستایش و سەنا تەنها بۆ خوای پەروەردگارە.

**ئنجا سێ جۆر لە پەروەردگاریەتی (ربوبیة)ی خۆی باس دەکات:**

﴿ رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ ﴿٣٦﴾ ﴾

١- (رَبِّ ٱلسَّمَٰوَٰتِ) پەروەردگار و خاوەنی ئاسمانەکان، کە بوونەوەری زانراومان بەشێکی گچکەیەتی و تەنیا گۆشەیەکیەتی.

٢- (وَرَبِّ ٱلْأَرْضِ) خاوەن و مشوورخۆری زەوی، کە (زەوی) بەشێکی گچکەی بوونەوەرە، بەڵام یەکجار گرنگ و بەبەهایە، چونکە نشینگەی مرۆڤە و، واش پێ دەچێ ژیانی ئاسایی تەنیا لەودا بوونی هەبێ و، لە هیچ گۆشە و کەنارێکی دیکەی بوونەوەر و بگرە ئاسمانەکانیش دا، ژیان بوونی نەبێ.

٣- (رَبِّ ٱلْعَٰلَمِينَ) خاوەن و پەروەردگاری جیهانەکان، وا پێدەچێ لێرەدا بەس ئەو جیهانانە مەبەست بن، کە لەسەر زەویین، وەك مرۆڤ و جند و فریشتە و ئاژەڵ و زیندەوەر و ڕووەك و.. هتد.



وە بۆ زیاتر ڕۆشن کردنەوەی چەمك و واتای تەفاعولکردن لەگەڵ قورئاندا دەڵێم: پێویستە کاتێك خوای پەروەردگار باسی حەڵاڵ و حەرام دەکا، چاکی لێ ورد بیەوە و، کاتێك باسی ئەمر و نەهییەك دەکات، دەبێ ئەمرەکە جێ بەجێ بکەی و نەهیەکە خۆتی لێ بپارێزی، وە کاتێك خوا (جل شأنه) باسی شەیتان دەکا و، باسی پێغەمبەران علیهم السلام دەکا.

بۆ نموونە: باسی مووسا علیه السلام و فیرعەون دەکا، تۆ دەبێ ڕقت لە شەیتان بێتەوە و بیبوغزێنی، وە پێغەمبەرانت خۆشبوێن علیهم الصلاة والسلام و ڕێزیان لێ بگری، وە دەبێ کارلێك (تفاعل) لەگەڵ بەسەرهاتەکانیان دا بکەی و، لێرەوە پەرۆشی مووسات بێ، کە بەدەست فیرعەونەوە گیری خواردوە و، پەرۆشی ئیبراهیمت بێ، کە بەدەست نەمروودەوە گرفتار بووە و، پەرۆشی عیسات بێ، کە بەدەست جوولەکە و ڕۆمانییەکانەوە گرفتار بووە و، پەرۆشی نووحت بێ و، لەگەڵ ئێش و ژانەکانی دابی.

ئنجا شایانی باسیشە، کە هەمیشە کارتێکران (تأثر) پێش بەهرەمەندبوون (تذکر) دەکەوێ، هەروەها کارتێکرانی ئینسان بە کتێبی خوا و بەهرە وەرگرتنی لێی، بە پێی ئیمانەکەیەتی، هەیە قورئانی بۆ دەخوێنی، وا دەزانێ گوێزانی بۆ دەژمێری! یان هەیە قورئان دەخوێنێ، هێندە بەخێرایی دەیخوێنێ، فریای بیرلێکردنەوەی ناکەوێ، وەك (ابن مسعود) بە کابرایەکی گوت، کە بەپەلە قورئانی دەخوێند:

(هــــذّاً کَـــهَـــذِّ الشِّـــــعر) [1].

واتە: بەخێرایی گوتنی، وەك شیعر!

---

(١) صحيح البخاري برقم (٥٠٤٣).

## به‌ڵێ به‌ڕێــزان !

ئێمه هه‌ر کامێکمان له قه‌ده‌ر ئیمان وته‌قوا و ته‌زکیه و له خوا نزیکییمان، که‌لام و فه‌رمایشتی خوا سبحانه وتعالی کارمان تێده‌کات و ته‌فاعولی له‌گه‌ڵ ده‌که‌ین، پاشان به‌ئه‌ندازه‌ی کارتێکرانیشمان له‌لایه‌ن قورئانه‌وه، لێی سوودمه‌ند و پێی به‌هره‌مه‌ند ده‌بین.

که‌واته: ئه‌گه‌ر ده‌تانه‌وێ چاك کارتێکراو بن به قورئان و چاك لێی به‌هره‌مه‌ند بن، ده‌بێ چاك خوای خۆتان بناسن، وه‌ك له ڕابردوودا باسمان کرد، وه زۆرتان خۆشبوێ و زۆری لێ بترسن، وه چاك به ناو و سیفه‌ته‌کانی ئاشنا بن، وه بزانن په‌روه‌ردگاریێتیی خوا چییه وچۆنه؟ وه خاوه‌ندارێتیی خوا بۆ بوونه‌وه‌ر، یانی چی؟ وه په‌رستراوێتیی خوا مانای چییه؟ ئیدی هه‌تا زیاتر به ناسینی خوادا قووڵ ببنه‌وه و، هه‌تا زیاتر پابه‌ند بن به‌وه‌وه، که خوا فه‌رموویه‌تی، به ته‌ئکید زیاتر له فه‌رمایشته‌کانی به‌هره‌مه‌ند ده‌بن، وه زیاتر پێیان کارتێکراو ده‌بن و، چاکتریش ته‌فاعولیان له‌گه‌ڵدا ده‌که‌ن.

که‌واته: ئه‌گه‌ر ئینسان هه‌ستی کرد به‌وه‌ی، که وه‌ك پێویست قورئان کاری تێ ناکا، یان له‌گه‌ڵی دا کارلێك ناکا، ئه‌وه با به ئیمانه‌که‌یدا بچێته‌وه و له‌وێوه چاره‌سه‌ری بکا، چونکه تۆ بۆ خۆت چۆن بی، هه‌ڵوێسته‌که‌شت وا ده‌بێ، هه‌میشه هه‌ڵوێستی ئینسان به پێی که‌سایه‌تیی ئینسانه، واته هه‌ڵوێستت به‌رانبه‌ر خوای په‌رستراوی تاك، به ئه‌ندازه‌ی ئیمانه‌که‌ته، وه هه‌ڵوێستیشت به‌رانبه‌ر به کتێبی خوا، به ئه‌ندازه‌ی ئیمانته به خاوه‌نه‌که‌ی، وه به‌و پێغه‌مبه‌ره‌ش، که ناردوویه‌تی، وه به‌و ڕاستییانه‌ش، که ئه‌و کتێبه به‌رز و به‌پێزه گرتوونیه خۆی!



## چۆنیەتی کارتێکران و پەندوەرگرتنی بابای مسوڵمان بەهۆی قورئانەوە

ئنجا با چەند ئایەتێك بە نموونە بێنینەوە، کە چۆنیەتی کارتێکران (تأثر)ی ئینسانی مسوڵمان و بەهرەمەندبوون (تذکر)ی بە قورئان، ڕوون دەکەنەوە:

**١-** لە ئایەتی ژمارە (٢٣) ی سووڕەتی (الزمر)دا خوای پەروەردگار چۆنیەتی کارتێکراوبوونی ئینسانی ئیماندارمان بەهۆی قورئانەوە، بۆ وێنا دەکات و دەفەرمویٚ:

﴿ٱللَّهُ نَزَّلَ أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ كِتَٰبٗا مُّتَشَٰبِهٗا مَّثَانِيَ تَقۡشَعِرُّ مِنۡهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخۡشَوۡنَ رَبَّهُمۡ ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمۡ وَقُلُوبُهُمۡ إِلَىٰ ذِكۡرِ ٱللَّهِۚ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهۡدِي بِهِۦ مَن يَشَآءُۚ وَمَن يُضۡلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنۡ هَادٍ ٢٣﴾

واتە: خوا باشترین قسەی ناردۆتە خوار، کتێبێکە مەبەستەکانی وێکچوو و دووبارە کراوەن، بەهۆیەوە ئەوانەی لە پەروەردگاریان دەترسن، مچووڕکیان پێدادیٚ و پێستیان گرژ دەبیٚ، پاشان پێستیان و دڵیان بەرەو یادی خوا نەرم دەبیٚ، ئەوەش ڕێنمایی خوایە، هەر کەسێکی بیەویٚ پێی ڕێنمایی دەکات، وە هەر کەسێکیش خوا سەرگەردانی بکات (بەهۆی خراپەکانییەوە) هیچ ڕیٚ پێشاندەرێکی نابیٚ.

بەڵێ، خوا سبحانە وتعالی چاکترین فەرمایشتی ناردۆتە خوار و قورئان چاکترین قسەیە و چاکترین فەرموودەیە، وەك لە شوێنێکی دیکەدا، دەفەرمویٚ:

﴿وَمَنۡ أَصۡدَقُ مِنَ ٱللَّهِ حَدِيثٗا﴾ النساء: ٨٧، واتە: کیٚ لە خوا، قسەی ڕاستترە؟!

کەواتە: مادام خوا خۆی فەرموودەکەی وا وەسف بکات، دیارە وایە، دیارە خوا جیاوازیی چەندە لەگەڵ جگەلە خۆیدا، فەرمایشتەکەشی جیاوازیی ئەوەندەیە لەگەڵ قسەی ئەواندا! ئنجا بێگومان تەنیا قورئانیش (أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ ) نیە، تەوڕاتیش (أَحۡسَنَ ٱلۡحَدِيثِ ) بووە و، هەروەها ئینجیل و زەبووریش و، هەموو

کتێبەکانی دیکەی خواش، چونکە هەموویان فەرمایشتی خوا بوون، جاری وا هەیە هەندێ لە مسوڵمانان لە ئەنجامی دەمارگیریی (تعصُّب) یاندا بۆ ئیسلام، نەزانانە پەسندیی (تفضیل)ی قورئان دەدەن بەسەر تەورات و ئینجیل و کتێبەکانی دیکەی خوای پەروەردگاردا، بەڵام ئەوە ڕاست نیە، چونکە هەموویان فەرمایشتی خوان و، خوای کاربەجێ ئەوکاتی وای فەرمووە و، دواییش ئەوەی دیکە و، فەرمایشتی خواش لە نێوەڕۆکدا و لە هێڵە گشتیەکانیدا، هەمووی یەك بووە، وەك لە سوورەتی (الأعلى)دا دەفەرموێ:

﴿ إِنَّ هَٰذَا لَفِي ٱلصُّحُفِ ٱلْأُولَىٰ ﴿١٨﴾ صُحُفِ إِبْرَٰهِيمَ وَمُوسَىٰ ﴿١٩﴾ ﴾

واتە: ئا ئەمە (ئەو حەقیقەتەی، لە سوورەتی (الأعلى)دا باسمان کرد)، لە کتێبە پێشووەکانیشدا هەبووە، بە تایبەت نامەکانی: (إبراهیم) و (موسى).

کەواتە: فەرمایشتی خوا، چ ئەوەی لەگەڵ کۆتایی پێغەمبەران (خاتم الأنبیاء)دا (صلى الله علیه وسلم) فەرموویەتی و، چ ئەوەی لەگەڵ باقی پێغەمبەراندا فەرموویەتی، هەموویان فەرمایشتی خوان و چاکترین فەرمایشتن.

پاشان خوا دەفەرموێ: (كِتَٰبًا مُّتَشَٰبِهًا)، (مثاني) کتێبێکە وێك دەچێ، (متشابه) واتە: ئایەتەکانی، یان مەبەستەکانی وێك دەچن، (مثاني) واتە: مەبەستەکانی دووبارە دەکرێنەوە، ڕاستییەکانی تێدا دووبارە دەکرێنەوە، بەشێوازی جۆراوجۆر، بۆ ئەوەی چاکتریان وەربگرن.

خوای زانا و توانا جاری وایە یەك ڕاستیی بە چەند شێوازێك دووبارە دەکاتەوە، بۆ ئەوەی بەباشی لەهەموو ڕێ (مَنْفَذ)ەکانەوە، بێتە نێو دڵی ئینسانەوە.

ئنجا دەفەرموێ: (تَقْشَعِرُّ مِنْهُ جُلُودُ ٱلَّذِينَ يَخْشَوْنَ رَبَّهُمْ) باسی چۆنیەتی کارتێکرانی بڕواداران بەهۆی قورئانەوە دەکات، مانای وشەی (إقشعرار)یش بریتیە لە: گرژبوون و تەزوو پێداهاتن[1]، واتە: پێستی ئەوانەی، کە لە پەروەردگاریان دەترسن، گرژ دەبێ وڕێك دێ ومچووڕکیان پێدا دێ و، تەزوویان پێدا دێ،

(١) مختار الصحاح، ص ٤٦٥.



کەواتە: تۆش ئەگەر دەتەوێ بزانی کارتێکراو بووی بە قورئان، یان نا؟ سەیری خۆت بکە، بزانە ڕۆژێك تەزووی پێدا هێناوی؟ خوای کاربەجێ حاڵەتی کارتێکران بە جۆرێك وێنا (تصویر) دەکات، کە لە خۆت حاڵی بی داخۆ تۆ لە کوێی، لەبواری کارتێکران بە قورئان و بەهرەمەند بوون بە قورئاندا؟ ئایا ڕۆژێك لە ڕۆژان قورئان تەزووی پێدا هێناوی؟ کە دیارە ئەویش وەك پێشتر باسمان کرد لەقەدەر ئیمان و بەندایەتیی ئینسان و پارێز و بۆ خوا سوڵحان ونزیکییەتی و، تۆ ئەگەر بەڕاستیی خوات خۆش نەوێ و، لێی نەترسی و بەبەرزی نەگری و، لەلات لە هەموو شتێك گەورەتر نەبێ، دیارە فەرمایشتەکەشی کارت تێ ناکات.

لە قۆناغی یەکەمدا دەفەرموێ: مچووڕکیان پێدا دێ و پێستیان ڕێك دێ و گرژ دەبێ، پاشان باسی قۆناغی دووەم دەکات و دەفەرموێ: (ثُمَّ تَلِينُ جُلُودُهُمْ وَقُلُوبُهُمْ إِلَىٰ ذِكْرِ ٱللَّهِ ) واتە: پاشان پێستیان و دڵیشیان نەرم دەبێ بۆ یادی خوا، یانی: دوای ئەوەی یەکەمجار پێستیان گرژ دەبێ و مچووڕکیان پێدا دێ و دەتەزێ، لەدواییدا وردە وردە پێستیشیان و دڵیشیان نەرم دەبێ بۆ یادی خوا، واتە: وردە وردە ئارامیی و سەکینەت و ئۆخژن دێتە نێو دڵیان و، دوای ئەوەی، حاڵەتی ئینفیعالی یەکەم بەسەر دەچێ، ئنجا دەگۆڕێ بۆ حاڵەتی تەفاعول و حاڵەتی بەهرە لێوەرگرتن، کە دیارە ئەو بەهرە وەرگرتنەش لە هیدایەت دا بەرجەستە دەبێ:

﴿ ذَٰلِكَ هُدَى ٱللَّهِ يَهْدِى بِهِۦ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُضْلِلِ ٱللَّهُ فَمَا لَهُۥ مِنْ هَادٍ ﴿٢٣﴾ ﴾ الزمر.

واتە: ئا ئەوە ڕێنمایی و هیدایەتی خوایە، هەر کەسێك بیەوێ ڕێی نیشان دەدا، وە هەر کەسێکیش خوا ڕێی لێ ون بکا، هیچ کەس ناتوانێ ڕێنمایی بکا و ڕێنیشاندەری بێ.

**٢-** لە ئایەتی ژمارە (٧٣)ی سوورەتی (الفرقان)دا، خوای بەرز و بێ وێنە بەجۆر و شێوازێکی دیکە، چۆنیەتی کارتێکران و بەهرەوەرگرتنی بڕوادارانمان بەهۆی قورئانەوە بۆ ڕوون دەکاتەوە و دەفەرموێ:

﴿ وَٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُواْ بِـَٔايَٰتِ رَبِّهِمْ لَمْ يَخِرُّواْ عَلَيْهَا صُمًّا وَعُمْيَانًا ﴿٧٣﴾ ﴾

واتە: ئەوانەی کاتێك ئایەتەکانی پەروەردگاریان دەخرێنەوە بیر، بە کەڕیی و کوێرانە مامەڵەیان لەگەڵدا ناکەن.



دەگوترێ: (خرَّ على وجهه) واته: لەسەر ڕوو کەوت[1]، (خرور) ئەوەیە، کە ئینسان لەسەر ڕوو بکەوێ، واته: وەك ئاژەڵ و چوارپێ لەگەڵ ئایەتەکانی خوای پەروەردگاردا مامەڵە ناکەن، سەریان لەخوارێ بێ و هیچ نەبینن و نەبیستن، بەڵکو چاو و گوێی دڵیانیان بۆ دەکەنەوە.

ئنجا لێرەدا وا پێ دەچێ مەبەست لە (آیات) ئایەت و، نیشانەکانی هەردوو کتێبی خوێنراوە (مقروء) و بینراو (منظور) ی خوا بن، چونکە وشەی (آیات)، کە کۆی (آیة)ە و، بەمانای نیشانە دێ، لە کتێبی خوای زانا و شارەزادا، هەم بۆ ڕستەکانی قورئان و، هەم بۆ دیاردە و دیمەنە سروشتییەکانیش بەکارهاتوە، وەك خوا فەرموویەتی:

﴿طسٓۚ تِلۡكَ ءَايَٰتُ ٱلۡقُرۡءَانِ وَكِتَابٖ مُّبِينٍ ١﴾ النمل.

وە فەرموویەتی:

﴿وَكَأَيِّن مِّنۡ ءَايَةٖ فِي ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلۡأَرۡضِ يَمُرُّونَ عَلَيۡهَا وَهُمۡ عَنۡهَا مُعۡرِضُونَ ١٠٥﴾ يوسف.

دیارە هۆی ئەو ناونرانەش ئەوەیە، کە هەرکام لە ڕستەکانی قورئان و دیاردە و دیمەنەکانی بوونەوەر، نیشانە و دروشم و بەڵگەی بەدیهێنەرایەتیی و پەروەردگارێتیی خوای بەرز و بێ وێنەن.

وە دەشگونجێ، کە مەبەست لە وشەی (آيَاتِ رَبِّهِمْ) تەنیا ڕستەکانی قورئان بن و حیکمەتی باسکران (چاو و گوێ)ش ئەوە بێ، کە ئینسان یان بۆ خۆی ئایەتەکانی خوا بە چاو دەخوێنێتەوە، یان بە گوێ دەیانبیستێ، کاتێك بەسەریدا دەخوێندرێنەوە و، ئەو بەندە پەسندانەی خواش جل و علا بەچاوی کراوە و گوێی بیسەرەوە، لەگەڵیان دا مامەڵە دەکەن و، وەك ئەهلی کوفر لەبەرانبەریان کەڕ و کوێر (أَصَمٌّ و أَعْمى) نین!

---

(١) مختار الصحاح، ص ١٦٣.



کەواتە: لێرەشدا چۆنیەتی هەڵوێست نواندنی ئەهلی ئیمان (عباد الرحمن)، لەگەڵ کتێبی خوادا، ئەوەیە، کە بە چاوی کراوە و گوێی کراوەوە، لەگەڵ ئایەتەکاندا مامەڵە دەکەن، بۆ ئەوەی بزانن: ئەو ئایەتانە چی یان تێدایە و، چی دەگەیەنن و، چی لە ئینسان داوا دەکەن ؟!

**٣-** لە ئایەتەکانی ژمارە (١٦،١٥)ی سوورەتی (السجدة) دا، خوای کاربەجێ جل شأنه زۆر ڕوونتر بۆمان باسی چۆنیەتی کارتێکرانی ئینسانی مسوڵمان و، چۆنیەتی بەهرە وەرگرتنی لە قورئان دەکات، کە دەفەرموێ:

﴿ إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ إِذَا ذُكِّرُوا۟ بِهَا خَرُّوا۟ سُجَّدًا وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ۩ ﴿١٥﴾ تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ يَدْعُونَ رَبَّهُمْ خَوْفًا وَطَمَعًا وَمِمَّا رَزَقْنَـٰهُمْ يُنفِقُونَ ﴿١٦﴾ ﴾.

واتە: بێگومان تەنیا ئەوانە ئیمانیان بە ئایەتەکانمان هەیە، کە کاتێك ئایەتەکانی ئێمەیان بیردەخرێنەوە، لەپەو ڕوو سەجدە دەبەن، وە پەروەردگاریان بە ستایش کردنەوە بە پاك دەگرن، وە لە هەمان کاتدا خۆشیان بە زل ناگرن. (شەوانە) کەلەکەیان لەسەر جێگادا بەرز دەبێتەوە (و هەڵدەستن) وە بەترس و ئومێدەوە لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، وە لەوەی، کە پێمان داون (لە پێناوی خوادا) خەرج دەکەن.



## حەوت جۆرە هەڵوێستی گرنگی هەڵگرانی قورئان:

### خوشک و برایانی خۆشەویست !

ئەم دوو ئایەتەی خوای کاربەجێ، حەوت جۆرە هەڵوێستی ئینسانی مسوڵمان دەخەنە ڕوو، وە ڕایدەگەنن، کە تەنیا ئەو جۆرە کەسانەی خاوەنی ئەو خەسڵەت و هەڵوێستانەن، بەڕاستیی ئیمانیان بە ئایەتەکانی خوا هەیە، چونکە لە سەرەتادا دەفەرموێ: ( إِنَّمَا يُؤْمِنُ بِـَٔايَـٰتِنَا ٱلَّذِينَ ) بێگومان تەنیا ئەو جۆرە کەسانە ئیمانیان بە ئایەتەکانی ئێمە هەیە، کە ئەو حەوت هەڵوێستەیان هەیە، کەواتە: هەر کەسێك ئەو جۆرە هەڵوێستانەی تێدا نەبن، ئیمانی ڕاستەقینەی بە ئایەتەکانی خوا نیە، زۆر جاری دیکەش باسمان کردوە، زۆریش دووبارەی دەکەینەوە، کە ئیمان بە قورئان و ئیمان بە ئایەتەکانی خوا، ئەوە نیە بڵێی: دەزانم، کە خوا قورئانی ناردوە، چونکە ئەوە بەس زانیاریی هەبوونە بە ئایەتەکانی خوا و، (أبو جهل)یش دەیزانی، کە قورئان، خوا بۆ موحەممەدی علیە الصلاة والسلام ناردوە، وە فیرعەونیش دەیزانی خوای پەروەردگار مووسای ناردوە و وەحی بۆ ناردوە، بەڵام ئایا تەنیا بەوە بە ئیماندار لە قەڵەم دراون؟! بێگومان نەخێر، بگرە (ئیبلیس)یش دەیزانی، کە خوای پەروەردگار پێی فەرمووە سەجدە بەرە بۆ ئادەم - سەجدەی ڕێزگرتن -، دەیزانی ئەوە فەرمانی خوایە و ئاڕاستەی کراوە، بەڵام ئایا (ئیبلیس) لەبەرئەوەی، کە دەیزانی خوا فەرموویەتی، بە بڕوادار (مؤمن) لەقەڵەم دەدرێ ؟ بێگومان سەدجار نەخێر، چونکە ئیمان ئەوەیە تۆ هەڵوێستێك وەربگری، کە خوای بەبەزەیی داوای کردوە، واتە: دوای ئەوەی، ئەوە کە خوا فەرموویەتی بەڕاستی دەزانی، هەڵوێستێکیش وەربگری، کە خوا داوای کردوە، بۆ نموونە: تۆ دەزانی، کە نوێژ فەرزە، بەڵام ئایا نوێژەکەت دەکەی، دوای ئەوەی، کە زانیت فەرزە؟ کاتێك تۆ وا دادەنرێی، کە ئیمانت بە نوێژی هەیە، هەڵوێستێك لە بەرانبەر نوێژدا وەربگری، کە خوا داوای کردوە، ئەویش چییە ؟ ئەویش ئەوەیە، کە نوێژ بەرپا بکەی.

یان کەسێك دەزانێ ڕۆژووی مانگی ڕەمەزان فەرزە، بەڵام کاتێك بە بڕواداری تەواو دادەنرێ بەرانبەر بەڕۆژوو، کە ڕۆژووەکە بگرێ، وە هەروەها....

ئنجا خوای زانا و توانا جل شأنه‌، ئاوا بۆمان باسی ئه‌و جۆره‌ که‌سانه‌ ده‌كات، كه‌ به‌ بڕوادار به‌ قورئان له‌ قه‌ڵه‌م ده‌درێن كه‌:

**١- یه‌كه‌م هه‌ڵوێستیان ئه‌وه‌یه‌ كه‌:** (خَرُّواْ سُجَّدًا)، له‌پەو ڕوو سه‌جده‌ ده‌بەن، جا لێره‌دا ئه‌م ته‌عبیره‌ ئه‌وه‌ ده‌گه‌یه‌نێ، چونكه‌ وه‌ك باسمان كرد (خرَّ ساجداً) واته‌ له‌پەو ڕوو كه‌وت، یانی زوو سه‌جده‌ ده‌به‌ن، هه‌ر بۆیه‌ زانایان ده‌ڵێن: ئه‌و شوێنانه‌ی، كه‌ دیاریی كراون له‌ قورئاندا و نیشانه‌ی سه‌جده‌یان بۆ كراوه‌، یه‌كسه‌ر كه‌ ئایه‌تی سه‌جده‌ت ته‌واو كرد، ده‌بێ یه‌كسه‌ر سه‌جده‌ به‌ری به‌بێ دواخران، نه‌ك ڕاوه‌ستی تاكو چه‌ند ئایه‌تێكی دیكه‌ ده‌خوێنی، یاخود تاكه‌ ده‌گه‌یه‌ كۆتایی سووره‌ته‌كه‌، به‌ڵكو ده‌بێ یه‌كسه‌ر سه‌جده‌ ببه‌ی، كه‌واته‌: یه‌كه‌مین هه‌ڵوێستی ئه‌وانه‌ی، كه‌ ئیمانیان به‌ قورئان هه‌یه‌ و كارلێك (تفاعل)ی ڕاسته‌قینه‌ له‌گه‌ڵ قورئاندا ده‌كه‌ن، ئه‌وه‌یه‌، كه‌ سه‌جده‌ بۆ خوای به‌رز و پاك ده‌به‌ن، له‌ كاتێدا، كه‌ ئایه‌ته‌كانی سه‌جده‌ ده‌خوێنن، وه‌ مانایه‌كی دیكه‌ش ئه‌وه‌یه‌: (خَرُّوا سُجَّدًا) واته‌: ملكه‌چ ده‌بن بۆ خوای په‌روه‌ردگار، كاتێك ئایه‌ته‌كانی خوا ده‌خوێنن یان به‌سه‌ریاندا ده‌خوێنرێن و، به‌ ته‌علیمات و ئاڕاسته‌ و یاساكانییه‌وه‌ پابه‌ند ده‌بن.

سه‌جده‌ بردنیش دوو جۆری هه‌یه‌: سه‌جده‌ی عورفیی هه‌یه‌ و، سه‌جده‌ی زمانه‌وانیی (لغوي)ش هه‌یه‌، چونكه‌ هه‌موو شتێك له‌ بوونه‌وه‌ردا كڕنووش به‌ره‌ بۆ خوا، واته‌: ملكه‌چه‌، وه‌ ئه‌و سه‌جده‌ عورفییه‌ی ئێمه‌، بۆ نموونه‌: كه‌ له‌ نوێژدا سه‌جده‌ ده‌به‌ین، ئه‌وه‌ ڕه‌مزێكه‌ بۆ سه‌جده‌ گشتییه‌كه‌مان بۆ خوا، تۆ ده‌بێ هه‌موو ژیانت بریتی بێ له‌ سه‌جده‌بردن بۆ خوا عز وجل و، ده‌بێ له‌ هه‌موو ژیانت دا، له‌ گوێڕایه‌ڵیی دابی بۆ فه‌رمانه‌كانی خوای په‌روه‌ردگار و، پابه‌ند بی به‌ شه‌ریعه‌تی خواوه‌، ئنجا، كه‌ وابی، هه‌ر ئه‌و كاته‌ به‌ كڕنووشبه‌ر (ساجد) له‌ قه‌ڵه‌م نادرێی، كه‌ سه‌ر ده‌خه‌یه‌ سه‌ر زه‌وی، به‌ڵكو هه‌ر كاتێك فه‌رمانی خوا جێ به‌جێ بكه‌ی، تۆ كڕنووشبه‌ر (ساجد)ی بۆ خوا و، ملكه‌چی بۆ خوا سبحانه وتعالى، چونكه‌ له‌ بنه‌ڕه‌ت و ڕیشه‌دا وشه‌ی (سجود)[1] واته‌: ملكه‌چیی و گوێڕایه‌ڵیی و گه‌ردن

---

(١) وه‌ك (راغب الأصفهاني) گوتوویه‌تی: (السّجود: أَصْلُهُ التَطامُنُ و التّذَلّلُ، و جُعِل ذلك عبارة عن التذلّل للّه، و هو عام في الإنسان و الحيوانات و الجمادات). (مفردات ألفاظ القرآن) ص٣٩٦.
واته‌: سه‌جده‌: له‌بنه‌ڕه‌تدا خۆی نه‌وی كردن و ملكه‌چییه‌، بۆیه‌ش سه‌جده‌ بردن كراوه‌ به‌



کەچیی بۆ خوای بەرز و مەزن عز وجل.

٢- **هەڵوێستی دووەمیان:** (وَسَبَّحُوا۟ بِحَمْدِ رَبِّهِمْ) پەروەدگاریان بە پاك دەگرن و ستایشی دەکەن.

زۆر کەس مانایەکی سادە وساکاری لە مێشك دایە بۆ وشەکانی:(سبحان الله) و (الحمد لله)! بەڵام نەخێر، بەڵکو دەبێ پێیدا قووڵ بینەوە و لێی ورد بینەوە: (سبحان الله) یانی چی؟، کە تۆ دەڵێی خوا پاکە، واتە: زاتی خوای پەروەردگار پاکە و وەك دروستکراوەکانی ناچێ:

﴿ لَيْسَ كَمِثْلِهِۦ شَىْءٌ ﴾ الشورى: ١١ .

چونکە جگەلە خۆی هەرچی بێ، هەر دروستکراو (مخلوق)ی خۆیەتی و، بەدیهێنەر (خالق) و بەدیهێنراویش (مخلوق)یش جیاوازن.

هەروەها (سبحان الله) یانی: سیفەتەکاتی خوا هەموویان لەوپەڕی چاکیی و تەواویی دان، بۆ نموونە: عەبد هەندێ شت دەزانێ و، زۆریش نازانێ، هەندێ شت دەتوانێ و، زۆریش ناتوانێ، بەڵام خوای پەروەردگار هەموو شتێکیش دەزانێ و، هەموو شتێکیش دەتوانێ، وە ڕەحمەتی خوا سنووری نیە:

﴿ ... وَرَحْمَتِى وَسِعَتْ كُلَّ شَىْءٍ ﴾ الأعراف: ١٥٦.

واتە: بەزەییم هەموو شتێکی گرتۆتەوە،

وە خوا هەموو شتێکی لە توانادایە:

﴿ إِنَّ ٱللَّهَ عَلَىٰ كُلِّ شَىْءٍ قَدِيرٌ ﴾ فاطر: ١ .

وە هیچ شتێك لە ژێر ڕكێفی ویستی خوا دەرناچێ:

﴿ فَعَّالٌ لِّمَا يُرِيدُ ﴿١٦﴾ ﴾ البروج.

وە سیفەتەکانی هەموویان لە چاکی دا بێ سنوورن:

﴿ وَلِلَّهِ ٱلْمَثَلُ ٱلْأَعْلَىٰ ﴾ النحل: ٦٠.

---

نیشانەی ملکەچی بۆ خوا، کە ئەویش گشتییە لە مرۆڤ و ژیاندار و بێ ژیاندار.

هەروەها خوا عز وجل ناوی هەرەچاکیی هەن، چ ناوێك زۆر چاکە هی خوای پەروەردگارە، بەڵام دیارە ناوە هەرە چاکەکانی خوای بێ وێنە جگە لەوانەی، خۆی بەیانی کردوون لە قورئاندا، یان پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام لە سوننەتدا، دروست نیە ناوێکی دیکە بۆ خوای بەرز و مەزن هەڵدەین، چونکە فەرموویەتی:

﴿وَلِلَّهِ ٱلْأَسْمَآءُ ٱلْحُسْنَىٰ فَٱدْعُوهُ بِهَا ۖ وَذَرُوا۟ ٱلَّذِينَ يُلْحِدُونَ فِىٓ أَسْمَٰٓئِهِۦ ۚ سَيُجْزَوْنَ مَا كَانُوا۟ يَعْمَلُونَ ﴿١٨٠﴾﴾ الأعراف

واتە: وە خوا ناوی هەرەچاکی هەن، بەوان لێی بپاڕێنەوە و واز لەوانە بێنن، کە لادان لە ناوەکانی دا دەکەن.

بەڵێ، نابێ لەخۆڕا ناوێك بۆ خوای پاك و تاك دابنێین، بۆ نموونە: لە کتێبەکانی (علم الكلام)دا ناویان لە خوای پەروەردگار ناوە: (المحرك الأول)، یان (واجب الوجوب)، یان (الصانع)، دیارە ئەم وشانە لەبەرئەوەی خوای زانا وەك ناو بۆخۆی بەکاری نەهێناون لە قورئاندا، وە پێغەمبەریش علیه الصلاة والسلام بەکاری نەهێناون، نابێ وەك (ناو) بۆ خوا بەکاربهێنرێن.

بەڵێ دەبێ ئێمە هەر ئەو ناوانەی بۆ بەکار بێنین، کە بۆخۆی یان پێغەمبەرەکەی بەکاری هێناون، چونکە: خوا بۆخۆی چاك خۆی دەناسێ و بۆخۆشی ناوەکانی لەخۆی هەڵداون.

جا ناوەکانی خوای تاك و پاك، هیچ کەم و کووڕییەکیان تێدا نیە، کە دەڵێی: (سبحان الله)، واتە: خوایە! ناوەکانت هەمووی پاك و بێگەردن. هەروەها فەرمایشتەکانی خوا کەم و کوڕییان تێدا نیە و، کە تۆ دەڵێی: (سبحان الله) واتە: خوایە! فەرمایشتی تۆ، کتێبی تۆ، کەم و کوڕیی تێدا نیە و یاساکانی تۆ، کەم و کوڕییان تێدا نیە.

مسوڵمانی عەوامی وا هەیە لە ڕۆژێکدا سەد جار (سبحان الله) دەکا، دوایی دەڵێ: دینی خوا بەکەڵك نایەت!! یان پیاوی سیاسی وا هەیە لەوانەیە (سبحان الله) و (الحمد لله) لەگەڵ مسوڵماناندا بکات، بەڵام دەڵێ: فلان شتەی ئیسلام بەکەڵکی ئێستا نەماوە!!

دەی برادەر! مانای وایە تۆ نوقصانییت پاڵدایە لای دینی خوا، کەواتە (سبحان الله)ی چی؟! درۆت کرد لەگەڵ خوادا، بەدەم دەڵێی خوایە! تۆ پاکی، کەچی دەڵێی: دینەکەشت بەکەڵك نایەت!! ئەگەر خوا پاك و بێ هەڵە بێ، دینەکەشی بێ هەڵەیە، مادام خوای پەروەردگار هەموو سیفەتەکانی لەوپەڕی چاکیی دا بن، دیارە ئەو قورئانەش بە عیلمی خوا هاتوە:

﴿ ... أَنزَلَهُۥ بِعِلۡمِهِۦ ﴾ النساء: ١٦٦ .

ئنجا وەك چۆن عیلمی خوا کەم و کورِیی تێدا نیە و، هیچ لە خوای زانا شاراوە نیە، قورئانەکەشی، کە بۆ ڕێکخستنی ژیانی مرۆڤی ناردوە، هەر تێر و تەواوەو، هیچ کەم و کورییەکی تێدا نیە، کەواتە: نابێ کەسێك خۆی بە مسوڵمان بزانێ، هیچ کەم و کورتییەك پاڵداتە لای خوا.

هەروەها دروستکراوەکانی خوا هەموویان لەو ڕووەوە، کە خوا دروستی کردوون، هیچ کەم و کورییان تێدا نیە:

﴿ ... مَّا تَرَىٰ فِي خَلۡقِ ٱلرَّحۡمَٰنِ مِن تَفَٰوُتٖ ﴾ الملك: ٣.

واتە: لە دروستکراوی خوای بەبەزەیی دا، هیچ نارێکیی نابینی.

کورتەی مەبەست: کە دەڵێی: (سبحان الله) واتە: زاتی خوا، سیفەتەکانی خوا، ناوە بەرزەکانی، فەرمایشتەکانی، یاساکانی، دروستکراوەکانی، کردەوەکانی، بڕیارەکانی خوا تبارك و تعالى، هەموویان پاك و بێگەردن.

وە کە دەڵێی: (الحمد لله) واتە: ستایش بۆ خوا، ئەوەش یانی: زات و سیفەت و ناو و ئایین و فەرموودە و کردەوەکانی و هەموو شتێکی خوای تاك و پاك، پەسند و چاکە و، بگرە هەمووی لەوپەڕی چاکیی و تەواویی دایە، بەڵێ: کە دەڵێی: (سبحان الله و الحمد لله) دەبێ ئاوا لێی حاڵی بی.

ئنجا وەك باسمان کرد: هەڵوێستی دووەمی ئەوانەی، کە بە ڕاستیی قورئان دەخوێنن و لێی بەهرەمەند دەبن، ئەوەیە، کە خوا بە پاك دەگرن و، ستایشی دەکەن (وَسَبَّحُواْ بِحَمۡدِ رَبِّهِمۡ).

**٣- سێیەم هەڵوێستیان:** (وَهُمۡ لَا يَسۡتَكۡبِرُونَ ) وە ئەوان خۆ بە زل ناگرن،

خۆ بەزل گرتن دوو حاڵەتی هەن:
١- ئینسان لە بەرانبەر دینی خوادا خۆی بەزل بگرێ و ملکەچ نەبێ.
٢- بەرانبەر بە عەبدەکانی خوا خۆی بەزل بزانێ، وەك پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام فەرموویەتی:

(الكبر بَطَرُ الحق، و غَمْطُ الناس) [1].

واتە: خۆ بەزلگریی دوو شتە: حەق ڕەت کردنەوە و، خەڵك بە سووك سەیر کردن.

لێرەدا خوای پەروەردگار، کە باسی ئەو عەبدانەی خۆی دەکات دەفەرموێ: (وَهُمْ لَا يَسْتَكْبِرُونَ ) واتە: نە لە بەرانبەر دینی خوا دا خۆیان بەزل دەگرن و، نەڕەفزی هیچ یاسایەکی خوای پەروەردگار دەکەن، وە نە لە بەرانبەر بەندەکانیشی دا خۆیان بەزل دەگرن.

٤- **چوارەم هەڵوێستیان** ( تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ ): باسی شەونوێژیان دەکات، ئایا کێ کارتێکراوە بە قورئان و، کێ لێی بەهرەمەندە؟ کەسێ، کە شەونوێژ بکا، هی وا هەیە نوێژە فەرزەکانیش بە چاکی ناکا، مانای وایە لە قورئان دوورە، ئەگەر هەموو قورئانیشی لەبەربێ، با زۆریشی بخوێنێتەوە.

بەڵێ، تۆ بتەوێ بە هاوەڵی قورئان لەقەڵەم بدرێی و، وا لەقەڵەم بدرێی بەهرەمەند بووی لە قورئان، دەبێ ئەو شتانەی، کە قورئان مەدحی کردوون، لە خۆتیان دا بێنیە دی، قورئان زۆر مەدحی شەونوێژ دەکات و، زۆر مەدحی ئەوانە دەکات، کە شەوێ هەڵدەستن بەندایەتیی بۆ خوای خۆیان دەکەن.

ئنجا بۆیەش خوای پەنهانزان دەفەرموێ: ( تَتَجَافَىٰ جُنُوبُهُمْ عَنِ ٱلْمَضَاجِعِ ) لاتەنیشتەکانیان وردە وردە بەرز دەبنەوە، لەسەر جێگاکانیان، چونکە (مَضَاجِعِ) کۆی (مَضجِع)ە، کە ئەو شوێنەیە ئینسان تێیدا خەوتوە[2]، (جنوب)یش کۆی (جَنْب)ە، واتە: لاتەنیشتەکانیان[3]، (تتجافى)ش واتە: (تتباعد)، واتە: وردە

---

(١) رواه مسلم.

(٢) مختار الصحاح، ص ٣٣٤.

(٣) مختار الصحاح، ص ١١١.

وردە بەرز دەبنەوە، تاكو وێنای ئەو حاڵەتە بكات، كە ئینسان بۆ شەونوێژی هەڵدەستێ، لەلایەك ئیمانت پاڵت پێوەدەنێ و پێت دەڵێ: هەستە خوای بەرزو مەزن لەخۆت ڕازی بكە و، لە لایەكی دیكەشەوە نەفست ناهێڵێ!

**٥- ئنجا پێنجەم هەڵوێستیان، پاڕانەوەیانە لە پەروەردگاریان:** (يَدْعُونَ رَبَّهُمْ) واتە: لە پەروەردگاریان دەپاڕێنەوە، دووعا و پاڕانەوەش لە خوای پەروەردگار، جۆرێكی دیكەیە لە بەهرەمەندبوون لە قورئان، چونكە قورئان زۆر جاران فەرمانی كردوە كە لە پەروەردگارمان بپاڕێینەوە.

**٦- هەڵوێستی شەشەمیان، كە بە:** (خَوْفًا وَطَمَعًا) تەعبیری لێكراوە، ئەوەیە، كە هەمیشە هەم ترسیشیان هەیە لە بەرانبەر خوای دادگەردا و، هەم تەماعیشیان هەیە، ترسیان هەیە لە دادگەریی (عدل)ی خوا و، تەماعیشیان هەیە لە بەخشش (فضل)ی خوا دا، هەندێ كەس وا دەزانێ، كە تۆ دەبێ لە زاتی خوا عز وجل بترسێی، وەك بڵێی خوای بێ وێنە شتێكی ترسناكە! بەڵام نەء، ئەوە ڕاست نیە.

بەڵكو ئێمە لە گوناهەكانی خۆمان دەترسین و، لە دادگەریی (عدل)ی خوا دەترسین، ئەگەر نا خوای بەبەزەیی بۆخۆی كاتێك وشەی (ترس)ی بۆخۆی بەكارهێناوە:

﴿يَخْشَوْنَ رَبَّهُم﴾ الملك: ١٢، یان: ﴿فَلَا تَخَافُوهُمْ وَخَافُونِ﴾ آل عمران: ١٧٥.

ئەوە مەبەست پێی ترسانە لە سزا و تۆڵەی دادگەرانەی خوا عز وجل، ئەگەرنا خوای پەروەردگار بۆ خۆی لە زاتی خۆیدا، خۆشەویست (محبوب)ە و، دەبێ ئەوپەڕی خۆشەویستییت بۆی هەبێ، وە خوای بەرز و مەزن، هیچ ستەمێك و هیچ خراپەیەكی لێناوەشێتەوە:

﴿وَمَا رَبُّكَ بِظَلَّـٰمٍ لِّلْعَبِيدِ﴾ فصلت: ٤٦.

بەڵام ئەوە خراپەكانی خۆمانن دێنەوە ڕێگامان، تۆ دەبێ لە سزا و جەزرەبەی خراپەكانی خۆت بترسێی، ترست لە دادگەریی خوا هەبێ، چونكە

ئەگەر بە دادگەریی خۆی ڕەفتارت لەگەڵدا بکات و، بە پێی خراپەکانت سزات بدات، تووشی چەرمەسەریێ دەبێ.

## جا بەڕێـــزان!

ئینسان دەبێ هەمیشە لە هەڵسوکەوتی لەگەڵ خوای بەرز و مەزندا، هەم ترسی هەبێ و هەم تەماع و، لە نێوان ترس و ئومێد (خوف و رجاء) دابێ، ترسی هەبێ، وەك باسمان کرد لە خراپەکانی خۆی، تەماع و ئومێد و ڕەجاشی هەبێ، بە ڕەحمەت و بەزەیی خوای بەبەزەیی و بەخشندە.

**٧- هەڵوێستی حەوتەم و کۆتایی:** (وَمِمَّا رَزَقْنَاهُمْ يُنفِقُونَ)، لەوەی پێمانداون دەبەخشن.

ئەوەی پێشەوە بریتی بوو لە پارێزکاریی (تقوى)، ئەمەشیان بریتیە لە چاکەکاریی (إحسان)، ئەگەر سەیری قورئان بکەین، دەبینین ئەو خەسڵەتانەی، کە باسیان دەکات، بۆ ئەهلی ئیمان، هەمیشە هاوسەنگییان پێوە دیارە، ئێستا لێرە ئەم سیفەتانە:

١- هەم باسی سەجدە بردن.

٢- هەم باسی زیکر و تەسبیح و تەحمیدی خوای پاك و تاك.

٣- هەم باسی خۆبەزل نەگرتن.

٤- هەم باسی شەونوێژکردن.

٥- هەم باسی پاڕانەوە.

٦- هەم باسی ترس و ئومێد.

٧- هەم باسی ماڵ بەخشین.

دەکەن، واتە: مسوڵمانی ڕێك و پێك ئەوەیە مسوڵمانەتییەکەی هاوسەنگ بێ و، شەریعەت هەمووی پیادە بکات، نەك هەر بە لایەك دا بڕوا، ئنجا ئایا چ کەسێ دەتوانێ ماڵ ببەخشێ ؟ دیارە کەسێك، کە دەوڵەمەندبێ و دەستی پڕبێ، کەواتە: پێویستە کار و کەسابەتی حەڵاڵیش بکا، بۆ ئەوەی بتوانێ ببەخشێ.



هەروەها بۆ ڕوونکردنەوەی ئەوە، کە پاراستنی هاوسەنگیی (توازن) لە دینداریی و مسوڵمانەتیی دا، شتێکی گرنگ و پێویستە، با سەرنجی ئەم ئایەتەش بدەین:

﴿يَـٰٓأَيُّهَا ٱلَّذِينَ ءَامَنُواْ قَـٰتِلُواْ ٱلَّذِينَ يَلُونَكُم مِّنَ ٱلْكُفَّارِ وَلْيَجِدُواْ فِيكُمْ غِلْظَةً ۚ وَٱعْلَمُوٓاْ أَنَّ ٱللَّهَ مَعَ ٱلْمُتَّقِينَ ﴿١٢٣﴾﴾ التوبة.

واتە: ئەی ئەوانەی بڕواتان هێناوە! لە دژی ئەو کافرانە بجەنگن، کە لێتانەوە نزیکن، وە با زبرییتان پێوە ببینن، وە بزانن خوا لەگەڵ پارێزکاران دایە!

وەك دەبینین خوای کاربەجێ: هاوکات لەگەڵ فەرمانکردنی بەبڕواداران، کە ئەهلی جەنگ و فیداکاریی بن، فەرمانیشیان پێدەکات، کە ئەهلی خواپەرستیی و پارێزکارییش بن، کەواتە: فیداکاریی و پارێزکاریی و، شەبەیخوون و شەونوێژ و، بەندایەتیی بۆ خوا کردن و لە پێناوی ئیسلام دا جەنگ کردن، نەك هەر دژایەتییان نیە، بگرە تەواوکەری یەکدین و پێکەوە پەیوەستن!

کەواتە: مسوڵمانی تەواو ئەو کەسەیە، کە هاوسەنگ بێ و لە شوێنی خۆیدا خواپەرست (عابد) بێ و، جەنگاوەر (مجاهد) بێ و، سیاسی بێ و، هاوکات ئاگای لە ئەخلاقی ئیسلامییشی بێ و، ئاگای لە ئەدەبی ئیسلامیی بێ و، ئاگای لە عیززەتی مسوڵمانەتیی بێ و، ئاگای لە ماڵبەخشین و هاوکاریی نەدارانیش بێ، بەکورتی: ئاگای لە مافی خواش بێ و، ئاگای لە مافی خەڵکیش بێ و، ئاگای لە مافی خۆشی بێ، ئاگای لە حەقی جەستەی بێ و، ئاگای لە حەقی ڕووحیشی بێ و، ئاگای لە حەقی عەقڵی بێ، واتە: ئەو هاوسەنگییە، کە قورئان دەیەوێ، دەبێ لەخۆتی دا بێنیە دی، ئنجا مانای وایە تۆ بە مسوڵمانێك لەقەڵەم دەدرێی، کە بەڵێ قورئان کاری تێکردووی و لێشی بەهرەمەندبووی.

خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە بەڕاستی کارتێکراو دەبن بە ئایەتەکانی کتێبی خوای بەبەزەیی، چ، کە بۆ خۆیان دەیخوێننەوە چ کە بەسەریاندا دەخوێنرێتەوە، وە یارمەتیشمان بدات، کە کارلێك (تفاعل) بکەین





لەگەڵ قورئاندا و، ئەو ڕاستییانەی، کە قورئان دەیانفەرموێ، دەربارەی خوای بێ هاوەڵ، دەربارەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام، دەربارەی دینی خۆی، دەربارەی دوارۆژ و بەهەشت و دۆزەخ، وە ئەو حوکم و یاسایانەی، کە شەریعەت دەیانفەرموێ و، خوای کاربەجێ لە قورئاندا باسی کردوون و شەریعەتەکەی پێکدێنن، کارلێك (تفاعل)یان لەگەڵدا بکەین و، هەوڵبدەین ڕاستییەکان فام بکەین و هەزم (إستیعاب) بکەین و، یاساکان جێ بەجێ بکەین لە ژیانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتی و سیاسییمان دا، وە ئەو ئامۆژگارییانەی، کە لە قورئاندا هەن، وەربگرین و ڕەوشتە بەرزەکان لە خۆماندا بێنینە دی و، خەسڵەتە نزمەکان لە خۆمان دارنین، وە ئەو دۆستایەتیی و دوژمنایەتییەی، کە قورئان باسی دەکا، هەوڵ بدەین خوای باڵادەست لە قورئاندا کێی بەدۆست داناوە، بەدۆستی بگرین و، کێی بە دوژمن داناوە، بە دوژمنی بگرین، ئنجا ئەگەر وامان کرد، ئەوکاتە مانای وایە ئێمە قورئان کاری تێکردووین و، لە قورئان بەهرەمەند بووین.

وصلى الله تعالى على محمد و على آله و صحبه أجمعين
و الحمد لله رب العالمين.




## هەنگاوی پێنجەم:

# شوێنکەوتن و گەردن کەچکردن (الإتباع و التسليم)

خوشک و برایانی بەڕێز و خۆشەویست!

ئەم وانەیەمان، کە وانەی پێنجەمە لە زنجیرە وانەی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟!) لە ژێر ناوونیشانی: شوێنکەوتن و گەردن کەچکردن (الإتباع والتسليم) دایە.

بەڵێ پێنجەمین هەنگاوی هەڵس و کەوتکردنی شەرعییانەی ڕاست و دروست لەگەڵ قورئاندا، دوای ئەدەب نواندن و بە گەورە گرتن و، دوای خوێندنەوە و گوێ لێ گرتن و، پاشان بیر لێ کردنەوە و پێدا قووڵ بوونەوە و لێورد بوونەوە و، دوایی کارتێکران بە قورئان و پەند لێ وەرگرتن و، لێ بەهرەمەند بوونی، ئەمجار نۆرە دەگاتە سەر: شوێنکەوتنی قورئان و گەردن بۆ کەچ کردنی (الإتباع والتسليم).



## پێناسەی شوێنکەوتن و گەردنکەچکردن

سەرەتا پێناسەی ئەم دوو وشانە دەکەین: مەبەستمان لە: شوێنکەوتن و گەردنکەچکردن (الإتباع و التسليم) چییە؟

مەبەستمان لە شوێنکەوتن (الإتباع)، شوێنکەوتنی قورئانە لە هەموو بوارەکاندا، واتە: هەموو ئەو ڕاستییانەی، کە قورئان گرتوونیە نێو خۆی، وە هەموو ئەو یاسایانەی کە قورئان گرتوونیە خۆی، وە هەموو ئەو حیکمەت و ئامۆژگاریی و ڕێنموونی و ئاڕاستەکردنانەی، کە قورئانی بەهێز و پێز گرتوونیە نێو خۆی، پێویستە لەسەر ئینسانی قورئان خوێن، لەسەر کەسێك، کە ئیمانی بە قورئانە و شوێن قورئان دەکەوێ، لە هەموو ئەو بوارانەدا شوێنی بکەوێ.

مەبەستیش لە گەردنکەچکردن (التسليم) ئەوەیە، کە مرۆڤ لە ناخەوە بۆ قورئان ملکەچ بێت، چونکە جاری وایە ئینسان بەدوای شتێك دەکەوێ، بەڵام لە ڕووی ناچارییەوەیە و قەناعەتی پێی نیە، بەڵام خۆی ناچار دەبینێ، بەڵام شوێنکەوتنی قورئان لەلایەن ئینسانی مسوڵمانەوە، واتە: شوێنکەوتنی قورئان لە هەموو ئەو لایەنانەدا، کە باسمانکرد، کاتێك بە کەڵك دێ و، لای خوای بەخشندە قبووڵ دەکرێت، کە لەسەر بناغەی گەردن بۆ کەچکردن و قەناعەت پێ بوون و قبووڵ کردن و خۆشویستن بێت، وەك دوایی لەکاتی هێنانەوەی ئایەتەکان دا باسی دەکەین، ئەوە زۆر بە ڕوونیی دیارە.

بەڵێ، پێنجەمین هەنگاوی هەڵسوکەوت کردنی ڕاست و دروست لەگەڵ قورئاندا، بۆ کەسێك بیەوێ بە شوێنکەوتووی قورئان لەقەڵەم بدرێ و، بیەوێ بە خاوەن بڕوا بەرانبەر بە قورئان لە قەڵەم بدرێ، بریتیە لە شوێنکەوتنی قورئان، ئنجا لە ڕاستی دا شوێنکەوتنی ئینسانی بڕوادار بۆ قورئان، وەك گوتمان: چ بۆ ڕاستییەکانی قورئان، کە لە بواری ئیمان و عەقیدەدا و لە بواری بوونناسیی دا دەیانخاتە ڕوو، وە چ بۆ یاسا و دەستوورەکانی، کە لە بواری تاکیی و



خێزانیی و کۆمەڵیی و دەوڵەتداریی دا دەیانخاتە ڕوو، وە چ بۆ حیکمەتەکانی و ئەو ئامۆژگاریی و پەندانەی، کە تێیدان، چ پەیوەندییان بە تاکەوە هەبێ، چ بە خێزان و چ بە کۆمەڵەوە، وە چ بۆ ئەو ئاراستەکردن و ئەو تەعلیماتەی، کە گرتوونیە نێو خۆی، شوێنکەوتنی ئینسانی مسوڵمان و گەردنکەچکردنی بۆ هەموو ئەو لایەنانەی قورئان، دەبێ لە ڕووی نەك تەنیا قەناعەت پێ بوون، بەڵکو لە ڕووی زۆر پێخۆشبوون و، زۆر خۆ بەبەهرەمەند بینینەوە بێت.

واتە: ئینسانی مسوڵمان دەبێ زۆر خۆی بە مەمنوونی خوای پەروەردگار بزانێ و، خۆی بە قەرزدار بزانێ، کە کتێبی بۆ ناردوە، دواییش یارمەتی داوە، کە بیخوێنێ و تێی بگات، پاشان یارمەتی داوە، کە ئەو قورئانە کاری تێ بکا و دوای بکەوێ و لێی بەهرەمەند بێ، ئنجا بۆی گەردن کەچ بێ! وە خۆی زۆر بە خاوەن نیعمەت بزانێ، هەر بۆیە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام لە یەکێ لە فەرمایشتەکانی دا دەفەرموێ:

(خيركم من تعلَّم القرآن و علَّمه) رواه البخاري عن عثمان (رضي الله عنه).

واتە: باشترینی ئێوە کەسێکە فێری قورئان بێت و قورئان فێری خەڵك بکات.

کەواتە: کە تۆ فێری قورئان بووی و، خوای بەخشەر یارمەتی داوی فێری خوێندنەوەی ببی و، فێری لێ تێگەیشتنی ببی، فێری ئیش پێ کردنی ببی، مانای وایە چوویە ڕیزی ئەو کەسانەوە، کە پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام موژدەی ئەوەی پێداون، کە بە چاکترین کەس لە قەڵەم دراون!

ئنجا کاتێك ئینسان وەبەر ئەو موژدەیەی پێغەمبەر بکەوێ، دیارە دەبێ زۆر خۆشحاڵ بێ و، زۆریش سوپاسی خوای پەروەردگار بکات و، زۆر خۆی بەخاوەن نیعمەت بزانێ.

وە لە فەرمایشتێکی دیکەیدا پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام دەفەرموێ: هەر کەسێك، خوا لەبەرکردنی قورئانی پێ بدات (واتە: خوای بەبەزەیی لە کتێبی خۆی شارەزای بکات)، وە پێی وابێ کەسێکی دیکە هەیە لەو نیعمەتێکی



گەورەتری پێدراوە، ئەوە نیعمەتی هەرە مەزنی خوای بە بچووك تەماشا کردوە[1]!

خوای کاربەجێش لە سوورەتی (یونس)دا دەفەرمویٚ:

﴿يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ قَدۡ جَآءَتۡكُم مَّوۡعِظَةٞ مِّن رَّبِّكُمۡ وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ٥٧ قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ هُوَ خَيۡرٞ مِّمَّا يَجۡمَعُونَ ٥٨﴾

وەك دەبینین لێرەدا خوای میهرەبان بانگی مرۆڤایەتی دەکات و دەفەرمویٚ: ئەی خەڵکینە! لە پەروەردگارتانەوە ئامۆژگارییتان بۆ هاتوە {ئەو ئامۆژگارییە لە کوێوە هاتوە؟! لە پەروەردگارتانەوە، یانی خاوەن و مشوورخۆرتان و کاروبار هەڵسووڕێنەرتان و پەروەردەکارتان، ئنجا خوای پەروەردگار ئامۆژگاریی بنێریٚ بۆ بەندەکانی خۆی، کە دروستی کردوون و پەروەردەیان دەکات و دەیانژییێنیٚ، دەبیٚ چ ئامۆژگارییەك بیٚ؟! بە تەئکید دیارە ئامۆژگارییەکە، هیچ ئامۆژگارییەك نایگاتیٚ}، (وَشِفَآءٞ لِّمَا فِي ٱلصُّدُورِ) وە شیفا و چارەسەرە بۆ ئەوەی لە دەروونەکاندا هەیە، (وَهُدٗى وَرَحۡمَةٞ لِّلۡمُؤۡمِنِينَ ) وە ڕێنمایی و بەزەییشە بۆ ئیمانداران، ئنجا دوای ئەوە یەکسەر دەفەرمویٚ: ( قُلۡ بِفَضۡلِ ٱللَّهِ وَبِرَحۡمَتِهِۦ فَبِذَٰلِكَ فَلۡيَفۡرَحُواْ ) (ئەی موحەممەد!) تۆ بە ئۆممەتەکەت بڵیٚ، کە: با تەنیا بەخششی خوا و بەبەزەیی خوا، بەوە دڵخۆش بن.

دیارە بەخشش و ڕەحمەتی خواش، بەهۆی ئەو قورئانەوە، دەست ئینسان دەکەون، کە ئامۆژگاریی و شیفا و هیدایەت و ڕەحمەتە بۆ هەرکەسێك شوێنی بکەویٚ و، بە شوێن ئەو ڕێبازەدا بڕوات، کە قورئان خەڵکی بۆ ڕێنمایی دەکات، هەرکەسێك وابکات، ئەوە هەم دەبێتە خاوەنی بەخششی خوا لە بەهەشت دا و، هەم دەبێتە خاوەنی ڕەحمەت و بەزەیی خوای پەروەردگاریش لە دنیا و دوارۆژدا.

---

(١) {من أعطاه الله حفظ كتابه، فظن أن أحداً أُعطيَ أفضل مما أُعطي، فقد غَمَطَ أعظَمَ النعم} رواه البخاري في التأريخ، و البيهقي في شعب الإيمان، و السيوطي في الجامع الصغير برقم ٨٤٨١، وقال: ضعيف. و رواه الطبراني بهذا اللفظ: {من قرأ القرآن ثم رأى أن أحداً أوتي أفضل مما أوتي، فقد استصغر ما عَظَّمَهُ الله} و قال العراقي في تخريج أحاديث الإحياء (٣٦٢/١): سنده ضعيف.



## چەند ئایەتێك لەبارەی پێویست بوونی شوێنکەوتن و گەردنکەچبوونی مسوڵمانان بۆ کتێبی خوا و بەرنامەکەی

ئێستاش با لەم ئایەتانەوە ڕامێنین، کە خوا (جل شأنه) باسی ئەوەمان بۆ دەکات، کە ئەو کەسەی خۆی بە شوێنکەوتووی قورئان بزانێ و، خۆی بەشوێنکەوتووی پێغەمبەر بزانێ و بیەوێ بە بڕوادار بە قورئان لە قەڵەم بدرێ، دەبێ چۆن شوێن قورئان بکەوێ و، چۆن بۆی ملکەچ بێ؟!

١- ﴿ الٓمٓصٓ ﴿١﴾ كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ ﴿٢﴾ ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَۗ قَلِيلٗا مَّا تَذَكَّرُونَ ﴿٣﴾ ﴾ الأعراف.

واتە: ئەلیف، لام، میم، صاد. ئەمە کتێبێکە بۆ لات نێردراوەتە خوار، ئنجا با لەبارەیەوە هیچ سەغڵەتییەك لە سینەت دا نەبێ، تاکو (خەڵکی) پێ بترسێنی، وە بیرخەرەوەیە بۆ بڕواداران. شوێن ئەوە بکەون، کە لە پەروەردگارتانەوە بۆتان دابەزیوە، وە شوێن دۆست و پشتیوانانی دیکە مەکەون، کەم پەند وەردەگرن!

دەربارەی (الٓمٓصٓ): زۆربەی زانایان پێیان وایە، کە بەس خوا مانای ئەو پیتانە دەزانێ، بەڵام بۆ ئێمە و بۆ هەموو خەڵکی ئاماژەن، کە ئەم قورئانە فەرمایشتی خوایە، چونکە هەر لەو پیتانە پێکهاتوە (ألف، لام، میم، صاد) و باقی ئەو پیتانە، کە ئێمە قسەیان پێ دەکەین، کەچی مرۆڤ و جن لەبەرانبەریدا دەستەوستانن و ناتوانن سوورەتێکی بچووکیش بێنن، با سوورەتێکی وەك (الكوثر)یش بێ، کە تەنیا (٣) ئایەتە، کەواتە: ئەوە بەڵگەیە لەسەر ئەوە، کە ئەو قورئانە فەرمایشتی خوایە، ئەگەرنا خۆ هەر لەو پیتانە دروست بووە، کە ئێمە قسەیان پێ دەکەین، ئنجا ئەگەر فەرمایشتی جگەلە خوای پەروەردگار بووایە، ئەگەر هی پێغەمبەر بووایە، وەك کافرەکان دەیانگوت و دەڵێن، یاخود کەسێك ئەوەی فێری پێغەمبەر کردبایە، خۆ مەیدان مشکان نەکێڵاوە، دەبووایە ئەوانیش بتوانن

لەو پیتانە قورئانێکی ئاوا، نەخێر، دە (١٠) سوورەت، نا، بەڵکو سوورەتێکی بچووکی وەك یەکێك لە سوورەتەکانی بێنن!

ئنجا دەفەرموێ: (كِتَٰبٌ أُنزِلَ إِلَيۡكَ فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ) دیارە خوا سبحانه و تعالی پێغەمبەری خۆی دەدوێنێ و دەفەرموێ: ئەم کتێبە کتێبێکە بۆت نێرراوەتە خوار، کە هەم خۆت هیدایەتی پێ وەربگری و، هەم خەڵکی پێ هیدایەت بدەی، وەك خوا جل شأنه دەفەرموێ:

﴿... وَإِنَّكَ لَتَهۡدِيٓ إِلَىٰ صِرَٰطٖ مُّسۡتَقِيمٖ ۝٥٢﴾ الشورى.

دیارە تەنیا بەهۆی قورئانەوەیە، کە موحەممەد صلى الله عليه وسلم خەڵك ڕێنمایی دەکات، پاشان دەفەرموێ: (فَلَا يَكُن فِي صَدۡرِكَ حَرَجٞ مِّنۡهُ) با لە سینەتدا هیچ جۆرە سەغڵەتییەك نەبێ دەربارەی قورئان، واتە: بەرانبەر بە هیچ شتێکی قورئان، کە قورئان وەك گوتمان: ڕاستییەکان و ئەحکام و حیکمەت و تەعلیماتی گرتوونە نێو خۆی، بەرانبەر بە هیچ شتێکی قورئان هیچ جۆرە سەغڵەتییەك لە سینە و دڵی تۆدا نەبێت و، هەرچی قورئان فەرموویەتی، قبووڵت بێ و پێی ڕازی بە و، شوێنی بکەوە و، بۆی گەردن کەچ بە.

ئنجا ئامانجی نێررانەخواری قورئان دەخاتە ڕوو و دەفەرموێ: (لِتُنذِرَ بِهِۦ وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ) قورئان بۆیە بۆ تۆ هاتوە، تاکو خەڵکی پێ وریا بکەیەوە و، ڕاستییەکانیشی پێ وەبیر ئیمانداران بهێنیەوە، پاشان دەفەرموێ: (ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ)، ئەمجار شێوەی دواندن (خطاب)ەکە دەگۆڕێ بۆ ڕێژگە (صيغة)ی کۆ، چونکە قورئان بۆیە بۆ موحەممەد هاتوە، تاکو خەڵکی بە گشتی پێ ئاگادار بکاتەوە و (وَذِكۡرَىٰ لِلۡمُؤۡمِنِينَ) وە ئەهلی ئیمانیش بە تایبەت پەندی لێ وەرگرن و پێی بێدار ببنەوە و ڕاستییەکانیشی پێ وەبیر خۆیان بێننەوە، ئەو ڕاستییانەی خوا عز وجل لەگەڵ فیطرەت و سروشتیاندا تێکی هەڵشێلاون، ئنجا بە موحەممەد و ئۆممەتەکەی دەفەرموێ: (ٱتَّبِعُواْ مَآ أُنزِلَ إِلَيۡكُم مِّن رَّبِّكُمۡ) شوێنی ئەوە بکەون، کە لە پەروەردگارتانەوە بۆتان نێرراوەتە خوار، (وَلَا تَتَّبِعُواْ مِن دُونِهِۦٓ أَوۡلِيَآءَ) وە لەجیاتی قورئان، شوێن دۆست و پشتیوانانی

دیكه مه‌كه‌ون، چونكه (ولي) به‌مانای دۆست دێت، وه به مانای سه‌رپه‌رشتیار و مشوورخۆر دێ، واته: با جگه له قورئان مشوورخۆرێكی دیكه‌تان نه‌بێ و، به‌رنامه‌یه‌كی دیكه‌تان نه‌بێ، شوێنی بكه‌ون.

لێره‌دا جێی سه‌رنج ئه‌وه‌یه، كه خوا (جل شأنه) به‌راوردی كردوه له نێوان قورئان و (أولياء) دا، واته هه‌ر كه‌سێ به‌دوای قورئان نه‌كه‌وت، دیاره جگه له قورئانی كردوه به سه‌رپه‌رشتیارو به گه‌وره‌و مشوورخۆری خۆی و، به به‌رنامه‌ڕێژو حوكمڕانی خۆی.

وه له كۆتایی دا ده‌فه‌رموێ: (قَلِيلًا مَّا تَذَكَّرُونَ) دیاره قسه له‌گه‌ڵ خه‌ڵكییه به گشتی، كه له نێوانیان دا ئیماندارانیش ده‌گرێته‌وه، ده‌فه‌رموێ: كه‌م بیر ده‌كه‌نه‌وه، یان كه‌م په‌ند وه‌رده‌گرن، كه‌مه‌كانیش بریتین له ئیمانداره‌كان، به‌ڵام خه‌ڵكه‌كه‌ی دیكه په‌ند وه‌رناگرن و بیر ناكه‌نه‌وه.

**٢-** وه هه‌ر له‌و باره‌وه له ئایه‌تی ژماره (١٠٦)ی سووره‌تی (الأنعام)یشدا ده‌فه‌رموێ:

﴿ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ ۖ وَأَعْرِضْ عَنِ ٱلْمُشْرِكِينَ ﴿١٠٦﴾﴾

واته: دوای ئه‌وه بكه‌وه، كه له په‌روه‌ردگارته‌وه بۆت ڕه‌وانه كراوه، بێجگه له‌و، په‌رستراوێكی دیكه نیه، وه ڕوو له هاوبه‌ش په‌یداكه‌ران وه‌رگێڕه.

شایانی باسیشه، كه هاتنی ڕسته‌ی: (لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ) پاش فه‌رمان كردنی خوا (عز وجل) به شوێنكه‌وتنی كتێب و به‌رنامه‌ی له ڕێی وه‌حییه‌وه نێرراوی، ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نێ كه: هه‌ر كه‌سێك دوای قورئان بكه‌وێ ئه‌وه دیاره خوای كردوه به په‌رستراو (إله)ی خۆی و، هه‌ركه‌سێ دوای جگه له قورئان بكه‌وێ، دیاره جگه له خوای كردوه به په‌رستراوی خۆی، ئه‌وه زۆر جێی سه‌رنجه! چونكه ئه‌م ئایه‌ته لێی وه‌رده‌گیرێ، كه خوا به‌یه‌ككگرتن (توحيد) ئه‌وه‌یه، كه تۆ بۆ شه‌ریعه‌تی خوا ملكه‌چ بی و، شوێنی بكه‌وی و، هه‌ر كه‌س دوای جگه له ئیسلام بكه‌وێ، مانای وایه موشریكه و جگه‌له خوا ده‌په‌رستێ، بۆیه ده‌فه‌رموێ: (ٱتَّبِعْ مَآ أُوحِىَ إِلَيْكَ مِن رَّبِّكَ ۖ لَآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَ) واته: چونكه بێجگه له خوا په‌رستراوێكی دیكه نیه، دوای ئه‌و په‌یام و به‌رنامه‌یه بكه‌وه، كه له‌وه‌وه



بۆت ڕەوانە کراوە، یانی بۆ ئەوەی ببیە یەکتاپەرست (موحِّد)، دەبێ دوای بەرنامەکەی خوا و شەریعەتەکەی بکەوی. ﴿وَأَعۡرِضۡ عَنِ ٱلۡمُشۡرِكِينَ﴾ وە ڕوو لە موشریکەکان وەرگێڕە و، پشتیان تێ بکە و، وێڵیان بکە و، مەکەوە ژێر کاریگەرییان، بۆ ئەوەی لە ڕێبازی خوا لات نەدەن و، تووشی شیرکت نەکەن، چونکە هەر کەسێك شوێن ڕێبازی جگە لە خوا بکەوێ، مانای وایە دووچاری شیرك بووە، وە شەریك بۆ خوا بڕیاردان، دوو بواری سەرەکی هەن:

## یەکەم: بواری دروشمەکانی خواپەرستی (شعائر التعبد):

کە ئەو خواپەرستییانەن، ئینسان بۆ خۆی وەك تاك ئەنجامیان دەدات و، زیاتر پەیوەندییان بە لایەنی ڕووحیی و مەعنەوییەوە هەیە، وەك ئیمان و عەقیدە و بووناسیی، پاشان نوێژ و ڕۆژوو و زەکات و زیکر و پاڕانەوە و قوربانیی و سەربڕین و سوێند خواردن و...هتد.

واتە: تۆ ئەگەر بتەوێ بزانی، کە کەسێك مسوڵمانە یان نا؟ تەماشا دەکەی داخۆ ئەو دروشم و نیشانانەی مسوڵمانەتیی و دینداریی تێدا هەن یان نا؟ زەکات و حەجی هەیە یان نا؟ لە خوا دەپاڕێتەوە یان لە جگە لە خوا؟ لە خوا دەترسێ، یان لە جگە لە خوا؟ خوای پەروەردگاری لە هەموو شتێك خۆشتر دەوێ؟ یان جگە لە خوا؟! پشتی بە خوا دەبەستێ، یان بە جگە لە خوا؟! ئەمانە هەموویان درووشمن، لە دەروونا بن یان دەربکەون، ئەوە بواری یەکەمی خوا بەیەکگرتن و بەندایەتیی بۆ خوا کردنە.

## بواری دووەم: بریتیە لە بەرنامەکانی ژیان (شرائع الحیاة):

کە پەیوەندییان بە لایەنی سیاسی و، کۆمەڵایەتی و، ئابووریی و، جەنگ و ئاشتیی و، پەیوەندییە سیاسییەکان و ...هتدەوە هەیە.

ئنجا لە هەرکام لەم دوو بوارەدا، ئینسان ڕوو لە جگە لە ئیسلام بکات، مانای وایە تووشی شیرك بووە، واتە: وەك چۆن کەسێك سەجدە و ڕکووع بۆ جگە لە خوا بەرێ و، لەبەر جگە لە وی بپاڕێتەوە و، جگە لە وی، وەك وی

خۆشبوێ، یان لەوی خۆشتر بوێ! یان لە جگە لە خوا بترسێ، وەك لە خوا دەترسێ، یان زیاتریش، وەك چۆن ئەوانە شیركن و خاوەنەكەیان تووشی شیرك بووە، بەهەمان شێوەش كەسێك لە بواری حەڵاڵ و حەرامدا، لە بواری یاساكانی ژیاندا، بەدوای ئایین و بەرنامەیەكی دیكەی جگە لە ئیسلام بكەوێ، ئەویش هەر تووشی شیرك بووە و، چۆتە ڕیزی هاوبەش بۆ خوا دانەران (مشركین)ەوە، هەر بۆیەش خوای كاربەجێ دوای ئەوەی هاوبەش دانەرە بتپەرستەكانی مەككە، وەك سەفسەطەیەك بە مسوڵمانانیان دەگوت[1]:

(كَيفَ تَزْعُمونَ أَنَّكُم تَتَّبِعُون مَرضاة الله، وما قَتَلَهُ اللهُ فلا تَأْكُلُونَهُ، وما ذَبَحْتُم أَنتُم تَأكُلُونَه؟!).

واتە: چۆن پێتان وایە شوێن ڕەزامەندیی خوا دەكەون؟ لە حاڵەتێك دا ئەوەی، كە خوا كوشتوویەتی (واتە: مردار) نایخۆن، بەڵام ئەوەی خۆتان سەری دەبڕن دەیخۆن؟!

لە وەڵامیان دا خوای پەروەردگار ئەم ئایەتەی ناردەخوار:

﴿ وَإِنَّ ٱلشَّيَٰطِينَ لَيُوحُونَ إِلَىٰٓ أَوۡلِيَآئِهِمۡ لِيُجَٰدِلُوكُمۡۖ وَإِنۡ أَطَعۡتُمُوهُمۡ إِنَّكُمۡ لَمُشۡرِكُونَ ١٢١ ﴾ الأنعام

واتە: وە شەیطانەكان خوتخوتە بۆ دۆستەكانیان دەكەن، تاكو شەڕەقسەتان لەگەڵ بكەن، وە ئەگەر بە قسەیان بكەن، ئەوە ئێوە هاوبەش دانەرن.

دیارە مەبەستی هاوبەش دانەر و بتپەرستەكان ئەوە بووە، كە ئاژەڵی مردار (میتة) مادام خوا سبحانە و تعالی مراندوویەتی، دەبوایە حەڵاڵ بێت، وەك چۆن ئەوەی، كە خەڵكی سەری دەبڕن، حەڵاڵە! بەڵام بێگومان ئەم قسەیە جگە لە سەفسەطە هیچی دیكە نیە، هەر بۆیەش خوای زانا و شارەزا دەریخستوە، كە ئەوە خوتخوتەی شەیطانەكانە، بۆیان كردوون، ئەگەرنا بێگومان خوای كاربەجێ

---

(١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير) ص٤٤٤، وە (تفسير الطبري) ج١٢ ص٨١.
بۆ تەفسیری تێروتەسەلی ئەم ئایەتەش، بڕوانە: بەرگی پێنجەمی: تەفسیری قورئانی بەرز و بەڕێز، كە سوڕەتی ئەنعامی گرتۆتەخۆی.



جگە لە شتی پیس و زیانبەخش قەدەغە ناکات و، هەرچی حەڵاڵیشی کردوە، پاك وچاکە، وەك فەرموویەتی:

﴿وَيُحِلُّ لَهُمُ ٱلطَّيِّبَٰتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيۡهِمُ ٱلۡخَبَٰٓئِثَ﴾ الأعراف: ١٥٧.

بەڵێ، خوای پەروەردگار وەك چۆن لە سەری فەرز کردووین لەو عیبادەتە شەخسییانەدا، کە ئەنجامیان دەدەین، هاوبەش بۆ خوا دانەنێین، لەسەریشی فەرز کردووین، کە لە حوکمی خواشدا، هاوبەش دانەنێین، وەك لە کۆتایی سوورەتی (الکهف)دا دەفەرموێ:

﴿فَلۡيَعۡمَلۡ عَمَلٗا صَٰلِحٗا وَلَا يُشۡرِكۡ بِعِبَادَةِ رَبِّهِۦٓ أَحَدَۢا ١١٠﴾

واتە: با کردەوەی باش بکات و، هیچ کەسێك لە بەندایەتیی بۆ خوادا، نەکاتە هاوبەش، واتە: ئەو عیبادەتەی، کە ئەنجامی دەدا بۆ خوا، با بەشی کەسی دیکەی تێدا نەبێ.

وە هەر لە سوورەتی (الکهف)دا دەفەرموێ:

﴿وَلَا يُشۡرِكُ فِي حُكۡمِهِۦٓ أَحَدٗا ٢٦﴾

واتە: خوا هیچ کەسێك لە حوکمی دا ناکاتە هاوبەش، واتە: خوا حەقی نەداوە بە کەس، کە حەڵاڵ و حەرام دابنێ.

وە لە سوورەتی (الشوری)دا خوای باڵادەست، کەسانێك کە حەڵاڵ و حەرام بۆ خەڵکی دیاریی دەکەن و شەریعەت و بەرنامەی ژیانیان بۆ دیاریی دەکەن، بەهاوبەش و شەریکی خۆی لەقەڵەمی داون، دەفەرموێ:

﴿أَمۡ لَهُمۡ شُرَكَٰٓؤُاْ شَرَعُواْ لَهُم مِّنَ ٱلدِّينِ مَا لَمۡ يَأۡذَنۢ بِهِ ٱللَّهُۚ ...﴾ الشوری :٢١.

واتە: ئایا موشریکەکان چەند شەریکێکیان هەن، کە بۆ خۆیانیان بڕیار داون و دینیان بۆ دادەنێن ( و بەرنامەی ژیانیان بۆ دادەنێن، حەڵاڵ و حەرامیان بۆ دیاریی دەکەن) لەحاڵێك دا خوا ڕێگای پێ نەداوە؟!

هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٣١)ی سوورەتی (التوبة)دا خوای پەروەردگار لەبارەی ئەو جوولەکە و دیانانەوە، کە لە بواری ئەمر و نەهی و حەڵاڵ و حەرام دا، شوێن زانا و دەمڕاستەکانیان دەکەون، فەرموویەتی:



﴿ ٱتَّخَذُوٓاْ أَحۡبَارَهُمۡ وَرُهۡبَٰنَهُمۡ أَرۡبَابًا مِّن دُونِ ٱللَّهِ وَٱلۡمَسِيحَ ٱبۡنَ مَرۡيَمَ وَمَآ أُمِرُوٓاْ إِلَّا لِيَعۡبُدُوٓاْ إِلَٰهًا وَٰحِدًاۖ لَّآ إِلَٰهَ إِلَّا هُوَۚ سُبۡحَٰنَهُۥ عَمَّا يُشۡرِكُونَ ٣١ ﴾.

واته: زانا و ڕاهیبەكانی خۆیانیان و مەسیحی كوڕی مەریەمیان لەجیاتی خوا كردنە پەروەردگار، هەرچەندە فەرمانیشیان پێنەكرابوو، كە جگە لە یەك پەرستراو، بپەرستن، جگە لەو هیچ پەرستراو نین، پاكیی بۆوی لەوەی، دەیكەنە هاوبەشی.

ئنجا ئەو فەرموودەیەی پێغەمبەریش صلى الله علیه وسلم زیاتر تیشك دەخاتە سەر چەمك و واتای ئەم ئایەتە:

(عن عدي بن حاتم أنه قال: يا رسول الله ما عبدوهم! فقال: بلى، إنهم أحلّوا لهم الحرام، و حرّموا عليهم الحلال، فاتّبعوهم فذلك عبادتهم إيّاهم) رواه الترمذي.

واته: عەدی كوڕی حاتەمی تەی - كاتێك گوێی لە پێغەمبەری خوا صلى الله علیه وسلم بوو، ئەم ئایەتەی خوێندەوە - گوتی: ئەی پێغەمبەری خوا، نەیاندەپەرستن! فەرمووی: با، چونكە حەڕامیان بۆ حەڵاڵ دەكردن و، حەڵاڵیان لێ حەڕام دەكردن و، ئەوانیش شوێنیان كەوتن، ئیدی ئەوەش پەرستنیانە بۆیان - واتە: بۆ زانا و ڕاهیبەكانیان -!

٣- وە خوا لە ئایەتی ژمارە (١٥٥)ی سوورەتی (الأنعام)دا فەرموویەتی:

﴿ وَهَٰذَا كِتَٰبٌ أَنزَلۡنَٰهُ مُبَارَكٞ فَٱتَّبِعُوهُ وَٱتَّقُواْ لَعَلَّكُمۡ تُرۡحَمُونَ ١٥٥ ﴾.

واته: ئەم قورئانە كتێبێكە ناردوومانە بۆ لای تۆ، پڕ بەرەكەت و بە پێزە، شوێنی بكەون و پارێز بكەن، بەڵكو ڕەحمتان پێ بكرێ.

كەواتە: كاتێك تۆ بە پارێزكار (متقي) لە قەڵەم دەدرێی، كە شوێنی قورئان بكەوی و پێوەی پابەند بی، لە هەموو بوارەكانی ژیاندا و، بیكەی بە مامۆستا و چاوساغی خۆت.

(مبارك) واته: پڕ بەرەكەت، بە پێز، زۆر كەس وشەی (مبارك) لەگەڵ وشەی (مقدّس) لێك جیاناكەنەوە، وشەی (مقدّس) یانی پیرۆز، پاك و پیرۆز، بەڵام (مبارك) یانی بەبەرەكەت و بەپێز.



ده‌گوترێ: ئه‌و زه‌وییه‌ زه‌وییه‌كی به‌به‌ره‌كه‌ته‌، واته‌: به‌رهه‌می زۆره‌، یان بۆ نموونه‌ ده‌گوترێ: فلان كه‌س ئینسانێكی موباره‌كه‌، واته‌ به‌رهه‌م و به‌ره‌كه‌تی هه‌یه‌، قورئان كتێبێكی موباره‌كه‌، واته‌: به‌رهه‌م و به‌ره‌كه‌تی هه‌یه‌.

ئنجا ئایا (تقوى) به‌ چی په‌یدا ده‌بێ؟ بێگومان به‌ شوێنكه‌وتنی به‌رنامه‌ و شه‌ریعه‌تی خوای به‌به‌زه‌یی په‌یدا ده‌بێ، چونكه‌ (تقوى) یانی خۆپاراستن له‌ هه‌ر شتێك، كه‌ خوا پێی ناخۆشه‌، ئنجا خوا دوو شتی پێ ناخۆشن: ئه‌و واجبانه‌ی فه‌رزی كردوون، بیانچوێنی، پێی ناخۆشه‌، وه‌ ئه‌و قه‌ده‌غانه‌ی دیاری كردوون بیانشكێنی، پێی ناخۆشه‌، چواندنی واجبه‌كان و شكاندنی قه‌ده‌غه‌كان، خوا هه‌ردووكیانی پێناخۆشه‌، قورئانیش هه‌م فه‌رزه‌كانی تێدان و، هه‌م حه‌رامكراوه‌كانی تێدان، به‌ڵێ كه‌سێك به‌ پارێزكار (متقي) له‌ قه‌ڵه‌م ده‌درێ، كه‌ هه‌رچی خوا فه‌رزی كردوه‌، پێوه‌ی پابه‌ند بێ و، ئه‌نجامی بدا، به‌ پێی توانا، وه‌ هه‌رچی خوا قه‌ده‌غه‌ی كردوه‌، خۆی لێ دوور بگرێ، ئنجا ئایا ئه‌و حه‌ڵاڵ و حه‌رامانه‌ كێ دیاریی كردوون و، له‌ كوێدا دیاریی كراون؟! بێگومان له‌ قورئاندا، كه‌واته‌: به‌بێ شوێنكه‌وتنی قورئان ته‌قوا په‌یدا نابێ، دیاره‌ ئینسانیش ناتوانێ شوێن قورئان بكه‌وێ، تاكو لێی تێنه‌گا و لێی حاڵی نه‌بێ، هه‌ر بۆیه‌ش هه‌موو ئه‌وانه‌ی، كه‌ له‌ بواری ته‌زكیه‌ی نه‌فس و لایه‌نی ڕووحیی و مه‌عنه‌ویی دا، له‌ قورئان دووركه‌وتوونه‌ته‌وه‌، ته‌قوایه‌كه‌یان به‌كه‌ڵك نایه‌ت، بۆچی؟!

چونكه‌ ته‌قوا ته‌نیا بۆ كه‌سێك فه‌راهه‌م دێ، كه‌ به‌دوای قورئان بكه‌وێ، ته‌قوا به‌س له‌ ڕێی قورئانه‌وه‌ ده‌ستگیرده‌بێ، چونكه‌ ته‌قوا یانی: خۆپاراستن و ئه‌وه‌. كه‌ تۆ سوپه‌ر و قه‌ڵغانێك بۆخۆت په‌یدابكه‌ی له‌به‌رانبه‌ر تووڕه‌یی خوادا.

ئنجا ئایا خوا به‌ چی تووڕه‌ ده‌بێ؟ دیاره‌ به‌وه‌. كه‌ واجبه‌كانی بچوێنی، یان قه‌ده‌غه‌كانی بشكێنی، واجبه‌كانی خوای به‌رز و مه‌زنیش، هه‌روه‌ها قه‌ده‌غه‌كراوه‌كانیشی، له‌ قورئاندا ڕوونكراونه‌وه‌ و، سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ریش علیه الصلاة والسلام هه‌ر ڕوونكردنه‌وه‌ی جێ به‌جێ كردنی قورئانه‌.

پاشان خوای (عز وجل) فه‌رموویه‌تی: (لَعَلَّكُمْ تُرْحَمُونَ ) واته‌: ئه‌گه‌ر ده‌تانه‌وێ ڕه‌حمتان پێ بكرێ و به‌زه‌ییتان له‌گه‌ڵدا بنوێنرێ، له‌ لایه‌ن خوای به‌به‌زه‌ییه‌وه‌، ئه‌وه‌



دوای ئەو كتێبە موبارەك و پڕ بەرەكەتە بكەون، بۆ ئەوەی تەقواتان پەیدا بێ، وەسەرەنجام شایستەی ئەوە بن، كە خوا بەزەیی پێتاندا بێتەوە.

**٤-** وە خوای بەرز لە ئایەتی ژمارە (١٠٩)ی سوورەتی (یونس)یش دا، ڕوو بە پێغەمبەر صلی الله علیه وسلم دەفەرمویٚ:

﴿ وَٱتَّبِعۡ مَا يُوحَىٰٓ إِلَيۡكَ وَٱصۡبِرۡ حَتَّىٰ يَحۡكُمَ ٱللَّهُۚ وَهُوَ خَيۡرُ ٱلۡحَٰكِمِينَ ﴿١٠٩﴾ ﴾

واتە: وە شوێن ئەوە بكەوە، كە بۆت نێردراوە و بۆت دەنێررێ، وە خۆت ڕابگرە هەتا خوا حوكم دەكات، كە بێگومان ئەو چاكترین حوكمڕان - یان دادوەر - ە.

(حاكم) هەم بە مانای حوكمڕان دێ، كە بە تەئكید فەرمانڕەوای ڕەها (مطلق) هەر خوایە، هەم بەمانای دادوەر دێت، واتە: ئەو كەسەی دادوەریی و قەزاوەت لە نێوان خەڵكی دا دەكات، كە بە تەئكید خوای پاك و تاك، چاكترین و دادگەرترین دادوەرە.

لێرەشدا دیسان خوا (جل شأنه) دواندن (خِطاب)ەكەی لەگەڵ پێغەمبەرە علیه الصلاة والسلام، بەڵام دیارە موحەممەدیش پێغەمبەری سەرجەم مرۆڤایەتییە و، كۆتا پەیام و بەرنامەی خوای بێ هاوەڵی بۆ هاتوە، وە دوایین ڕەوانەكراوی خواشە بۆ لای مرۆڤایەتیی و، نە لە دوای وی علیه الصلاة والسلام پێغەمبەرێكی دیكە دێ، وە نە لەدوای قورئانیش كتێبێكی دیكە دێتە خوارێ.

ئنجا وەك لە وانەكانی ڕابردوودا گوتمان: هەموو ئەو دواندنانەی، كە خوای كاربەجێ ئاڕاستەی موحەممەدیان دەكات، ئەوە هەموو مرۆڤایەتیی دەگرنەوە، چونكە مرۆڤایەتیی هەمووی ئوممەتی پێغەمبەرە علیه الصلاة والسلام، ئنجا ئەوەی، كە وەڵامی داوەتەوە، پێی دەگوترێ: ئوممەتی وەڵامدەرەوە، ئەوەی بەدەم بانگی پێغەمبەرەوە هاتوە، وە ئەوەی وەڵامیشی نەداوەتەوە، ئەویش پێغەمبەر بانگەوازی خۆی هەر ئاڕاستە كردوە، وەك خوا دەفەرمویٚ:

﴿ قُلۡ يَٰٓأَيُّهَا ٱلنَّاسُ إِنِّي رَسُولُ ٱللَّهِ إِلَيۡكُمۡ جَمِيعًا .. ﴾ الأعراف: ١٥٨

واتە: بڵێ ئەی خەڵكینە! من پێغەمبەری خوام و ڕەوانەكراوی خوام بۆ لای هەمووتان.



یان ده‌فه‌رمویّ:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ﴿٢٨﴾ ﴾ سبأ.

واته‌: وه‌ تۆمان ڕه‌وانه‌ نه‌كردوه‌، مه‌گه‌ر بۆ تێكڕای خه‌ڵكی، كه‌ دڵخۆشكه‌ر و موژده‌ده‌ریان بی، وه‌ ترسێنه‌ر و بێداركه‌ره‌وه‌یان بی، به‌ڵام زۆربه‌ی خه‌ڵكی نازانن.

**٥-** وه‌ له‌ سووره‌تی (النساء) له‌ ئایه‌تی (٦٥)دا، كه‌ نموونه‌ی كۆتاییه‌ له‌و ئایه‌تانه‌ی ئێمه‌ به‌ نموونه‌ هێناومانه‌وه‌، خوا (جل شأنه) ڕوو له‌ پێغه‌مبه‌ر ده‌كا و پێی ده‌فه‌رمویّ:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤۡمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيۡنَهُمۡ ثُمَّ لَا يَجِدُواْ فِيٓ أَنفُسِهِمۡ حَرَجٗا مِّمَّا قَضَيۡتَ وَيُسَلِّمُواْ تَسۡلِيمٗا ﴿٦٥﴾ ﴾ .

واته‌: نه‌خێر سوێند به‌ په‌روه‌ردگارت! بڕوا ناهێنن، تاكو له‌وه‌دا، كه‌ تێیدا ده‌كه‌ونه‌ كێشه‌وه‌، تۆ نه‌كه‌نه‌ دادوه‌ر، پاشان له‌به‌رانبه‌ر بڕیاری تۆدا، هه‌ست به‌ هیچ سه‌غڵه‌تییه‌ك نه‌كه‌ن، وه‌ به‌ته‌واویی گه‌ردن كه‌چ نه‌بن.

له‌باره‌ی هاتنه‌خواره‌وه‌ی ئه‌م ئایه‌ته‌وه‌، توێژه‌ره‌وانی قورئان چه‌ند به‌سه‌رهاتێكیان گێڕاونه‌وه‌، كه‌ ئه‌مه‌ یه‌كێكیانه‌:

{(ابن كثیر) له‌ ته‌فسیره‌كه‌یدا له‌ (الحافظ أبو إسحاق ابراهیم بن عبدالرحمن بن إبراهیم بن دحیم)ه‌وه‌ هێناویه‌تی كه‌:

دوو پیاو له‌سه‌ر مه‌سه‌له‌یه‌ك ده‌بێته‌ مشت و مڕیان و، ده‌چنه‌ خزمه‌ت پێغه‌مبه‌ر صلی الله علیه وسلم، ئه‌ویش بڕیار بۆ خاوه‌ن هه‌ق (مُحِق) ده‌دات به‌سه‌ر بابای ناهه‌ق (مُبطل) دا، كابرای بڕیار له‌سه‌ردراویش ده‌ڵیّ: ڕازی نیم! هاوه‌ڵه‌كه‌یشی پێی ده‌ڵیّ: ئه‌دی چیت ده‌ویّ؟ ده‌ڵیّ: ده‌چینه‌ لای ئه‌بووبه‌كری صیددیق، ده‌چنه‌ لای و بابای بڕیار بۆدراو ده‌ڵیّ: چووینه‌ لای پێغه‌مبه‌ر صلی الله علیه وسلم به‌ قازانجی من دادوه‌ریی كرد! ئه‌بووبه‌كریش - خوا لێی ڕازی بیّ - ده‌ڵیّ: ئنجا پێغه‌مبه‌ری خوا (صلی الله علیه وسلم) چۆنی دادوه‌ریی



کردوە، هەرئەوە بڕیارە و پێیەوە پابەند بن! بەڵام دیسان هاوەڵەکەی ڕازی نابێ و دەڵێ: با بچینە لای عومەری کوڕی خەتتاب، ئیدی دەچنە لای و بابای بردووەوە دەڵێ: کێشەکەمانمان بردە لای پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم و، بەقازانجی من بڕیاری دا، بەڵام ئەمە ڕازی نەبوو! عومەری کوڕی خەتتابیش - خوا لێی ڕازی بێ - لێی پرسی؟ کابراش گوتی: وایە، ئنجا عومەر چووە ژوورەکەیەوەو هاتەدەرێ و شمشێری هەڵکێشراوی بەدەستەوە بوو، ئیدی لەسەری ئەو کابرایەی دا، کە ڕازی نەدەبوو و کوشتی، خواش ئەمەی ناردەخوارێ: ﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ... ﴾}[1].

شایانی باسیشە، کە هەندێك لە توێژەرەوانی قورئان دەڵێن: چ ئەم ئایەتەی، کە قسەی لەبارەوە دەکەین و، چ ئایەتەکانی پێشووشی، کە لە ئایەتی ژمارە (٦٠)ەوە دەست پێ دەکەن، هۆی هاتنەخوار (سبب النزول)یان بەسەرهاتێکی دیکەیە، کە دوای تۆزێك باسی دەکەین، سەرەتا با ئایەتی ژمارە (٦٠) بێنین و مانای بکەین:

﴿أَلَمْ تَرَ إِلَى ٱلَّذِينَ يَزْعُمُونَ أَنَّهُمْ ءَامَنُوا۟ بِمَآ أُنزِلَ إِلَيْكَ وَمَآ أُنزِلَ مِن قَبْلِكَ يُرِيدُونَ أَن يَتَحَاكَمُوٓا۟ إِلَى ٱلطَّٰغُوتِ وَقَدْ أُمِرُوٓا۟ أَن يَكْفُرُوا۟ بِهِۦ وَيُرِيدُ ٱلشَّيْطَٰنُ أَن يُضِلَّهُمْ ضَلَٰلًۢا بَعِيدًا ﴿٦٠﴾﴾

واتە: ئایا سەرنجی ئەوانە نادەی، کە پێیان وایە ئیمانیان بەوە هێناوە، کە بۆ تۆ نێرراوەتە خوار، وە بەوەش، کە پێش تۆ نێرراوەتە خوار، کەچی دەیانەوێ دادوەریی بەرنە لای طاغووت، هەرچەندە فەرمانیشیان پێکراوە بڕوای پێنەکەن! وە شەیطان دەیەوێ بە گومڕاییی دوور گومڕایان بکات؟!

ئەو بەسەرهاتەش، کە بۆتە هۆی هاتنەخواری ئەم ئایەتە و ئایەتەکانی دواییشی، وەك (طبري) و (ابن كثير)[2] و زۆرێك لە توێژەرەوان گوتوویانە،

---

(١) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير) ص٣٠٥.

(٢) بڕوانە: (المصباح المنير في تهذيب تفسير ابن كثير) ص٣٠٤.



ئەوەیە، کە پیاوێکی ئەنصاریی و پیاوێکی جوولەکە لەسەر شتێك مشت و مڕیان دەبێ، ئنجا هەرچی جوولەکەکەیە دەڵێ: (بيني و بينك محمدٌ) واتە: با بچینە لای محمد بۆ دادوەریی، بەڵام کابرای دیکە دەڵێ: (بيني و بينك كعب بن الأشرف) یانی با کەعبی کوڕی ئەشرەفمان لە نێوان دا بێ بۆ دادوەریی، دیارە کەعبی کوڕی ئەشرەفیش سەرۆکی جوولەکەکانی خەیبەر بووە.

کەواتە: خوای پەروەردگار و کاربەجێ ناوی لە (كعب بن الأشرف) ناوە (طاغوت)، بۆچی؟ چونکە بێگومان جگەلەوە حوکمی کردوە، کە خوا ناردوویەتە خوار و، هەر کەسێکیش بەجگەلە کتێب و بەرنامەی خوا حوکم بکات، ئەوە طاغووتە.

ئنجا هەرچەندە (أبو جعفر الطبري) لە مانای (طاغوت) دا گوتوویەتی: (هو كل معبود سوى الله تعالى) واتە: طاغووت هەر پەرستراوێکە جگەلە خوای بەرز، بەڵام من پێم وایە بە سەرنجدانی ئەو ئایەتانەی، کە وشەی طاغووتیان تێدا هاتوە، دەردەکەوێ، کە (طاغوت) بەو حوکمڕانە ملهوڕانە دەگوترێ، کە خۆسەپێنەرانە حوکمڕانیی بەسەر خەڵکی دا دەکەن و، بە ئارەزووی خۆیان حوکم و بڕیار دەردەکەن، واتە: هەموو ئەو شتانەی، کە خەڵك دەیانپەرستن، بێئەوەی ئیرادە و ئاگاییان هەبێ، وەك: مانگ و خۆر و بت و صەنەم و...هتد بە طاغووت دانانرێن، هەرچەندە دەشپەرسترێن.

پێناسەی (راغب الأصفهاني)یش بۆ وشەی (طاغوت) زیاتر ئەوە دەگەیەنێ، کە گوتمان، چونکە دەڵێ:

(... فعبارة عن كلِّ مُتعدٍّ، و لِما تقدّم سُمِّي السّاحِرُ و الكاهِن و المارد من الجنِّ و الصارِفُ عن طريق الخير طاغوتاً) (١)

واتە: (طاغووت) بریتیە لە هەر سنووربەزێنێك ئنجا لەبەرئەوە، کە ڕابرد: جادووگەر و فاڵچیی و جندی سەرکەش و، هەر کەسێك، کە خەڵکی لە ڕێی چاکە لابدات، ناونراوە طاغووت.

---

(١) بڕوانە: (مفردات ألفاظ القرآن) ص٥٢١.



به‌ڵێ ئه‌و ئایه‌تانه هه‌موویان - واته له ئایه‌تی ژماره (٦٠)ه‌وه تاكو (٦٥)- به‌و بۆنه‌یه‌وه هاتوونه‌ته خوارێ، كه بابایه‌ك یان كه‌سانێكی خۆ به بڕوادار زان ئاماده‌نه‌بوون، بۆ چاره‌سه‌ری كێشه و گرفته‌كانیان، بگه‌ڕێنه‌وه لای شه‌ریعه‌تی خوا و پێغه‌مبه‌ری خوا صلى الله عليه وسلم، بۆیه خوای كاربه‌جێ له ئایه‌تی كۆتایی ئه‌و كۆمه‌ڵه ئایه‌ته‌دا فه‌رموویه‌تی:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴾.

واته: نه‌خێر سوێند به په‌روه‌ردگارت، ئه‌وانه به‌بڕوادار دانانرێن، تاكو تۆ نه‌كه‌نه دادوه‌ر بۆ چاره‌سه‌ری كێشه و گرفته‌كانیان، ئنجا ته‌نیا به‌وه‌نده‌ش به بڕوادار و مسوڵمان دانانرێن له ته‌رازووی خوای كاربه‌جێ و دادگه‌ردا، كه هه‌موو كێشه و دووبه‌ره‌كییه‌كانیان بێننه‌وه بۆ لای ته‌رازووی شه‌ریعه‌ت، به‌ڵكو ده‌بێ له ده‌روونیشیاندا هه‌ست به‌هیچ سه‌غڵه‌تییه‌ك نه‌كه‌ن، وه‌ختێ حوكمیان به‌سه‌ردا ده‌رێ، با حوكمه‌كه‌ش به زیانی وان بێت، له ده‌روونیان دا نابێ هیچ سه‌غڵه‌تییه‌كیان هه‌بێ، به‌ڵكو سه‌رباری ئه‌وه‌ش: (وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ) وه به‌ته‌واوه‌تییش ته‌سلیم بن و گه‌ردن كه‌چ بن.

كه‌واته: وه‌ك له‌م ئایه‌تانه‌دا دیاره -كه ئه‌وانه مشتێكن له خه‌روارێك-، خوای به‌رز و بێ وێنه، له قورئاندا زۆر باسی ئه‌وه‌ی كردوه، كه ده‌بێ مسوڵمانان شوێن شه‌ریعه‌تی خوا بكه‌ون و، شوێن كتێبی خوا بكه‌ون و، بۆی گه‌ردن كه‌چ بن و، پێیه‌وه پابه‌ند بن، وه زۆر زۆر به ڕوونیی، ئه‌وه‌ی به‌یان كردوه، كه هه‌ر كه‌سێكیش شوێن قورئان نه‌كه‌وێ، له هه‌موو لایه‌نه‌كاندا: چ له ڕووی ئیمان و عه‌قیده‌وه، چ له ڕووی عیباده‌ته‌وه، چ له ڕووی خوو و ڕه‌وشت و ئاكاره‌وه، چ له ڕووی ئه‌و ڕاستییانه‌وه، كه قورئان گرتوونیه نێو خۆی، چ له ڕووی هه‌ڵس و كه‌وته‌كانه‌وه، له هه‌موو لایه‌نه‌كان دا، وه له هه‌موو بواره‌كانی ژیاندا، كه‌سێك دوای قورئان نه‌كه‌وێ و، بۆی گه‌ردن كه‌چ نه‌بێ، ئه‌وه به مسوڵمان له قه‌ڵه‌م نادرێ، وه‌ك له سووره‌تی (النور)دا خوای تاك و پاك ده‌فه‌رموێ:



﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۚ...﴾ النور: ٥١.

واتە: قسەی بڕواداران تەنیا یەك قسەیە، لەكاتێكدا بانگ دەكرێن بۆ لای خوا و پێغەمبەرەكەی، بۆ ئەوەی حوكمیان لە بەیندا بكەن، ئەویش ئەوەیە بڵێن: (سَمِعْنَا وَأَطَعْنَا) بیستمان و فەرمانبەرین، واتە: تێی گەیشتین و فەرمانبەرینی و جێبەجێشی دەكەین.

## چوار مەرجی سەرەكیی، بۆ هاتنەدی شوێنكەوتن و گەردنكەچبوون

وە لە كۆتایی ئەم بابەتەماندا دەتوانین بڵێین: پێنجەمین هەنگاوی هەڵس و كەوت كردنی ڕاست و دروستی مرۆڤی مسوڵمان، یان كۆمەڵگای مسوڵمان لەگەڵ قورئاندا، ئەوەیە كە ئەم چوار شتەی تێدا بێنە دی:

**یەكەم:**

قەناعەتی عەقڵیی تەواو و بێ لەرەلەر و دڵ لەدڵ دان، بەوە، كە هەرچی لە كتێبی خوادا هاتوە، پەیوەندیی بەهەر لایەنێكەوە هەبێ لە: بوونناسیی و، ئیمان و عەقیدە و، عیبادەت و ڕەوشت و ڕەفتار و، سەرجەم هەڵس و كەوتە خێزانیی و كۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسییەكان و ...هتددا، لە سەداسەد ڕاست و دروست و بێ گرێ و گۆڵە.

**دووەم:**

بەدڵ پەسند و قبووڵكردنی هەرچی كتێبی خوا فەرموویەتی و، خۆشویستنی و دڵ پێخۆشبوونی.

**سێیەم:**

بە زمان دانپێداهێنان (إقرار)ی هەرچی قورئان فەرموویەتی و، دەربڕینی ڕاشکاوانەی ئامادەیی (استعداد) بۆ جێبەجێ کردنی.

**چوارەم:**

بە کردەوە و ئەندامەکان جێبەجێ کردن و پڕاکتیزەکردنی هەموو ئەو شتانەی، کە قورئان فەرمانی پێکردوون، لە هەموو بوارەکانی تاکیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و سیاسیی دا.

شایانی باسیشە، کە مرۆڤ هەتا عەقڵی گەورەتر و، زانیاریی و شارەزایی و زیاتر بێ، چاکتر لە قورئان تێدەگات، وە بە پێچەوانەشەوە: کەمتر ڕاز و نهێنیی و ڕاستییەکانی قورئانی بۆ ئیستیعاب دەکرێن و هەزم دەکرێن، بەڵام ئەوەی زۆری بۆ ئیستیعاب دەکرێ و، ئەوەش کەمی بۆ ئیستیعاب دەکرێ، ئەوەی زۆری تێدەگا و ئەوەی کەم، هەردووکیان دەبێ بڵێن: هەرچی لە قورئاندا هەیە، مادام فەرمایشتی خوایە، هەمووی ڕاستە، با منیش تێی نەگەم! ئا ئەوە هەڵوێستی مسوڵمانە، با حیکمەتەکەشی نەزانێ، دەبێ قەناعەتی تەواوی بە تەواویی هەمووی هەبێ، واتە: مسوڵمان بۆی نیە، کە هەر بیر لەوە بکاتەوە: تۆ بڵێی ئەو ئایەتە وابێ؟ تۆ بڵێی بەکەڵکی ئێستا بێ؟ نابێ ئەوە بەدڵی هیچ ئینسانێك دا بێ، کە خۆی بە مسوڵمان بزانێ، ئەو پەڕەکەی دەتوانێ بڵێ: من تێی ناگەم.

بەڵێ، مسوڵمان لە حیکمەتی حوکمە شەرعییەکان تێبگات، یان نا، هەر بۆیان ملکەچە، دوای ئەوەی، کە بۆی دەرکەوت، کە خوا فەرمووونی، هەروەها سەرجەم ڕاستییەکانی ئیسلام بە عەقڵ و دڵ قبووڵ دەکات و، بەزمان دانیان پێدادێنێ و، بەکردەوەش لەخۆی دا بەرجەستەیان دەکات، جا ئەوەی، کە بەتاك دەکرێ، بەتاکیی پێوەی پابەند دەبێ، وە ئەوەش، کە بە کۆمەڵ و بەهەرەوەزیی دەکرێ، بەو شێوەیە هەوڵی جێبەجێ کردن و پڕاکتیزەکردنی دەدات، وەك زۆر بابەتی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسیی و...هتد.

کەواتە: پێویستە مرۆڤی مسوڵمان وێڕای پابەندیی شەخسیی و تایبەتی خۆی بە قورئانەوە، هەوڵیش بدات خەڵکی وەك خۆی پەیدا بکات، وە ئەو ڕاستییانەی قورئان بڵاو بکاتەوە، تاکو ڕایەکی گشتیی وا دروست بێ، کە ئەو کۆمەڵگایە و ئەو دەوروبەرە، ئەوەی کە قورئان فەرموویەتی، هەموویان جێبەجێی بکەن.

**لە کۆتایی دا دەڵێین:**

خوای پەروەردگار لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە بە تەواویی شوێن قورئان دەکەون، ئەوەی کە بە شەخسیی بۆمان دەکرێ، خۆمان ئەنجامی بدەین و، ئەوەی بە کاری کۆمەڵ و هەرەوەزییش دەکرێ، کۆمەڵگا و دەوروبەرمان وا لێ بکەین، کە لە هەموو ڕوویەکی ژیانەوە، پابەندی قورئان بین، وە خوای بەخشەر تەوفیقمان بدات، ملکەچ بین بۆ هەرچی خوا فەرموویەتی لە کتێبی موبارەکی خۆیدا، وە پێغەمبەری پێشەوا علیه الصلاة والسلام لە سوننەتی بەپێز و بەرەکەتی دا.

سبحانك اللهم و بحمدك، أشهد أن لا إله إلا أنت،
أستغفرك و أتوب إليك.




هەنگاوی شەشەم:

## تەزکیە پێکردن و فێرکردن
## (التزكية و التعليم)

خوشک و برایانی بەڕێز و خۆشەویست!

ئەم وانەیەمان، وانەی شەشەمە لە زنجیرە وانەی: (چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟!).

لە پێنج وانەی ڕابردوودا، باسی پێنج هەنگاومان کرد، بۆ چۆنیەتی هەڵس و کەوت کردن لەگەڵ قورئانی بەرز و بەپێزدا، ئەو پێنج هەنگاوەی ڕابردوو، هەموویان لە چوارچێوەی ئەو کەسەدان، کە قورئان دەخوێنێ، یان قورئانی بۆ دەخوێنرێ، بەزۆریی لەم چوارچێوەیەدا کورت هەڵاتبوون، بەڵام ئەم دوو هەنگاوەی دوایی: واتە: ئەوەی لەم وانەی شەشەم و وانەی داهاتووشدا، باسی دەکەین، پەیوەندیی بە چوارچێوەی دەرەوەی بابای قورئان خوێن و، بابای هەڵگری قورئانەوە هەیە.

وانەی ئەمڕۆمان ناوونیشانەکەی بریتیە لە: تەزکیە پێکردن و فێرکردن (التزكية والتعليم):

دیارە هەرکەسێك بەو شێوەیەی، کە لەوانەکانی ڕابردوودا باسمان کرد، لەگەڵ قورئاندا هەڵسوکەوت بکات و، ئەو پێنج هەنگاوەی، کە باسمان کردن، هەرکەسێك ئەو پێنج هەنگاوانە بنێ، واتە: ئەدەب نواندن و بە گەورە گرتنی

پێویستی لە بەرانبەر قورئاندا هەبێ، پاشان قورئان بخوێنێ یان گوێی لێ بگرێ، بەو شێوەیەی، کە شەرع فەرمانی پێ کردوە، ئنجا لە قورئان ورد بێتەوە و بیری لێ بکاتەوە و تێوەی ڕامینێ، ئنجا قورئان کاری تێبکا و، پاشانیش تەفاعول لەگەڵ قورئاندا بکات و لێی بەهرەمەند بێت و پەندی لێ وەربگرێ، وە سەرەنجام شوێنی بکەوێ لە هەموو ئەو بوارانەدا، کە کتێبی خوا ڕێنموونی ئاڕاستەی مرۆڤایەتیی کردوە و بۆی گەردن کەچ بێ، هەرکەسێك ئەو پێنج هەنگاوە بنێ و بەو پێنج قۆناغە، بەو جۆرە لەگەڵ قورئاندا مامەڵە بکات، ئەوە لەڕاستی دا مانای وایە خۆشەویستی قورئان و گەورەیی قورئان و ڕۆشنایی قورئان، لە عەقڵ و دڵی دا جێگیر بووە و، لەسەر هەڵس و کەوت و ئاکار و ڕەفتاریشی درەوشاوەتەوە.

ئنجا دیارە هەرکەسێکیش بە قورئان مونەووەر بوو بێ و، لێی بەهرەمەند بووبێ، بە تەئکید کاتێك، کە چاو دەکاتەوە و کۆمەڵگا و دەوروبەری بە شێوەیەك دەبینێ، کە پێچەوانەی قورئانە. عەقیدە وفیکریان، لەگەڵ قورئاندا ناکۆکە، هەڵس و کەوت و ڕەفتاریان لە بواری شەخسیی و خێزانیی و کۆمەڵایەتیی و دەوڵەتیی و لە بواری سیاسیی و ئابووریی دا، لەگەڵ قورئاندا ناگونجێ، وەك ئەو کۆمەڵگایانەی ئێستای خۆمان، بەڵێ هەر کەسێك بەو شێوەیەی، کە باسمان کرد لە وانەکانی ڕابردوودا، هەڵس و کەوتی لەگەڵ قورئاندا کردبێ و، ڕاستییەکانی قورئانی هەزم (إستیعاب) کردبێ و لێی بەهرەمەند بووبێ و، ڕۆشنایی قورئان، کە فەرمایشتی خوایە لە عەقڵ و دڵی دا جێگیر بووبێ، پاشان ڕەنگی دابێتەوە بۆ سەر ئاکار و ڕەفتاری، بە تەئکید لە واقیع و دەوروبەرێکەوە ڕانامێنێ و، لە بەرانبەری دا دەستەوئەژنۆ دانانیشێ، کە دوورە لە قورئان، بەتایبەتی واقیع و دەوروبەرێك، کە خۆی بە مسوڵمان و شوێنکەوتووی قورئان دەزانێ، کە ئەگەر سەیری واقیعی ئەمڕۆی مسوڵمانان بکەین، چ لە کوردستان، چ لە عێراق، چ لە زۆربەی جیهانی ئیسلامیی دا، بەڕاستی ئەوەی بەسەردا دەچەسپێ، کە خوای پەروەردگار لە ئایەتی ژمارە (٣٠) سوورەتی (الفرقان) دا، لەسەر زمانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام دەیفەرموێ:

﴿ وَقَالَ ٱلرَّسُولُ يَٰرَبِّ إِنَّ قَوۡمِي ٱتَّخَذُواْ هَٰذَا ٱلۡقُرۡءَانَ مَهۡجُورٗا ﴿٣٠﴾ ﴾ .



واتە: پێغەمبەر فەرمووی: ئەی پەروەردگارم! خەڵکەکەم، کۆمەڵگاکەم، ئەم قورئانەیان واز لێهێناوە، واتە: دەست بەرداری قورئان بوون و لێی دوور کەوتوونەوە، بەڵی ئەم ئایەتە دەربارەی ئەو کۆمەڵگا نەفامییەیە، کە پێغەمبەر صلى الله عليه وسلم لە سەرەتادا لەگەڵی ڕووبەڕوو بۆوە، بۆ ئەوەی بەرەو خوای بێنێ و، دینی خوای تێبگەیەنێ، بەڵام لە ڕاستی دا وەك گوتمان زۆربەی مسوڵمانان لە زۆر ڕووەوە، (هەڵبەت ئێمە ناڵێین: خەڵك یەکجاریی لە دین چۆتە دەرێ،) بەڵام لە زۆر ڕووەوە، نەفامییان تێدا پەیدا بووەتەوە و، لە قورئان دوور کەوتوونەتەوە، ئنجا لە ئەنجامی لە قورئان دوورکەوتنەوەشەوە، بیر و بۆچوونی جاهیلیی و داب و نەریتی جاهیلیی و، ئەخلاق و ڕەوشتی جاهیلیی و، هەڵس و کەوتی جاهیلییان، لە نێودا پەیدا بووە و پەرەی ستاندوە.

شایانی باسیشە، کە وشەی نەفامێتیی (جاهلية) چەمك و واتایەکی فراوانی هەیە و، هەرجۆرە بیر و بۆچوون و هەڵس و کەوت و ڕەفتار و هەڵوێستێك دەگرێتەوە، کە پێچەوانەی شەریعەت بێ، چونکە بێگومان هەرجۆرە لادانێك لە شەریعەت، بەهۆی نەفامیی و نەزانییەوەیە، هەربۆیەش خوای کاربەجێ عز وجل:

١- گومانی ناشایستە بەخوا بردنی، مونافیق و دڵنەخۆشەکانی، ناوناوە گومانی نەفامێتیی:

﴿ ... يَظُنُّونَ بِٱللَّهِ غَيْرَ ٱلْحَقِّ ظَنَّ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ... ﴾ آل عمران: ١٥٤.

٢- هەروەها حوکم کردنی بە جگەلە قورئان، بە حوکمڕانیی نەفامیی ناوزەد کردوە:

﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ؟! ﴾ المائدة: ٥٠.

٣- وە خۆڕازاندنەوە و عەورەت و جوانیی خۆ دەرخستنی ئافرەتانیشی، دیسان بە عادەت و نەریتێکی نەفامێتی داناوە:

﴿ ... وَلَا تَبَرَّجْنَ تَبَرُّجَ ٱلْجَـٰهِلِيَّةِ ٱلْأُولَىٰ ﴾ الأحزاب: ٣٣.



کەواتە: چ لە ڕووی عادەت و نەریتەوە، چ لە ڕووی (حوکم)ەوە، چ لە ڕووی بیر و بۆچوونەوە، هەرکات ئینسان لە قورئان دوورکەوتەوە و، دوای جگەلە ئیسلام کەوت، مانای وایە بەشێك لە جاهیلییەتی تێدا هاتۆتە دی.

هەڵبەتە کۆمەڵگایەکانی ئێستای ئێمەش، چ لە کوردستان و عێراق، چ لە زۆربەی وڵاتانی جیهانی ئیسلامیی دا، کەم و زۆر نەفامێتییان هاتۆتە نێو، چ لە ڕووی بیر و بۆچوون و عەقیدەیانەوە، چ لەڕووی خواپەرستییانەوە، کە بیدعەت و داهێنانی زۆر هاتۆتە نێو عیبادەتیانەوە، چ لەڕووی هەڵس و کەوت و ئاکار و ڕەوشتیانەوە، کە گیرۆدە بوون بە کۆمەڵێك ڕەفتار و هەڵس و کەوتی بێگانەوە، وە چ لە ڕووی حوکم و سیاسەتیانەوە، کە خوای پەروەردگار لە کتێبی خۆی دا، دوو جۆرە حوکمی دیاری کردوون، یان حوکمی خوا، یان حوکمی نەفامیی:

﴿ أَفَحُكۡمَ ٱلۡجَٰهِلِيَّةِ يَبۡغُونَۚ وَمَنۡ أَحۡسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكۡمٗا لِّقَوۡمٖ يُوقِنُونَ ﴾ المائدة: ٥٠.

واتە: ئایا حوکمی نەفامیی داوا دەکەن! ئایا بەرنامەی کێ لە هی خوا چاکترە، بۆ کەسانێك، کە یەقینیان هەبێ.

ئاشکراشە، کە مەبەست لە نەفامییانە (جاهليّة) بوونی بیروبۆچوونێك، یان عادەتێك، یان هەڵوێست و ڕەفتارێك، مانای ئەوە نیە، کە خاوەنەکەی لە بازنەی ئیمان و ئیسلام چۆتە دەرێ و، فڕی بەسەر ئیسلامەوە نەماوە! بەڵکو بابای بڕوادار و مسوڵمان هەر لەسەر مسوڵمانەتیی خۆی دەمێنێتەوە، هەرچەندە هەڵە و گوناهیشی هەبن، هەتا یەکێك لە هەڵوەشێنەرەوەکان (نواقض)ی ئیمان و ئیسلامی تێدا پەیدا دەبن، وەك بەدرێژیی لە بەرگی یەکەمی (ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی)دا باسمان کردوە، بەڵگەشمان لەوبارەوە زۆرن، یەکیان ئەوەیە، کە پێغەمبەری خوا صلى الله عليه وسلم لەسەر قسە و هەڵوێستێکی هەڵە و ناشەرعییانە[1]، بە (أبو ذر الغفاري) فەرموو:

---

(١) ئەویش ئەوە بوو کە بە پیاوێکی گوت: (يا ابن سَّوداء!) ئەی کوڕی ئافرەتێکی ڕەش پێست.



(يا أبا ذر! أعيَّرتَه بِأُمّهِ ! إنك امرؤ فيك جاهلية) رواه البخاري برقم:٣٠.

واته: ئه‌ی ئه‌بوو ذه‌ر! ئایا به‌هۆی دایكییه‌وه عه‌یبت لێگرت! بێگومان تۆ كه‌سێكی نه‌فامییت تێدایه‌!

به‌ڵێ، ئه‌وه بیروبۆچوونێكی نه‌فامییه‌، كه تۆ ڕه‌خنه له خه‌ڵك بگری، له‌به‌رئه‌وه‌ی ڕه‌شپێسته‌، چونكه نه تۆ ئازایه‌تیی خۆته‌، كه سپی پێستی، نه ئه‌ویش تاوانی خۆیه‌تی، كه ڕه‌شپێسته‌، وه دواییش سپیه‌تیی و ڕه‌شیه‌تیی سه‌نگی مه‌حه‌ك نین، به‌ڵكو ئه‌وه سه‌نگی مه‌حه‌كه‌، كه ئینسان بۆخۆی وه‌ده‌ستی دێنێ، نه‌ك ئه‌وه‌، كه خوای په‌روه‌ردگار به‌و شێوه‌یه خوڵقاندوویه‌تی، ئه‌وه نه ئازایه‌تییه‌، نه تاوان.

به‌ڵێ، هه‌ر كه‌سێك وه‌ك باسمان كرد، به‌ڕاستی قورئانی هه‌زم كردبێ و لێی تێگه‌یشتبێ، واته: به عه‌قڵ و به دڵ قورئانی وه‌رگرتبێ، به عه‌قڵ له قورئان حاڵی بووبێ و تێی گه‌یببێ و، به دڵیش خۆشیویستبێ و ڕاستییه‌كانی و حوكمه‌كانی و ئاڕاسته‌كانی قبووڵ كردبێ و، به‌ته‌واویی بۆی گه‌ردن كه‌چ بوو بێ، هه‌ركه‌سێك به‌و شێوه‌یه بێت، كاتێك، كه چاو ده‌كاته‌وه و چاو به ده‌وروبه‌ری خۆیدا ده‌گێڕێ و، سه‌یر ده‌كات: ناشه‌رعیی هه‌یه‌، خراپه هه‌یه‌، جاهیلییه‌ت هه‌یه‌، لادان هه‌یه‌، به ته‌ئكید ئه‌و ڕۆشناییه‌ی ئیمان و مسوڵمانه‌تییه‌ی، كه به‌هۆی قورئانه‌وه‌، له دڵ و عه‌قڵی دا جێگیر بووه‌، پاڵی پێوه ده‌نێ، كه بكه‌وێته خۆ، بكه‌وێته بیری ئه‌وه‌ی ئه‌و واقیعه چۆن بگۆڕێ؟ چۆن چاكی بكات؟ ئه‌و خه‌ڵكه چۆن چاكسازیی و پاكسازیی بكات؟ هه‌ر بۆیه خوای په‌روه‌ردگار له چوار ئایه‌ت له قورئاندا، له ئایه‌تی ژماره (١٢٩) و ئایه‌تی ژماره (١٥١)ی سووره‌تی (البقرة) و ئایه‌تی ژماره (١٦٤)ی سووره‌تی (آل عمران) و ئایه‌تی ژماره (٢)ی سووره‌تی (الجمعة)، له هه‌ركام له‌م چوار ئایه‌تانه‌دا، خوای به‌به‌زه‌یی (جل شأنه) ئه‌رك (وظیفة)ی پێغه‌مبه‌ر عليه الصلاة والسلام، له چوار شتدا كورت ده‌كاته‌وه‌، ئه‌و چوار شته‌ش بریتین له:

**یه‌كه‌م:** خوێندنه‌وه‌ی ئایه‌ته‌كانی خوا.

**دووه‌م:** ته‌زكیه كردنی خه‌ڵك.

**سێیه‌م:** كتێب فێركردنیان.

**چواره‌م:** حیكمه‌ت فێركردنیان.



بۆ نموونە لە ئایەتی (١٦٤) سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرمویٚ:

﴿لَقَدْ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذْ بَعَثَ فِيهِمْ رَسُولًا مِّنْ أَنفُسِهِمْ يَتْلُوا۟ عَلَيْهِمْ ءَايَٰتِهِۦ وَيُزَكِّيهِمْ وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ وَٱلْحِكْمَةَ وَإِن كَانُوا۟ مِن قَبْلُ لَفِى ضَلَٰلٍ مُّبِينٍ ﴿١٦٤﴾﴾

واتە: بێگومان خوا چاکەیەکی گەورەی لەگەڵ ئیمانداران دا کردوە (منەتباریی خۆی کردوون)، کە پێغەمبەرێکی لە خۆیان لەنێودا ڕەوانە کردوون، ئایەتەکانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە و، تەزکیەیان دەکا و، کتێبیان فێر دەکات و، حیکمەتیان فێر دەکات، هەرچەند بە تەئکید لەوەو پێش لە گومڕاییەکی ئاشکرا و ڕوون دا بوون.

لێرەدا خوا -جل شأنە- ئەرك (وظیفة)ی پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام لەم چوارشتانەدا کورت هەڵدێنیٚ، وە لە چوار شوێن لە قورئاندا، وەك گوتمان، ئەوە دووبارە بۆتەوە، دیارە لە هەر شوێنە بە شێوەیەك، بەڵام لە هەر چواریاندا ١- خوێندنەوەی ئایەت و ٢- تەزکیە و ٣- فێرکردنی کتێب و ٤- فێرکردنی حیکمەت هاتوون.

ئنجا جاری وایە شێوەی تەعبیرەکە (غیابي)یە، جاری واشە (خطابي)یە، وە جاری وایە وشەی تەزکیە پێش کەوتوە و، جاری واشە فێرکردنی کتێب و حیکمەت، بەڵام گرنگ ئەوەیە لە هەر چواریاندا ئەم چوار شتە هاتوون.

ئنجا لێرەدا پێویستە هەڵوێستەیەك بکەین: مادام خوای کاربەجیٚ ڕایگەیاندبیٚ، کە دەبیٚ ئەرك و کاری پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام، چ بەرانبەر بە کۆمەڵگای مسوڵمان و، چ بەرانبەر بە خەڵك بە گشتی، ئەو چوار شتە بن، چونکە ئەگەر تەماشای هەر چوار شوێنەکان بکەین، هەر چوار ئایەتەکان، کە ئەو چوار ئەرکەیان تێدا هاتوون، ئەوەیان لیٚ وەردەگیریٚ، کە پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام ئەرکی سەرشانی بەرانبەر ئەهلی ئیمانیش و، بەرانبەر بە خەڵکیش، بە شێوەیەکی گشتی ئەو چوار شتەن، بۆ نموونە، لە سوورەتی (آل عمران)دا دەفەرمویٚ:



﴿لَقَدۡ مَنَّ ٱللَّهُ عَلَى ٱلۡمُؤۡمِنِينَ إِذۡ بَعَثَ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡ أَنفُسِهِمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ ..﴾ آل عمران: ١٦٤.

کەواتە: ئەم چوار ئەرکەی پێغەمبەر عليه الصلاة والسلام دەبێ لەنێو ئۆممەتدا بیانکات، ئەو ئۆممەتەی کە بڕوادارن و ئیمانیان پێی هەیە.

بەڵام لە سوورەتی (البقرة)دا، کە (إبراهيم) عليه الصلاة والسلام دەپاڕێتەوە و دەفەرموێ:

﴿رَبَّنَا وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ ..﴾ البقرة: ١٢٩.

(وَٱبۡعَثۡ فِيهِمۡ) یانی: گەلی عەرەب، یان ئەو خەڵکەی، کە (إبراهيم) لە نێوانیاندا پێغەمبەری خوا بووە، عەرەب و جگەلە عەرەب.

وە لە سوورەتی (الجمعة)ش دا دەفەرموێ:

﴿هُوَ ٱلَّذِي بَعَثَ فِي ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ رَسُولٗا مِّنۡهُمۡ يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ ...﴾ الجمعة: ٢.

(ٱلۡأُمِّيِّـۧنَ) واتە: ئەوانەی، کە نەشارەزا بوون و لە دیندا شارەزاییان نەبووە، کە دیارە عەرەب و جگەلە عەرەبیش دەگرێتەوە، چونکە (أمي) کەسێکە، کە نەشارەزایە لە (دین) و بەرانبەری خاوەن کتێبە.

کەواتە: پێغەمبەر عليه الصلاة والسلام، کە یەکەم هەڵگری قورئان بووە، وە یەکەم وەرگر و ڕاگەیەنەری قورئان بووە، خوای زانا و توانا (جل شأنه) ئەم چوار ئەرکەی لەسەر شان داناون:



## چوار ئەركە سەرەكییەكەی پێغەمبەری خوا صلى الله علیه و سلم

یەكەمیان: (يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ) ئایەتەكانی خوایان بەسەردا دەخوێنێتەوە:

بەڵێ، یەكەمین كارێك، كە ئینسانی مسوڵمانی تێگەیشتوو لە قورئان، چ پێغەمبەری خاتەم بێ علیه الصلاة والسلام، چ شوێن كەوتووانی بن، هەتا رۆژی دوایی، هەموو ئەوانەی خۆیان بە هەڵگری قورئان دەزانن، هەموو ئەوانەی، كە خوا بەهرەمەندی كردوون بە شارەزایی لە كتێبی خۆی، دەبێ یەكەمین كاریان بریتی بێ لە چی؟ (يَتْلُواْ عَلَيْهِمْ ءَايَـٰتِهِۦ) ئایەتەكانی خوا بەسەر خەڵكدا بخوێننەوە، واتە: ئێمە یەكەمین شتێك، كە دەیكەین لەگەڵ دەوروبەرماندا، ئەوەیە. كە لە قورئان شارەزایان بكەین، ئایەتەكانی خوای پەروەردگاریان بەگوێدا بدەین، وە بۆیان بخوێنینەوە و تێیان بگەیەنین، كە خوا چی لێ داوا كردوون، ئەو فەرمایشتەی خوا ناردوویەتی، چی تێدایە؟ دەبێ بۆ خەڵك رۆشن بكرێتەوە.

وە لێرەدا مەبەست لە (خوێندنەوەی ئایەتەكانی خوا) تەنیا ئەوە نیە، كە قورئان بخوێنرێتەوە، بەڵكو مەبەست ئەوەیە، كە ئەو كەسانەی قورئانیان بەسەردا دەخوێنیەوە، بەرچاویان رۆشن بكەیەوە و، بە نێوەرۆكی قورئانیان ئاشنا بكەی، ئەگەرنا خۆ تۆ لەكاتێكدا دەقێك بەسەر كەسێكدا دەخوێنیتەوە، كە لێی شارەزا نیە و تێی ناگا، خوێندنەوە و نەخوێندنەوەی هەروەك یەكن!

كەواتە: مەبەست لە خوێندنەوەی ئایەتان بەسەر كەسێكدا، ئەوەیە، كە بۆی بخوێنیەوە و تێی بگەیەنی و لێی حاڵی بكەی، كە ئەو فەرمایشتە چییە؟! بەڵێ بناغەی كاری ئیسلامیی، بریتیە لە ئاشناكردنی خەڵك بە قورئان و تێگەیاندنیان لە راستییەكانی، پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام وای كردوە و، ئێستاش و لەمەو دواش هەردەبێ وابكرێ و، لە رابردووشدا لە دوای پێغەمبەر



علیه الصلاة والسلام، هه‌رکه‌سێك ویستبێتی له ڕۆژگاری خۆیدا و له کۆمه‌ڵگا و ده‌وروبه‌ری خۆیدا (دین)[1] زیندوو بکاته‌وه و بیبووژێنێته‌وه و، خه‌ڵك به‌ره‌و دینی خوا بێنێته‌وه، هه‌ر له قورئانه‌وه ده‌ستی پێ کردوه، چونکه ئه‌سڵی دین و بناغه‌ی دین، بریتیه له قورئان، وه دیاره سوننه‌تی پێغه‌مبه‌ریش علیه الصلاة والسلام ته‌نیا بریتیه له ڕوونکردنه‌وه‌ی قورئان و، ڕوونکردنه‌وه‌ی شێوه‌ی جێبه‌جێ کردنی قورئان و، شێوه‌ی پیاده کردن و جێبه‌جێ کردنی، ئه‌وه ئه‌رکی یه‌که‌مه (يَتۡلُواْ عَلَيۡهِمۡ ءَايَٰتِهِۦ).

## دووه‌میان: ( وَيُزَكِّيهِمۡ ) ته‌زکیه‌یان ده‌کات:

ئه‌رکی دووه‌می پێغه‌مبه‌ر علیه الصلاة والسلام بریتی بوو له ته‌زکیه کردنی خه‌ڵك، ته‌زکیه یانی چی؟

وشه‌ی (تزكية) له (زكاة)ه‌وه هاتوه، (زكا، يزكو) یانی: (نما، ينمو) واته: (گه‌شه‌ی کرد، گه‌شه ده‌کات). به‌ڵێ وشه‌ی (زكاة) له بنچینه‌دا به مانای گه‌شه‌کردن دێ، هه‌روه‌ها به‌مانای پاکیی (طهارة)یش دێ[2]، وه به‌مانای چاکبوون (صلاح)یش دێ[3]، که‌واته: (ته‌زکیه) واته: گه‌شه‌کردن و پاکسازیی و چاکسازیی، (النموُّ و الطَّهارة ، الصَّلاح) واته: ئه‌و ئینسانه گه‌شه‌پێبده‌ی و پاك بکه‌یه‌وه له مونکه‌رات و له ناشه‌رعیی و هه‌ڵه و په‌ڵه، چ له ڕووی عه‌قیده و بیروبۆچوون، چ له ڕووی ئه‌خلاق و، چ له ڕووی عیباده‌ت و، چ له ڕووی هه‌ڵس و که‌وته‌وه، پاکی بکه‌یه‌وه و، بژاری بکه‌ی و، له بێژینگی بده‌ی و، بیپاڵێوی، ئنجا چاکسازیی تێدا بکه‌ی واته: خێر و چاکه‌ی فێربکه‌ی، چونکه

---

(١) دیاره لێره‌دا مه‌به‌ستمان له وشه‌ی (دین) مانا و چه‌مکه باوه‌که‌یه‌تی له کۆمه‌ڵگای خۆمان دا، که بریتیه له ئیسلام، تاکه ئایین و به‌رنامه‌ی ڕاست و دروست و هه‌ق و ده‌ستتێوه‌رنه‌دراوی خوا.

(٢) مختار الصحاح، ص٢٤٨.

(٣) المعجم الوسيط، ص٣٩٦، (زكا الشيءُ يزكو زُكُوّاً و زكاءً و زكاةً: نَمَا وزاد، وزكا فلانٌ: صَلَحَ.. و زكّا الشيءَ أَزكاهُ، وزكّاهُ: أَصْلَحُه، وزكّاهُ: طَهَّرَهُ، وزكّا نَفْسَه: مَدَحَها).



دەبێ هەمیشە بژارکردن (تخلية) لە پێش ڕازاندنەوە (تحلية)ەوە بێ و، دەبێ پاکسازیی لە پێش چاکسازیی بێ، کەسێك کێڵگەیەکی هەیە دەیەوێ نەمامی تێدا بچێنێ، یان تۆوی تێدا بوەشێنێ، دیارە دەبێ پێشتر کێڵابێ و ئامادەی کردبێ، تاکو ئەوەی کە دەیەوێ، تێیدا ئەنجام بدات، ئنجا تۆو تێدا وەشاندنە، نەمام تێدا ناشتنە،هەرچی هەیە، هەتا بژاری نەکا و، هەڵی نەوێژێرێ و، خاوێنی نەکاتەوە و، نەیکێڵێ و ئامادەی نەکات، ناگونجێ کارەکەی تێدا ئەنجام بدات.

کەواتە: هەمیشە دەبێ پاکسازیی لە پێش چاکسازییەوە بێت، وەك ئەهلی تەزکیە دەڵێن: (التخلية ثم التحلية). ئنجا خوای پەروەردگاریش هەر وای فەرمووە، وەك دەفەرموێ:

﴿ فَمَن يَكْفُرْ بِالطَّاغُوتِ وَيُؤْمِن بِاللَّهِ فَقَدِ اسْتَمْسَكَ بِالْعُرْوَةِ الْوُثْقَىٰ ﴾ البقرة: ٢٥٦.

واتە: کەسێك کوفر بە طاغووت بکات و ئیمان بە خوا بێنێت، ئەوە دەستی بەقوڵفەیەکی قایمەوە گرتوە.

لە پێشدا دەبێ مرۆڤ کوفر بە طاغووت بکات و دەست بەرداری بێ، ئەوجار ئیمان لە دڵی دا جێگیر دەبێ، هەروەها وشەی (لا اله الا الله) پێشێ دەبێ (نفي) پەرستراوێتیی (ألوهية) لە جگەلە خوا بکرێ، ئنجا تەنیا پەرستراوێتیی و تاکە مەعبوودێتیی خوا بچەسپێ!

بەڵێ، دەبێ لە پێشدا بەشمشێری (لا)، ملی هەرچی بت و طاغووت (آلهة) هەیە، هەڵبڕێ، ئەوجار ئیمان بە خوا و خوا بەیەکگرتن و یەکتاپەرستیی، لە دڵ و دەروونیدا جێگیر دەبێ!

کەواتە: تەزکیە چ بۆ پێغەمبەر عليه الصلاة والسلام، کە یەکەمین (مُزَكِّي) خەڵك و دەوروبەری خۆی بووە، چ بۆ ئێمە لە بەرانبەر کۆمەڵگای خۆمان دا، ئەوەیە، کە بژاریان بکەین لە هەرچی هەڵە و پەڵە و کەم و کووڕیی هەیە، کە لەگەڵ ئیسلام دا ناگونجێ، چ پەیوەندیی بە ئیمان و عەقیدە و تێڕوانین و بیروبۆچوونەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی عیبادەتیانەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی ئاکار و ڕەوشتیانەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی کۆمەڵایەتیی و سیاسییەوە



هەبێ، دەبێ بێنی سەرەتا ئەو خەڵکە بژار بکەی، لە دواییدا بیرازێنیەوە و جوانی بکەی و، چاکسازیی تێدا بکەی، بەوەی خوای پەروەردگار پێی خۆشە، چ لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، چ لە ڕووی عیبادەت و، چ لە ڕووی ڕەوشت و، چ لە ڕووی مامەڵە و هەڵس وکەوت و، چ لە ڕووی کۆمەڵایەتیی و ئابووریی و سیاسییەوە.

ئەوە ئەرکی دووەمی سەرشانی پێغەمبەر و هەر کەسێکە، کە دوای پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، دەکەوێ یان خۆی بە هەڵگری قورئان دەزانێ.

سێیەمیان: ( وَيُعَلِّمُهُمُ ٱلْكِتَٰبَ ) وە کتێبیان فێردەکات.

چوارەمیان: ( وَٱلْحِكْمَةَ ) وە حیکمەتیان فێردەکات.

هەندێك لە زانایان وایان زانیوە، کە کتێب لێرەدا بە مانای قورئانە، بەڵام بە تەئکید ئەوە وا نیە، چونکە پێشتر باسی قورئان ڕابرد، لە ڕستەی: (يتلو عليهم آياته) دا، چونکە ئایەتەکان بریتین لە قورئان (ئایەتەکانی قورئان)، بۆیە دەبێ لێرەدا مەبەست لە (کتاب)، شتێکی دیکە بێ، وە هەندێك گوتوویانە: مەبەست لە (حکمة) سوننەتی پێغەمبەرە علیه الصلاة والسلام، بەڵام ئەوەش وانیە، چونکە خوای کاربەجێ - جل شأنە - بەیانی کردوە، کە حیکمەت دەدات بە هەندێك کەس جگە لە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام، وەك دەفەرموێ:

﴿يُؤْتِي ٱلْحِكْمَةَ مَن يَشَآءُ ۚ وَمَن يُؤْتَ ٱلْحِكْمَةَ فَقَدْ أُوتِيَ خَيْرًا كَثِيرًا ...﴾ البقرة: ٢٦٩.

واتە: حیکمەت بەهەر کەسێك دەدات، کە بیەوێ، وە هەرکەسێك حیکمەتی پێ بدرێ، خێر و نیعمەتێکی زۆری پێدراوە.

وە لە بارەی (لوقمان)ەوە، کە پێغەمبەریش نیە فەرموویەتی:

﴿وَلَقَدْ ءَاتَيْنَا لُقْمَٰنَ ٱلْحِكْمَةَ ..﴾ لقمان: ١٢.

واتە: وە بێگومان حیکمەتمان بە (لوقمان) بەخشیبوو.

کەواتە: لێرەدا: نەحیکمەت بە مانای سوننەتی پێغەمبەرە علیه الصلاة والسلام، وە نەکیتاب بە مانای قورئانە، ئەدی بەمانای چیین؟! لە وەڵامدا دەڵێین: (کتاب) بە مانای شەریعەتە، واتە: ئەو یاسا و دەستوور و حوکمانەی، کە لە قورئاندا هەن، ئێمە دەبێ ئەو حوکم و یاسا و دەستوورانە، فێری خەڵك بکەین.

(حکمة)یش ئەو ئەدەب و ڕەوشت و ئاکارە بەرز وجوان و، ئەو خەسڵەتە ڕەندو پەسەندانەن، کە لە قورئاندا هەن و، دەبێ فێری خەڵکیان بکەین، یانی: دوای ئەوەی، خەڵکت لە دین شارەزا کرد و، قورئانت تێگەیاندن، ئەوجار دەبێ بێنی تەزکیەیان بکەی، چ لەسەر ئاستی تاك تاکیان، چ لەسەر ئاستی کۆمەڵگایان، کە کۆمەڵگا بە جێ بەجێ کردنی شەریعەت و ئەدەب و ڕەوشتی پەسند، پاك و چاك دەبێ.

بەڵێ، خوشك و برایانی خۆشەویستم! کتێبی ناوازە و بەپێز و بەرز و بەڕێزی خوا عز وجل، بەهەر ئەندازەیەك، کە ئینسان لێی نزیك دەبێ و لێی تێدەگات و کارلێکی لەگەڵ دەکات، پاکسازیی دەکات و چاکسازییشی دەکات، بەمانای فراوان و گشتگیری پاکسازیی و چاکسازیی. هەر بۆیەش دایکمان (عائیشە) خوا لێی ڕازی بێت، کاتێك، کە پرسیاری لێ کرا دەربارەی ڕەوشت و و هەڵس و کەوتی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام گوتی:

(كانَ خُلُقُ النبيِّ الله القُرآن) رواه مسلم: ٧٤٦.

واتە: ڕەوشتی پێغەمبەری خوا (علیه الصلاة والسلام) هەڵس وکەوت و ڕەفتاری، قورئان بوو، واتە: قورئان چی دەفەرموێ، وای دەکرد.

بەڵێ دوای ئەوەی هەڵگری قورئان، دەوروبەرەکەی کارلێك پێ دەکات لەگەڵ قورئاندا و، پاکسازیی و چاکسازیی تێدا ئەنجام دەدات و، وایان لێدەکات، کە پاك و چاك بن، ئەمجار دێنێ و ئەو حوکم و یاسا و دەستوورانەی، کە قورئان گرتوونیە نێو خۆی، لە هەموو لایەنەکانی ژیاندا، چ پەیوەندییان بە لایەنی خێزانییەوە هەبێ، چ بەلایەنی کۆمەڵایەتییەوە، چ بە لایەنی ئابووریی و سیاسەت و دەوڵەتدارییەوە، دێنێ ئەو یاسا و دەستوورانەیان فێر دەکات، تاکو

بەپێی ئەو حوكم و دەستوورانەی قورئان بەڕێوە بچن، هەروەها (حیكمەت)یشیان فێر دەكات، حیكمەتیش ئەو ئەدەب و ڕەوشت و سیفەتە بەرز و جوانانەن، كە قورئان فەرمووني، بۆیەش گوتمان: مەبەست لە (كتاب) لێرەدا ئەوەیە، چونكە دیارە پێشتر باسی ئایەتان تێپەڕیوە، كەواتە: لێرەدا مەبەست لە (كتاب) لایەنی بەرنامەیی و یاسایی قورئان و سوننەتە، كە ژیان و گوزەرانی كۆمەڵگای پێ ڕێك دەخرێ، وە بۆیەش (حكمة)مان وامانا كرد، چونكە خوای بەرز لە سووڕەتی (الإسراء)دا، دوای ئەوەی (٢٤) دانە ئاكار: (١٢) ڕەوشتی بەرز و پەسەند و جوان، وە (١٢) پەست و نزم بەیان دەكات، لەو شوێنەوە. كە دەفەرموێ:

﴿ وَقَضَىٰ رَبُّكَ أَلَّا تَعْبُدُوٓاْ إِلَّآ إِيَّاهُ وَبِٱلْوَٰلِدَيْنِ إِحْسَـٰنًا ﴾ الإسراء: ٢٣ .

لەوێڕا پێدادێ، تاكو لە كۆتایی ئەو ئایەتانەدا دەفەرموێ:

﴿ ذَٰلِكَ مِمَّآ أَوْحَىٰٓ إِلَيْكَ رَبُّكَ مِنَ ٱلْحِكْمَةِ ﴾ الإسراء: ٣٩.

كەواتە: (حیكمەت) واتە: خۆ بژاركردنی تاك و كۆمەڵ لە خووخدەو ڕەفتارە خراپەكان و، خۆڕازاندنەوەیان، بەو ئەدەب و ڕەوشتە بەرز و جوانانەی، كە قورئان پەسندی كردوون.

كەواتە: ئەركی هەڵگری قورئان، ئەركی كەسێك، كە لە قورئان تێگەیشتوە، ئەوەیە كە ئایەتەكانی خوا بەسەر خەڵكدا بخوێنێتەوە و تێیان بگەیەنێ، ئەمجار دوایی هەوڵ بدات و كاریان لەسەربكات، كە هەر كامێكیان لەسەر ئاستی شەخسیی خۆی، خاوەنی كەسایەتییەكی پاك و چاك بێ، پاشان لەسەر ئاستی نێو خۆیان وەك كۆمەڵگا، هەوڵیان لەگەڵ بدات و وایان لێ بكات، كە یاساكانی قورئان لە نێو خۆیاندا جێبەجێ بكەن و، بە ئەخلاق و ئاكاری بەرز و جوان و ئەدەب و ڕەوشتی بەرز و پەسەندی، كە قورئان دەفەرموێ، پێكەوە مامەڵە بكەن و، لەگەڵ دەورو بەریاندا ڕەفتار بكەن، وە خۆیان لە هەرچی قسەو ڕەفتارو خووخدەی خراپە، دوور بگرن.

ئنجا ئاشكراشە: مرۆڤی مسوڵمان و كەسێك، كە هەڵگری قورئانە، بۆ ئەنجامدانی ئەو چوار ئەركە، كە بریتین لە: خوێندنەوەی ئایەتەكانی خوا و، تەزكیە كردنی دەوروبەر و كۆمەڵگا و، كتێب و حیكمەت فێركردنیان، بەو چەمك و

واتایەی، کە باسمان کرد، دەبێ هەر شێوازێکی شەرعیی بگرێتە بەر، کە بۆی دەگونجێ، دیارە شێوازی کارکردنیش لە شوێنێکەوە بۆ شوێنێك و، لە کاتێکەوە بۆ کاتێك و، لە قۆناغێکەوە بۆ قۆناغێك و، لە کۆمەڵگا و ژینگەیەکەوە بۆ کۆمەڵگا و ژینگەیەکی دی، دەگۆڕێ، لەبەرئەوە دەڵێین: لە ئیسلامدا دەبێ ئامانجەکان چەسپاو و نەگۆڕ بن، بەڵام ئامراز و شێوازەکان، کە ئامانجەکانیان پێ وەدەست دێنین، دەبێ هەمیشە نوێکاریی و تازەگەرییان تێدا هەبێ و، نابێ کۆمەڵگا چەقبەستووبێ، لەسەر شێواز و ئامرازێك لە شێواز و ئامرازەکان.

بۆ نموونە: پێش ئەوەی تەکنۆلۆجیا ئاوا بەرەو پێش بچێ و، هۆیەکانی ڕاگەیاندن بەو شێوەیەی ئێستا گەشە بکەن، ئەو ئامرازانەی، کە ئێستا هەن، کەناڵەکانی ڕاگەیاندن وەك: تەلەفزیۆن، ڕادیۆ، ڕۆژنامە، گۆڤار، ئینتەرنێت، ئەوانە کاتی خۆی نەبوون، بۆیە پێغەمبەر (علیه الصلاة والسلام)، هەروەها زانا و پێشەوایانمان، بەو ئامراز و شێواز و هۆکارانەی، کە دەستیان پێیان گەیشتوە، کاری خۆیانیان کردوە، بەڵام ئێمە ئێستاکە لە ئەنجامی ئەوەدا، کە ئینسان لە ڕووە ماددییەکەیەوە زۆر بەرەو پێشەوە چووە، زۆر هۆکار و ئامرازی وامان کەوتوونە بەردەست، کە دەتوانین لێیان بەهرەمەند بین، لەسەرمان پێویستە ئەو هۆکار و ئامرازانە بەکاربێنین، چونکە زانایان لەسەر بنچینەیەکی شەرعیی یەکدەنگن، کە دەڵێ: (للوسائل حکم المقاصد) واتە: ئامراز و هۆکارەکان حوکمیان، حوکمی ئامانجە شەرعییەکانە، کەواتە: کاتێك ئامانجێکمان پەکی لەسەر ئامرازێك کەوتوە و، بەو ئامرازە نەبێ جێ بەجێ نابێ، ئەوە دەبێ دڵنیابین، کە ئەو ئامرازەش، کە ئەو ئامانجە شەرعییە پەکی لەسەری کەوتوە، وەك ئامانجەکە فەرزە.

هەروەها بنچینەیەکی دیکەی شەرعیی هەیە، دەڵێ: (ما لایتم الواجب الا به فهو واجب): هەر شتێك فەرزێك پەکی لەسەر کەوتبێ، ئەویش فەرز دەبێ، لەبەرئەوە مسوڵمانان لە کاری ئیسلامیی و پاکسازیی و چاکسازیی کردنی کۆمەڵگاکەیان و، گۆڕینی کۆمەڵگاکەیان دا، لە نەفامیی و ناشەرعییەوە، بەرەو پابەندیی بە شەریعەت و، بەرەو ئەوە کە خوا لێیان ڕازی بێ، لە هەموو لایەکەوە و لەهەموو بوارەکانی ژیاندا، دەبێ سەرنج بدەن:

چ ئامرازێك كاریگەرترە و، چ هۆكارێك زیاتر لە ئامانجەكانیان نزیكیان دەخاتەوە و، ئامانجەكانیان بۆ دابین دەكات، لەسەریان فەرزە، كە ئەو ئامراز و هۆكارانە بەكاربێنن و دابینیان بكەن.

## چاكترین شێوازی چاكسازیی كۆمەڵگا

ئنجا لە كۆتایی ئەم وانەیەشدا دەڵێین: لە ڕاستی دا گەورەترین هۆكار، یان چاكترین شێواز بۆ ئەوەی ئینسان كاربكاتە سەر دەوروبەری خۆی، ئەوەیە، كە بە زمانی حاڵ و، كردار ئەو خەڵكە بدوێنێ و ئیسلامیان تێبگەیەنێ، واتە: ئیسلامەتیی لەخۆیدا بەرجەستە بكات، یانی: ئەگەر دەتەوێ خەڵك ئیمان و عەقیدەی ئیسلامییت لێ وەربگرێ، لە پێشدا بۆ خۆت ئیمان و عەقیدەی ئیسلامیی، لە خۆتدا بەرجەستە بكە، وە ئەگەر دەتەوێ خەڵك عیبادەتت لێوە فێربێ، بۆخۆت لە پێشدا خواپەرست (عابد) بە، وە ئەگەر دەتەوێ خەڵك ئاكار و ڕەوشتی ئیسلامییت لێ فێربێ، لە پێشدا بۆ خۆت خۆت برازێنەوە، بە ئاكار و ڕەوشتی ئیسلامیی، وە ئەگەر دەتەوێ خەڵك ئیخلاص و دڵسۆزیی و هەر شتێكی دیكەی باشت لێوە فێربێ، لە خۆتی دا بێنە دی.

بەكورتی: بە زمانی حاڵ و كردار خەڵك بدوێنە! بە تەئكید زمانی حاڵ و كردار، زۆر زمانێكی ڕوون و ڕەوانە، هەموو كەسێك لێی حاڵی دەبێ، هەر بۆیە گوتراوە: (عمل رجل في ألف رجل، أبلغ من قول ألف رجل في رجل) واتە: كردەوەی پیاوێك لەسەر هەزار پیاو، كاریگەرترە لە قسەی هەزار پیاو لەسەر پیاوێك.

بەڵێ ئینسان بە كردەوە و ڕەفتاری، بە هەڵوێست و بە ئاكاری، دەتوانێ كاربكاتە سەر خەڵكێكی زۆر، بەڵام بەڕاستی ئەگەر هەر قسە بێ و، كردەوەی لەگەڵدا نەبێ و، مامەڵە و ڕەفتار و هەڵوێستی لەگەڵ دا نەبێ، هیچ كەس بەپوولێك نایكڕێ، چونكە خەڵك تەماشا دەكات، دەڵێ: ئەو ئینسانە. كە قسەی



باش دەكات، ئەگەر بۆخۆی قەناعەتی بە قسەكانی بووایە، دیارە لە پێشدا بۆخۆی ڕەفتاری پێ دەكردن، كەواتە: كە بۆخۆی بەو شێوەیە ڕەفتار ناكات، دیارە لە پێش هەموو كەسدا، بۆخۆی قەناعەتی پێیان نیە!

بەڵام وریابن! لێرەدا مەبەست ئەوە نیە تۆ بڵێی: بۆ ئەوەی تەئسیر لە خەڵك بكەین، با خۆمان چاك بكەین، نەخێر، لە ڕاستیی دا خۆ چاككردن لە ڕووی ئیمان و عەقیدەوە، لە ڕووی عیبادەتەوە، لە ڕووی ئاكار و ڕەوشتەوە، لە ڕووی هەڵس و كەوت و مامەڵەی شەرعییەوە لەگەڵ خەڵك دا، خۆی لە خۆیدا پێویستەو مسوڵمانەتیی و بەندایەتییمان بۆ خوا، ئەوەیە كە لە زاتی خۆمان دا پابەند بین بە شەریعەتەوە، ئنجا لە بەرەكەتی پابەندیی خۆمان بە شەریعەتەوە، خەڵكیش شیرینایەتیی ئەو دینداریی و مسوڵمانەتیی و ئیسلامەی لە دڵ دا دەچەسپێ، بەڵام بە مەرجێك بۆخۆمان دینداریيەكەمان دینداریيەكی ڕاست و ڕێك و پێك بێ، بەو شێوەیەی، كە خوا سبحانە و تعالی فەرموویەتی و، پێغەمبەر صلی الله علیە وسلم كردوویەتی، واتە: دەبێ ئێمە دڵنیا بین، كە هەر كاتێك دەوروبەر و كۆمەڵگا ئەگەر بەڕاستی لە حەق بگەڕێ، هەر كاتێك ئیسلامی بەشێوەی ڕاستەقینەی خۆی لە مسوڵماناندا بكەوێتە بەرچاو، ئەوە بە تەئكید ئەو كۆمەڵگا و خەڵك و دەوروبەرە، كەم تا زۆر، دەكەوێتە ژێر كاریگەرییەوە، چونكە خوای پەروەردگار هەموو ئینسانەكانی لەسەر فیترەتی خواپەرستیی خوڵقاندوون، كاتێك مرۆڤ ئەوەی كە لە دەروونیی دا هەستی پێدەكات، لە واقیعی دەرەكیی دا دەیبینێ، دەڵێ: ئەوە هەمان شتە، كە من لە دڵمدا هەیە، ئاخر كێ هەیە، كە خۆشیی لە ڕاستگۆیی نەیەت؟ یان كێ هەیە مرۆڤی ئازای خۆشنەوێ؟ یان بابای سەخیی خۆش نەوێ؟! بێگومان هەموو كەس ئەوانەی خۆش دەوێن، بۆچی؟ چونكە خوا لە فیترەتی ئینساندا، ئەو شتانەی داناوە و، بەشتی چاكیان دەزانێ، وە بە پێچەوانەوە: هەموو كەس ڕقی لە درۆیە، ڕقی لە فرت و فێڵە، ڕقی لە دڵ ڕەقییە، ڕقی لە ستەمە، ڕقی لە خراپەیە، بۆچی؟ چونكە لە فیترەتی ئینساندا وایە و، مرۆڤ بە سروشت كەیفی لە چاكە و خێرە و، ڕقی لە شەڕ و خراپەیە.

ئنجا ئەگەر بێت و ئێمە بەو شێوەیە، کە ئیسلام دەڵێ: لەگەڵ خۆمان و دەوروبەرماندا مامەڵە بکەین، وە ئیسلام لە خۆماندا بەرجەستە بکەین، بۆ ئەوەی، کە خوا لێمان ڕازی بێ، بە تەئکید ئەو ئیسلام لە خۆدا بەرجەستەکردنە و، ئەو ئیسلام لەخۆدا ڕەنگ پێدانەوەیە، باشترین شێواز و باشترین ڕێبازە بۆ بانگەواز و تەزکیە کردنی خەڵك، وە بۆ ئاشنا کردنیان بە دینی خوای پەروەردگار، کە وەك گوتمان: ئەوە ئەرکی هەرە گرنگ و سەرەکیی پێغەمبەری خوا صلی الله علیه وسلم بووە، کە یەکەمین هەڵگری قورئان بووە، وە ئەرکی سەرشانی هەر کەسێکیشە، کە خۆی بە شوێنکەوتەی پێغەمبەر دەزانێ، وە خۆی بەوە دەزانێ، کە ئەویش شوێنکەوتووی قورئان و هەڵگری قورئانە.

خوای بەخشەر لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە لە پێشدا خۆیان بە کتێبی خوا تەزکیە دەکەن و، لە ڕاستییەکانی قورئان شارەزا دەبن و، پێیان ئاشنا دەبن، پاشان تەوفیقی ئەوەشیان دەدا کە: دەوروبەریشیان تەزکیە بکەن بە قورئان و، ئاشنایان بکەن بە ڕاستییەکانی قورئان، وە بەهۆی پابەندیی بە ڕەوشت و یاساکانی قورئانەوە، کۆمەڵگا و دەوروبەرەکەیان بەو شێوەیە لێبکەن، کە ڕاست بێت پێیان بگوترێ: کۆمەڵگایەکی مسوڵمان و میللەتێکی خاوەن ئیمان.

و صلی الله علی محمد و علی آله و صحبه أجمعین

والحمد لله رب العالمین.




## هەنگاوی حەوتەم:

# چاكسازیی و حوكمڕان كردن
# (الإصلاح و التحكیم)

خوشك و برایانی بەڕێز و خۆشەویست !

ئەم وانەیەمان وانەی حەوتەم و كۆتاییە لە زنجیرە وانەی: ((چۆن باشتر لە قورئان بەهرەمەند دەبین؟!)). ئنجا ئێمە چەند جارێك لە وانەكانی ڕابردوودا باسمان كرد، كە ئێمە بۆ چۆنیەتی هەڵس وكەوتكردنێكی شەرعییانەی ڕاست و دروست لەگەڵ قورئاندا، حەوت هەنگاومان دیاریی كردوون، یان حەوت قۆناغ، كە پێنج لەو قۆناغ و هەنگاوانە، تایبەتن بە مرۆڤەوە وەك تاك، كە دەبێ وەك تاكێك ئەو پێنج هەنگاوانە بنێ، بۆ ئەوەی هەڵس و كەوتێكی ڕاست و دروست لەگەڵ قورئاندا بكات، دووانیشیان، كە هی شەشەم و حەوتەمن، واتە: وانەی ڕابردوو و ئەوەی ئێستامان، پەیوەندییان بە دەرەوەی ئینسانەوە هەیە و، لە دەرەوەی بازنەی خود (ذات) دان.

وە پێنج هەنگاوی یەكەم، كە لە بازنەی ئینسان خۆیدا كورت هەڵدێن، بریتی بوون لە:

**هەنگاوی یەكەم:** ئەدەب نواندن و بە گەورە و بەرز گرتنی قورئان.

كە ئەوەش وەك باسمان كرد، ئینسان هەتا ئیمانی بە خوا زیاتر بێ و هەتا لە خوا نزیكتر بێ، وە هەتا ئیمانی بە قورئان زیاتر بێت و، زیاتر لێی تێ بگات و لێی



نزیكتر بێ، به‌ ته‌ئكید زیاتر له‌به‌رامبه‌ریدا به‌ ئه‌ده‌ب ده‌بێ و، به‌ به‌رزو گه‌وره‌ی ده‌گرێ و، خۆشی ده‌وێت و له‌ لای پایه‌به‌رز و به‌رێز ده‌بێ.

**هه‌نگاوی دووه‌م:** بریتی بوو له‌: خوێندنی قورئان و گوێ بۆ گرتنی.

**هه‌نگاوی سێیه‌م:** بریتی بوو له‌: بیر لێ كردنه‌وه‌و لێ وردبوونه‌وه‌ی.

**هه‌نگاوی چواره‌م:** بریتی بوو له‌: كارتێكران له‌ لایه‌نی قورئانه‌وه‌، خۆت وا لێبكه‌ی، كه‌ قورئان كارت تێ بكا و، دڵی خۆتی بۆ بكه‌یه‌وه‌ و كارلێك (تفاعل)ی له‌گه‌ڵ بكه‌ی و، لێی به‌هره‌مه‌ند بی.

**هه‌نگاوی پێنجه‌م:** بریتی بوو له‌: شوێنكه‌وتنی قورئان و مل بۆ كه‌چكردنی.

(عائشة) دایكی بڕواداران خوای لێی ڕازی بێت ده‌رباره‌ی عومه‌ر خوا لێی ڕازی بێت: دووه‌مین جێنشینی پێغه‌مبه‌ر علیه الصلاة والسلام، گوتوویه‌تی:

( كان عمر وقّافًا عند كتاب الله ).

واته‌: له‌كاتێكدا كه‌ كتێبی خوا ده‌خوێنرایه‌وه‌، عومه‌ر چاك ڕاده‌وه‌ستا، یانی: یه‌كێك گوتبای: ئه‌ی عومه‌ر! ئه‌وه‌ نیه‌ خوا وا ده‌فه‌رموێ، یه‌كسه‌ر ڕاده‌وه‌ستا و هه‌ڵوه‌سته‌ی ده‌كرد. دیاره‌ (عائیشه‌) خوا لێی ڕازی بێت ده‌رباره‌ی عومه‌ر واده‌ڵێ، له‌به‌ر ئه‌وه‌ی خه‌سڵه‌تێكی ئاشكراو دیاریبوو، ئه‌گه‌رنا هه‌موو هاوه‌ڵان (أصحاب) خوا لێیان ڕازی بێ، هه‌ر وابوون، وه‌ هه‌موو ئینسانێكی مسوڵمانیش ده‌بێ هه‌روا بێ، كاتێك كه‌ فه‌رمایشتی خوا دێته‌ پێش، ده‌بێ ئینسان یه‌كسه‌ر هه‌ڵوه‌سته‌ بكات و بوه‌ستێ و، بزانێ خوا چی فه‌رمووه‌ و، چی لێ داوا ده‌كات؟!

بۆ نموونه‌: له‌ (عه‌بدوڵڵای كوڕی عومه‌ر) خوا له‌ خۆی و بابی ڕازیبێ گێڕراوه‌ته‌وه‌: ڕۆژێك ئه‌م ئایه‌ته‌ی خوێنده‌وه‌:

﴿لَن تَنَالُواْ ٱلْبِرَّ حَتَّىٰ تُنفِقُواْ مِمَّا تُحِبُّونَ ۚ وَمَا تُنفِقُواْ مِن شَيْءٍ فَإِنَّ ٱللَّهَ بِهِۦ عَلِيمٌ﴾ آل عمران: ٩٢.

واته‌: نابنه‌ چاكه‌كار هه‌تا له‌و شته‌ی، خۆشتان ده‌وێ، نه‌به‌خشن.

ئه‌ویش یه‌كسه‌ر ئه‌و موصحه‌فه‌ی، كه‌ لێی ده‌خوێند، وێكی هێنایه‌وه‌ و دایخست و، چۆوه‌ ماڵێ و هاته‌وه‌ ده‌ستی پێكرده‌وه‌، یه‌كێك لێی پرسی: ئه‌وه‌

چیت کرد، ئەی (عەبدوڵڵا)؟ گوتی: ئەوە چووم ئەم ئایەتەم جێ بەجێ کرد، قاتێك جلی چاکم هەبوو، چووم لە ماڵەوە بەخشیم و ئنجا هاتمەوە، ئەم ئایەتەم جێ بەجێ کرد، ئنجا ئایەتەکانی دیکە دەخوێنم ! بەڵێ قورئان بۆیە دەبێ بخوێندرێتەوە و لێی تێ بگەی، تاکو بەڕاستی شوێنی بکەوی: چ لە بواری ڕەفتاری شەخسیی دا، چ لە کاروباری سیاسییدا، چ لەبواری کۆمەڵایەتیی و خێزانییدا.. هتد، لە هەموو بوارەکان دا دەبێ هەرچی قورئان فەرموویەتی، بە پێی توانا شوێنی بکەوی و بۆی گەردن کەچ بی، ئەوجار مانای وایە تۆ ڕێزت لە قورئان گرتوە و، بڕوات پێی هەیە و، بەگەورەت گرتوە و، خۆشت دەوێ و، لەلات بەرز و بەڕێزە، ئەگەرنا تۆ هەر قورئان بخوێنیتەوە، بەڵام هیچ کارت تێنەکا و، هیچ هەڵوێستت نەگۆڕێ و شوێنی نەکەوی و، بیر لە ئیش پێ کردنی نەکەیەوە، ئەوە وەك ئەوانە وایە، کە (أبو حامد الغزالي) لەبارەیانەوە، دەڵێ[1]: ئەوانەی، کە قورئان دەخوێنن، بەڵام ئیشی پێناکەن، لەسەر سەریان دایدەنێن و ماچی دەکەن و لەبەرگیەوە دەیپێچن، بەڵام پێیەوە پابەندنین، وەك ئەوە وایە دەسەڵاتدارێك نامەیەك بنێرێت بۆ شوێنێك، بۆ خەڵکی وڵاتێك، کە کۆمەڵێك تەعلیماتی تێدابێ بۆ جێبەجێکردن، ئەوانیش ئەو نامەیەی، کە ئەو دەسەڵاتدارە ناردوویەتی، بێنن بۆنخۆشی بکەن و لەبەرگیەوە بپێچن و، لە شوێنێکی بەرزی دانێن و بڵێن: ئەوە نامەی ئەو حوکمڕان و دەسەڵاتدارەیە و، بۆیە دەبێ ڕێزی لێبگرین و بۆن خۆشی بکەین و، لە شوێنێکی بەرزی دابنێین، تۆزی لێ نەنیشێ! ئنجا (غزالي) دەڵێ: بە تەئکید ئەو حوکمڕانە ئەگەر ئەوەی پێبگاتەوە لە جیاتی پێخۆشبوون، زۆریشیان لێ تووڕەدەبێ و سزاشیان دەدات و دەڵێ: خۆ من بۆ ئەوەم نەناردوە، بۆن خۆشی بکەن ئاوا ڕێزی لێبگرن، بەڵکو ناردوومە ئیشی پێبکەن، ڕێز لێگرتنەکەی و ئەدەب بەرامبەر نواندنەکەی، ئەوەیە کە کاری پێبکرێ.

جا ئەو پێنج هەنگاوانە، هەر مسوڵمانێك، کە قورئان دەخوێنێ، یان کە قورئانی بۆ دەخوێندرێتەوە و، لە قورئان حاڵی دەبێ، دەبێ ئەو هەنگاوانە لە زاتی خۆیدا بنێ و، بەم شێوەیە هەڵس و کەوت لەگەڵ قورئاندا بکات.

---

(١) لە کتێبی (إحياء علوم الدين) دا هێناویەتی.



**وە هەنگاوی شەشەم:** بریتی بوو لە: تەزكیە پێكردن و فێركردن، بەڵێ، ئینسانی مسوڵمان هەوڵدەدات دەوروبەرو كۆمەڵگاكەی بە قورئان تەزكیە بكات و پاكسازیی و چاكسازیی بكات و بژاری بكات، لە هەرچی ناشەرعیی و غەڵەت و پەڵەت و لادان هەیە، چ پەیوەندیی بە لایەنی ئیمان و عەقیدە و بیروبۆچوونەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی عیبادەتەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بەلایەنی هەڵس و كەوتی شەخسییەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی هەڵس و كەوتی خێزانییەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە ئەدەبی گشتییەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بە لایەنی حوكم و سیاسەتەوە هەبێ، چ پەیوەندیی بەلایەنی ئیدارییەوە هەبێ، دەبێ هەوڵبدات ئەو دەوروبەرەی خۆی، بژار بكات و پاكی بكاتەوە، لە هەڵە و ناشەرعییەكان و، دواییش بیشیرازێنێتەوە بەوەی، كە خوا پێی خۆشە و فەرمانی پێكردوە، ئنجا دوایی لەسەر ئاستی ژیانی كۆمەڵگەش كتێب و حیكمەتیان فێربكات، كە وەك پێشتر باسمان كرد (كتێب) واتە: شەریعەتی خوای كاربەجێ، كە ئەویش بەزۆریی هەر لە قورئان دایە، كە ژیانی كۆمەڵ ڕێك دەخات لە هەموو ڕووە كانییەوە، وە (حیكمەت)یش بریتیە لەو ئەدەب و ڕەفتار و ڕەوشتە بەرزانەی، كە قورئان گرتوونیە خۆی.

**ئێستاش باسی هەنگاوی حەوتەمی** ئینسانی مسوڵمان دەكەین بۆهەڵس و كەوتی لەگەڵ قورئاندا، كە (چاكسازیی و حوكمڕان كردن)ە، واتە:

چاك كردنی كۆمەڵگا بە هۆی قورئانەوە و چاكسازیی تێدا كردنی و گۆڕینی بەرەو خێر و چاكە، وە پاشان حوكمڕانكردنی كتێبی خوا بە سەریەوە، ئنجا وەك پێشتریش گوتمان: هەنگاو و قۆناغەكانی یەكەم و دووەم و سێیەم و چوارەم و پێنجەم، باس لە هەڵس و كەوتكردنی ڕاست و دروستی تاك لەگەڵ قورئان دا دەكەن، بەڵام هەنگاو و قۆناغەكانی شەشەم و حەوتەم، زیاتر پەیوەندییان بە خەڵك و كۆمەڵگای مسوڵمانەوە هەیە بەگشتی و، ئەنجامدانیان پەكی لەسەر كاری بە كۆمەڵ و هەرەوەزیی كەوتوە.

بەتایبەت ئەم هەنگاو وقۆناغی حەوتەمە، بە پلەی یەكەم پەیوەستە بەپاكسازیی و چاكسازیی تێدا كردنی دام و دەزگا و دامەزراوەكانی بەڕێوە





بردنی كۆمه‌ڵگاوه‌، له‌ بواره‌كانی سیاسیی و ئابووریی و ئیداریی دا.

ئێستاش بۆ ئه‌وه‌ی چه‌مك و واتای ئه‌م هه‌نگاو و قۆناغی حه‌وته‌م و كۆتاییه‌ی هه‌ڵس و كه‌وتكردن له‌گه‌ڵ كتێبی خوادا، له‌ دڵ و مێشكمان دا ڕوونتر بێت، با تۆزێك چه‌مك و واتای هه‌ركام له‌ (إصلاح) و (تحكيم) ڕوون بكه‌ینه‌وه‌:

## پێناسه‌ و چۆنیه‌تی چاكسازیی (إصلاح)

وشه‌ی (إصلاح) یه‌ك جار[١] له‌ قورئاندا هاتوه‌، له‌سه‌ر زمانی یه‌كێك له‌ پێغه‌مبه‌ران، كه‌ (شُعيب)ه‌، عليه السلام، كه‌ هه‌ندێك له‌ زانایان به‌ وتاربێژی پێغه‌مبه‌ران (خطيب الأنبياء) ناویان بردوه‌، له‌به‌رئه‌وه‌ی پێغه‌مبه‌رێكی زۆر فه‌صیح و قسه‌زان و قسه‌ به‌ڕێ و جێ بووه‌، ئه‌ویش، كه‌ له‌ سووره‌تی (هود) دا ده‌فه‌رموێ:

﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ وَمَا تَوۡفِيقِيٓ إِلَّا بِٱللَّهِۚ عَلَيۡهِ تَوَكَّلۡتُ وَإِلَيۡهِ أُنِيبُ ٨٨ ﴾

ئنجا ده‌توانین بڵێین: وشه‌ی (إصلاح) به‌كورتیی، واته‌: چاك كردن، چونكه‌ (إصلاح) له‌سه‌ر وه‌زنی (إفعال)ه‌ و، له‌ (صَلَح)ه‌وه‌ هاتوه‌، كه‌ به‌ مانای (چاكبوو) دێ، وه‌ (أصلح) یانی چاكی كرد[٢]، كه‌واته‌: (إصلاح)ی كۆمه‌ڵگا، یانی صاڵح كردنی و چاككردنی. ئنجا خوای په‌روه‌ردگاریش به‌ڵێنی داوه‌ به‌ هه‌ر میلله‌تێك كه‌ ئه‌گه‌ر چاك (صالح) بێت، بیكاته‌ جێنشینی خۆی له‌سه‌ر زه‌وی دنیا و، سه‌ر زه‌مینی به‌هه‌شتیشی پێ ببه‌خشێ، وه‌ك فه‌رموویه‌تی:

---

(١) واته‌: به‌م شێوه‌یه‌، ئه‌گه‌رنا له‌گه‌ڵ پێوه‌لكێنرانی ڕاناو دا، وه‌ك (إصلاحها..) چه‌ند جارێك هاتوه‌.

(٢) مختار الصحاح، ص ٣٢٦.



﴿ وَلَقَدْ كَتَبْنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعْدِ ٱلذِّكْرِ أَنَّ ٱلْأَرْضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّـٰلِحُونَ ﴿١٠٥﴾ إِنَّ فِي هَـٰذَا لَبَلَـٰغًا لِّقَوْمٍ عَـٰبِدِينَ ﴿١٠٦﴾ ﴾ الأنبياء.

واته: بێگومان ئێمە لەدوای زەبوور لە (ذکر)دا (کە مەبەستی تەوڕاتە) نووسیومانە (واتە: خوا ئەو یاسایەی خۆی، هەم لەزەبووردا نووسیوە و، هەم لە تەوڕاتیشدا، دیارە لە قورئانیشدا هەر بەیانی کردوە)، کە سەر زەمین، بەندە چاکەکانم بە میراتی دەگرن (واتە: دەستەڵاتی تێدا پەیدا دەکەن و حوکمڕانیی تێدا دەکەن).

هەڵبەتە لێرەدا مانای وشەی (الأرض) دوو ئیحتیمالی هەن، کە پێکەوەش ناکۆك نین، واتە: دەگونجێ لە یەك کاتدا هەردووکیان مەبەست بن، یەکەم:، کە مەبەست سەر زەمینی دنیا بێ، دووەم:، کە مەبەست زەوی بەهەشت بێت، چونکە خوای زانا و توانا لە قورئاندا، بەهەشتیش هەر بە وشەی (الأرض) ناو دەبات[1].

ئنجا بە تەئکید ئەو بەندانەی، کە بۆ خوا چاکن و، ئەو کۆمەڵگا و میللەتەی چاکە، خوای باڵادەست هەم سەر زەوی دنیایان تەسلیم دەکات، کە تێیدا خاوەن دەستەڵات و باڵادەست بن و، شەریعەتی خوای تێدا پیادە بکەن، وە هەم زەوی بەهەشتیشیان تەسلیم دەکات، بۆ ئەوەی تێیدا نیشتەجێ و سەقامگیربن.

کەواتە: (إصلاح) یانی: ئەو کۆمەڵگا و دەوروبەرەت وا لێ بکەی، شایستەی ئەوە بێ، کە خوای کاربەجێ بیچەسپێنێ لەسەر زەویداو، دەسەڵاتی بداتێ، بەو شێوەیەی خوا پێی خۆشە، ژیانی خۆی ڕێك بخات و ئیدارە بکات لەسەر زەوی، چونکە مرۆڤ داوای لێکراوە و لەسەری پێویست کراوە، کە بەندایەتی بۆ خوا بکات، بەندایەتیی بۆ خوا کردنیشی، بەوە دەبێ کە بە پێی شەریعەتی خوا ژیانی خۆی بەڕێوەبەرێ، ئنجا لە ژیانی تایبەتیی و شەخسیی خۆیدا، ئەوە دیارە مسوڵمان هەمیشە مولزەمە، کە بەو شێوەیەی خوا عز وجل فەرمانی پێکردوە، بژی.

---

(١) وەك فەرموویەتی: ﴿ وَقَالُواْ ٱلْحَمْدُ لِلَّهِ ٱلَّذِي صَدَقَنَا وَعْدَهُۥ وَأَوْرَثَنَا ٱلْأَرْضَ نَتَبَوَّأُ مِنَ ٱلْجَنَّةِ حَيْثُ نَشَآءُ ۖ فَنِعْمَ أَجْرُ ٱلْعَـٰمِلِينَ ﴿٧٤﴾ ﴾ الزمر.

وە هەروەها لە ژیانی خێزانیشی دا، ئەوەندەی دەسەڵاتی هەبێ، وە لە ژیانی کۆمەڵایەتیشی دا بە هەمان شێوە، بەڵام لە ژیانی کۆمەڵیی دا، ئەوە دیارە کە بە تەنیا ناکرێت و، دەبێ مسوڵمانان بە هەموویانەوە دەستبار بۆ یەك بگرن و هاوکاریی پێکەوە بکەن، بۆ ئەوەی ژیانەکەیان بەو شێوەیە لێ بکەن، کە خوا پێی خۆشە، چونکە خوای بەبەزەیی، کە دەفەرموێت:

﴿ وَمَا خَلَقْتُ ٱلْجِنَّ وَٱلْإِنسَ إِلَّا لِيَعْبُدُونِ ﴿٥٦﴾ ﴾ الذاريات.

دیارە ئەم ئایەتە: هەم چەمك و واتایەکی تاکیی هەیە، واتە: تاك تاکی جند و ئینسانەکان خوا بۆیە دروستی کردوون، کە بەندایەتیی بۆ بکەن، وە هەم چەمك و واتایەکی گشتیشی هەیە، واتە: کۆمەڵی جند و کۆمەڵی مرۆڤ، خوا بۆیە دروستی کردوون، کە بەندایەتیی بۆ بکەن، دیارە بەندایەتییش بۆ خوا، بەوە دەبێ کە ملکەچی شەریعەتی خوا و دینی خوا بن، واتە: بە هەموویان شەریعەتی خوای پەروەردگار بەڕێوەبەرن، بۆ ئەوەی ژیانەکەیان بەو شێوەیەبێ، کە خوا پێی خۆشە.

کەواتە: بەڵێ یەکێك لە ئەرکەکانی هەڵگری قورئان، بریتیە لە چاککردن (إصلاح)ی کۆمەڵگا و دەوروبەری، دیارە ئەویش پاش ئەوەی خۆی چاك (صالح) کرد، چونکە ئەوەی چاك (صالح) نەبێ، چاکسازیی (إصلاح)ی پێناکرێ، زانایان گوتوویانە: چاککردنی خەڵك، بریتیە لە باجی چاککردنی خۆت (الإصلاح ضريبة الصلاح) بەڵێ: (فاقد الشيء لا يعطيه)، کەسێك بۆخۆی شتێکی نەبێ، ناتوانێ لێی ببەخشێ، کەسێك سێوی نەبن، ناتوانێ سێوان بداتە خەڵکی، کەسێك بۆخۆی چاك نەبێ، چاکسازیی پێ ناکرێت و، کەسێك بۆخۆی ڕاست نەبێ، خەڵکی پێ ڕاستە ڕێ ناکرێ و، کەسێك بۆخۆی لە خوا نزیك نەبێت، خەڵکی پێ لەخوا نزیك ناکرێتەوە، ئەوە خاڵێکی زۆر گرنگ و بنچینەییە، کە بزانین ئێمە بەئەندازەی ئەوەی کارمان لەخۆمان کردوە، کار لە خەڵك دەکەین.

تەماشا بکەن! ئاسنێکی ڕەش و سارد و ڕەق، دەخرێتە نێو کوورەیەکی ئاگرەوە، ئەو ئاگرە، ئاسنەکە وەك خۆی لێ دەکات، ڕەنگی وەك ڕەنگی وی لێ دێ و، گەرمی دەکات وەك خۆی، واتە: ئاگرەکە سیفەتەکانی خۆی لەسەر ئەو ئاسنە ڕەقە پەیدادەکات، بۆچی؟ چونکە بۆخۆی کاریگەریی هەیە و سیفەتەکانی خۆی نەقڵ دەکات بۆ شتێك، کە خراوەتە نێوی!



دیارە یەکێك لە حیکمەتەکانی هاتنی ئایەتی:

﴿ إِنَّ فِي هَٰذَا لَبَلَٰغًا لِّقَوۡمٍ عَٰبِدِينَ ١٠٦ ﴾ الأنبياء.

واتە: بێگومان لەمەدا پەند هەیە بۆ خواپەرستان، بەدوای ئایەتی:

﴿ وَلَقَدۡ كَتَبۡنَا فِي ٱلزَّبُورِ مِنۢ بَعۡدِ ٱلذِّكۡرِ أَنَّ ٱلۡأَرۡضَ يَرِثُهَا عِبَادِيَ ٱلصَّٰلِحُونَ ١٠٥ ﴾ دا، هەرئەوەیە کە بزانین: چاکبوونمان بەرهەمی بەندایەتیی کردنمانە بۆ خوا سبحانە وتعالى، بۆیە ئەگەر بمانەوێ (صالح) بین، دەبێ هەوڵبدەین (عابید) بین!

بەڵێ، بەڕاستی مرۆڤ بە ئەندازەی ئەوە، کە کاری لە خۆی کردوە، کاریشی پێ لە خەڵکی دەکرێ و، ئەو کەسەی ئیمانی چاکی هەبێ، دەتوانێ خەڵك بەرەو ئیمان بێنێ و، ئەوەی کە ڕەوشتی بەرز و جوان بێ، دەتوانێ ڕەوشتی خەڵکیش جوان بکات و، ئەوەی هۆشیار بێ و لە دین حاڵی بووبێ، دەتوانێ خەڵکیش حاڵی بکات و...هتد، بەڵام بەڕاستیی ئەگەر ئینسان ئەو سیفەتانەی تێدا نەبن، ئەوە قسەی ڕووت هیچ نیە و، وەك گوتراوە: ( ئاسنی سارد بە فوو گەرم نابێ ).



**بەڵێ بەڕێـــزان!**

چاککردنی کۆمەڵگا، گەورەترین ئەرکی سەرشانی هەڵگرانی قورئانە و، هەڵگرانی قورئان لە هەموو ڕووەکانەوە، خەم لە کۆمەڵگا و میللەت و دەوروبەریان دەخۆن و هەوڵدەدەن، کۆمەڵگا و دەوروبەریان بەو شێوەیە لێ بکەن، کە قورئان فەرموویەتی.

سەرنجدانێکی ئەو ئایەتانەی، کە لە سیاقی ئەواندا ڕستەی: ﴿إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَـٰحَ﴾ هاتوە:

﴿ ۞ وَإِلَىٰ مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا ۚ قَالَ يَـٰقَوْمِ ٱعْبُدُوا۟ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنْ إِلَـٰهٍ غَيْرُهُۥ ۖ وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ ۚ إِنِّىٓ أَرَىٰكُم بِخَيْرٍ وَإِنِّىٓ أَخَافُ عَلَيْكُمْ عَذَابَ يَوْمٍ مُّحِيطٍ ﴿٨٤﴾ وَيَـٰقَوْمِ أَوْفُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ ۖ وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ ﴿٨٥﴾ بَقِيَّتُ ٱللَّهِ خَيْرٌ لَّكُمْ إِن كُنتُم مُّؤْمِنِينَ ۚ وَمَآ أَنَا۠ عَلَيْكُم بِحَفِيظٍ ﴿٨٦﴾ قَالُوا۟ يَـٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَـٰٓؤُا۟ ۖ إِنَّكَ لَأَنتَ ٱلْحَلِيمُ ٱلرَّشِيدُ ﴿٨٧﴾ قَالَ يَـٰقَوْمِ أَرَءَيْتُمْ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٍ مِّن رَّبِّى وَرَزَقَنِى مِنْهُ رِزْقًا حَسَنًا ۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنْ أُخَالِفَكُمْ إِلَىٰ مَآ أَنْهَىٰكُمْ عَنْهُ ۚ إِنْ أُرِيدُ إِلَّا ٱلْإِصْلَـٰحَ مَا ٱسْتَطَعْتُ ۚ وَمَا تَوْفِيقِىٓ إِلَّا بِٱللَّهِ ۚ عَلَيْهِ تَوَكَّلْتُ وَإِلَيْهِ أُنِيبُ ﴿٨٨﴾ ﴾ هود.

واتە: وە بۆ لای گەلی مەدیەن، شوعەیبی برایانمان نارد، گوتی: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە! وە کەمیی لە پێوان وکێشان دا مەکەن، من دەبینم وەزعتان (ژیان و گوزەرانتان) باشە، بەڵام لە ئازاری ڕۆژێکی ئابلووقەدەر لێتان دەترسم! وە ئەی گەلەکەم! پێوان و کێشان



دادگەرانە بکەن، وە شتی خەڵکی بە سووك سەیر مەکەن، وە لەسەر زەمین دا هەوڵی خراپەکاریی مەدەن! پاداشتی نەبڕاوەی خوا (لە دنیا) چاکترە بۆتان، وە من پارێزەر نیم بەسەرتانەوە (کە نەهێڵم لابدەن).

گوتیان: ئەی شوعەیب! ئایا نوێژەکەت فەرمانت پێدەکات، کە واز لەوە بێنین، کە باب و باپیرانمان دەیانپەرست، یان بە کەیفی خۆمان تەصەڕڕوف لە ماڵ و سامانی خۆماندا بکەین؟! بەڕاستیی تۆ هێدیی و مەند و سەرڕاستی!

گوتی: ئەی گەلەم! ئەدی ئەگەر من لەلایەن پەروەردگارمەوە لەسەر بەڵگەیەکی ڕۆشن بم (هەر دەبێ بە قسەم نەکەن؟!) وە خوا لەلایەن خۆیەوە بژیوێکی باشی داومێ و، ناشمەوێ پێچەوانەی ئەوە بجووڵێمەوە، کە لێتانی قەدەغە دەکەم، جگە لە چاکسازیی بە پێی توانام، مەبەستێکی دیکەم نیە، یارمەتییش بەس لە خوا دەخوازم، پشتم هەر بەوی بەستوە و، تەنیا بۆ لای ویش دەگەڕێمەوە.

وەك دەبینین شوعەیب سەلامی خوای لێ بێ، کە لەمیانەی قسەکانی دا خۆی بە چاکساز (مصلح) ناودەبات و، بەڕاشکاویی ڕایدەگەیەنێ، کە جگە لە چاکسازیی (إصلاح) کردنی گەل و کۆمەڵگایەکەی، هیچ ئامانج و مەبەستێکی دیکەی نیە: سەرەتای پەیام و بانگەوازەکەی بە: (يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥ) دەست پێدەکات! کەواتە: بەردی بناغە و یەکەمین هەنگاوی چاکسازیی ڕاستەقینە، لە ئیمان و عەقیدە و لە چەسپاندنی خوا بەیەککگرتن (توحید) دا بەرجەستەیە.

بەڵێ، بۆ ڕاستکردنەوەی هەر کۆمەڵگایەکی لار و لادەر، پێویستە خاڵی دەستپێك و وەرچەرخان: ئیمان و خوا بەیەککگرتن بێ، ئەگەرنا بە تەئکید ئەوەی، کە ناوی لێدەنرێ چاکسازیی (إصلاح)، جگە لە پینە و پەڕۆکردنی واقیعی نەفامییانەی کۆمەڵگا، چیدی نابێ!

ئنجا شوعەیب سەلامی خوای لێ بێ، پاش ڕاگەیاندنی خوا بەیەککگرتن (توحید) چوار شتی دیکە بە گەلی مەدیەن ڕادەگەیەنێ، بە واتایەکی دیکە:



پاش ڕاگەیاندنی بڕگەی یەکەمی بەرنامە چاکسازییەکەی، چوار بڕگەی دیکەشیان دەخاتە پێش چاو:

١- (وَلَا تَنقُصُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ)

٢- (وَيَـٰقَوْمِ أَوْفُوا۟ ٱلْمِكْيَالَ وَٱلْمِيزَانَ بِٱلْقِسْطِ)

٣- (وَلَا تَبْخَسُوا۟ ٱلنَّاسَ أَشْيَآءَهُمْ)

٤- (وَلَا تَعْثَوْا۟ فِى ٱلْأَرْضِ مُفْسِدِينَ)

لە بڕگەی یەکەم دا، ڕێگرییان لێ دەکات لە فێڵ و خیانەت لە پێوان و کێشان دا، واتە: کاتێك، کە شت بۆ خەڵك پێوانە دەکەن و دەکێشن.

وە لە بڕگەی دووەم دا، فەرمانییان پێدەکات، کە بە شێوەیەکی دادگەرانە پێوان و کێشان ئەنجام بدەن، چ بفرۆشن چ بکڕن!

لە بڕگەی سێیەمیش دا، شتی خەڵك بە کەم سەیرکردنیان لێ قەدەغە دەکات، کە هەم شتی مەعنەویی و هەم ماددییش دەگرێتەوە.

وە لە بڕگەی چوارەم دا، ڕێگریی و جەردەیی و خراپەکارییان لێ قەدەغە دەکات.

بەمجۆرەش بەرنامە چاکسازییەکەی، لایەنەکانی: ئیمان و ئەخلاق و ئابووریی و کۆمەڵایەتیی و سیاسی، دەگرێتەوە!

بەڵام با بزانین گەلەکەی دەڵێن چی و چۆنی وەڵام دەدەنەوە؟! (قَالُوا۟ يَـٰشُعَيْبُ أَصَلَوٰتُكَ تَأْمُرُكَ أَن نَّتْرُكَ مَا يَعْبُدُ ءَابَآؤُنَآ أَوْ أَن نَّفْعَلَ فِىٓ أَمْوَٰلِنَا مَا نَشَـٰٓؤُا۟) دەڵێن: ئەی شوعەیب! ئایا نوێژەکەت وات لێ دەکات، ئەوەی باب و باپیرانمان دەیان پەرستن، دەستیان لێ هەڵگرین، واتە: دەست لە مەعبوود و پەرستراوەکانمان هەڵگرین؟! وە ئایا نوێژەکەت وات لێ دەکات، ڕێگامان لێ بگری، کە بەکەیفی خۆمان هەڵس و کەوت بکەین، لەو ماڵ و سامانەدا، کە لەبەر دەستمانە؟!



وا دیاره گه‌لی شوعه‌یب بڕوایان به ڕژێمی سه‌رمایه‌داریی بووه و بڕوایان به لیبرالیزم بووه، كه ده‌ڵێ: تاك ئازاده چی ده‌كات بێ گوێدانه ئه‌وه‌ی میلله‌ت، زه‌ره‌ر ده‌كات یان قازانج؟ ده‌بێ كۆمه‌ڵگای (شوعه‌یب)یش به زاراوه‌ی ئێستا كۆمه‌ڵگایه‌كی (لیبراڵ) بووبن! ئنجا دیاره به‌رنامه و ئایینی خوا ده‌ڵێ: نابێ چۆنت پێ خۆشه ئاوا ته‌سه‌ڕڕوف له ماڵه‌كه‌تدا بكه‌ی، به‌ڵكو ده‌بێ چۆن خوا فه‌رموویه‌تی، ئاوا بێ، به‌ڵام سیستمی سه‌رمایه‌داریی ده‌ڵێ: چۆنت پێ خۆشه وا بكه، جا بازرگانیی به مادده سه‌رخۆشكه‌ره‌كان (مُخَدِّرات)ه‌وه ده‌كه‌ی، بازرگانیی به چه‌كی كۆكوژییه‌وه ده‌كه‌ی، چی ده‌كه‌ی بیكه، گرنگ ئه‌وه‌یه سوود و قازانجی زیاتر بكه‌ی و، نابێ گوێ بده‌یه ئه‌وه، داخۆ كۆمه‌ڵگا و میلله‌ت زه‌ره‌ر ده‌كات یان قازانج!

كه‌واته: شوعه‌یب علیه السلام وه‌ك چۆن ویستوویه‌تی كۆمه‌ڵگاكه‌ی خۆی له ڕووی عه‌قیده‌یی و فیكرییه‌وه چاك (إصلاح) بكات، ئاواش ویستوویه‌تی له ڕووی ئابووریشه‌وه، چاكیان بكات، هه‌روه‌ها له ڕووی ئه‌خلاقییه‌وه و له ڕووی كۆمه‌لایه‌تیی و سیاسیی و..هتدیشه‌وه، به‌ڵام ئه‌وان ڕه‌خنه‌ی لێ ده‌گرن و ده‌ڵێن: ئایا نوێژه‌كه‌ت فه‌رمانت پێ ده‌كات، كه واز له په‌رستراوه‌كانمان بێنین و، ده‌ست له به‌كه‌یفی خۆ ته‌صه‌ڕڕوف كردن له ماڵ و سامانماندا، هه‌ڵگرین؟!

جا دیاره ئه‌م قسه‌یه‌ی گه‌له‌كه‌ی، ئه‌وه ده‌گه‌یه‌نێ كه دیاره شوعه‌یب علیه الصلاة والسلام وای لێ حاڵی كردوون، كه نوێژ فه‌رمان به ئینسان ده‌كات كه: ده‌بێ عه‌قیده‌ی چاك بێ، لایه‌نی ئابووریی چاك بێ، لایه‌نی كۆمه‌لایه‌تیی چاك بێ، لایه‌نی سیاسی چاك بێ، دیاره لێی حاڵی كردوون، كه نوێژ ئینسانێكی ڕاست و دروست و، میلله‌تێكی ڕاست و دروست په‌روه‌رده ده‌كات.

ئنجا شوعه‌یب له وه‌لامیاندا ده‌ڵێ: ﴿ قَالَ يَٰقَوۡمِ أَرَءَيۡتُمۡ إِن كُنتُ عَلَىٰ بَيِّنَةٖ مِّن رَّبِّي وَرَزَقَنِي مِنۡهُ رِزۡقًا حَسَنٗاۚ وَمَآ أُرِيدُ أَنۡ أُخَالِفَكُمۡ إِلَىٰ مَآ أَنۡهَىٰكُمۡ عَنۡهُۚ ﴾

ده‌ڵێ: ئه‌ی گه‌له‌كه‌م! ئه‌دی ئه‌گه‌ر من له‌سه‌ر ڕێیه‌كی ئاشكرا و به‌ڵگه و بوڕهانێكی ئاشكرابم، له لایه‌ن په‌روه‌ردگارمه‌وه، واته: خۆم به‌رچاو ڕوونم له



ڕێی خۆمدا و ڕێی خۆم باش دەبینم، خوای پەروەردگار هیدایەتی داوم، بەرچاوی ڕۆشن کردوومەوە، وە خوا ڕزق و ڕۆزییەکی باشیشی داومێ و، پێویستیم بە پارە و سامانی ئێوە نیە و، بۆیە نالێم: فرت و فێڵ مەکەن و، زوڵم و زۆر مەکەن و، خراپەکاریی مەکەن، لەڕووی ئابووریی وکۆمەڵایەتیی و... هتدەوە، کە تەماعم لەماڵتان دا هەبێ! نەخێر، من پێویستیم بە ماڵی ئێوە نیە، بەڵام دەمەوێ کۆمەڵگایەکەم کۆمەڵگایەکی ساغ و سەلامەت بێ، کۆمەڵگایەکی بەختەوەر بێ و، قڕیی و پڕیی تێدا نەبێ، ستەمی ئابووریی و سیاسیی و کۆمەڵایەتیی تێدا نەبێ.

ئنجا دوایی دەڵێ: ﴿إِنۡ أُرِيدُ إِلَّا ٱلۡإِصۡلَٰحَ مَا ٱسۡتَطَعۡتُۚ﴾ من بەس دەمەوێ چاکسازیی بکەم، واتە: بەس ئامانج و مەبەستم ئەوەیە ئێوە چاك بکەم!! کەواتە: چاککردنی خەڵك، ئەوە ماناکەیەتی، دەبێ لە هەموو ڕووەکانەوە و لە هەموو لایەنەکانی ژیانەوە، ئەو کۆمەڵگایە چاك بکرێ، بەڵام ئایا دەبێ لە پێشدا لە کوێوە دەست پێ بکەی؟ هیچ یەکێك لە پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام نیە لەگەڵ میللەتی خۆی دا قسەی کردبێ، مەگەر بەو ڕستەیە دەستی پێکردوە: ﴿يَٰقَوۡمِ ٱعۡبُدُواْ ٱللَّهَ مَا لَكُم مِّنۡ إِلَٰهٍ غَيۡرُهُۥ﴾، واتە: ئەی گەلەکەم! خوا بپەرستن، جگە لەو پەرستراوێکی دیکەتان نیە، هەموویان لێرەوە دەستیان پێکردوە[1]، لە خوا بە یەکگرتنەوە.

بەڵێ، ئەوە خاڵی دەست پێ کردنی کارە، هەموو پێغەمبەران علیهم الصلاة والسلام وایان کردوە، کە دەبێ لە پێش دا، خەڵك خوا بپەرستێ، خۆی بەبەندەی خوا بزانێ، خوا بە پەروەردگار و خاوەن و پەرستراوی خۆی بزانی، تەسلیمی شەریعەت و بەرنامەکەی بێ، دەبێ لەوێوە دەست پێ بکرێ، ئەگەر نا کەسێك خوای نەناسیبێ، چۆن بە قسەی شەریعەتەکەی دەکات؟! چۆن دوای پێغەمبەرەکەی دەکەوێ؟!

---

(١) بۆ نموونە: بڕوانە: ئایەتەکانی (٥٩،٦٥،٧٣،٨٥)ی (الأعراف) کە هەرکام لە (نوح، هود، صالح، شعیب) ئەو ڕستەیان فەرمووە.



هەر بۆیەش ئێستا تەماشا دەكەی كەسێك خۆی بە مسوڵمان دەزانێ و، دەڵێ خواش دەناسم، پێی وایە ئیمانیشی بە خوا هەیە، بەڵام، كە پێی دەڵێی: ئەوە خوا حەڕامی كردوە، مەیكە و، ئەوە خوا پێویستی كردوە، بیكە!، دەڵێ: ئاخر ئەوە بەكەڵكی ئێستا نایەت!، واتە: خۆی لە خوا بە زاناتر دەزانێ، یان بەرپرسی حیزبەكەی خۆی، لە خوا پێ شارەزاترە!! بەڵام ئایا خوای زانا، ئێستای لەبەرچاو نەبووە، كە یەك پێغەمبەری ناردوە بۆ هەموو مرۆڤایەتیی هەتا دنیا دەبڕێتەوە، وە كتێبێكی ناردوە، هەتا دنیا دەبڕێتەوە، بێگومان خوای پەروەردگار، وەك چۆن لە قۆناغەكانی پێشوودا، بۆ هەر چاخ و سەردەمێك پێغەمبەرێكی دەنارد، بۆ هەر قۆناغێك كتێبێكی دەنارد، دەیتوانی لەدوای پێغەمبەری كۆتاییش علیه الصلاة والسلام، چەند پێغەمبەرێكی دیكە بنێرێ و، چەند كتێبێكی دیكە بنێرێ، بەڵام، كە بەو پێغەمبەرە ئیكتیفای كردوە و فەرموویەتی:

﴿ وَمَآ أَرۡسَلۡنَٰكَ إِلَّا كَآفَّةٗ لِّلنَّاسِ بَشِيرٗا وَنَذِيرٗا وَلَٰكِنَّ أَكۡثَرَ ٱلنَّاسِ لَا يَعۡلَمُونَ ٢٨ ﴾ سبأ.

واتە: تۆمان نەناردوە، مەگەر بۆ ئەوەی موژدەدەر و ترسێنەر بی، بۆ تێكڕای مرۆڤایەتیی بەڵام زۆربەی خەڵكی نازانن.

كەواتە: دیارە ئەو پێغەمبەرە و ئەو قورئانەی بۆی نێرراوە، ئەوەیان لە باراندا هەیە، كە ڕێنموونیی هەموو مرۆڤایەتیی بكەن و، ژیانیان ڕێك بخەن، بەو شێوەیەی خوا دەیەوێ، لە هەموو بوار و لایەنەكان دا.



## پێناسە و چۆنیەتی ( تحكیم )

### ئێستاش با سەرنجێکی چەمک و واتای وشەی ( تحكیم ) بدەین:

وشەی (تحکیم) بەکورتیی: یانی کردنە دادوەر و کردنە حوکمڕان، ئنجا کە ئێمە باسی قورئان دەکەین، لێرەدا مەبەست لە (تحکیم) ئەوەیە، کە کتێبی خوا عز وجل بکەینە دادوەر (حکم) و بیکەینە حوکمڕان (حاکم)، وشەی (تحکیم)یش لە قورئان دا هاتوە، بە صیغەی: (يُحَكِّمُوكَ )، وە خوای کاربەجێ ملدان و ڕازیبوون بە حەکەمێتیی وحوکمڕانێتیی قورئانی، لە لایەن مسوڵمانانەوە، کردۆتە سەنگی مەحەك و پێوەر و تەرازووی مسوڵمانەتیی و ئیمانداریێتییان، وەك فەرمووویەتی:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ فِيمَا شَجَرَ بَيْنَهُمْ ثُمَّ لَا يَجِدُوا فِي أَنفُسِهِمْ حَرَجًا مِّمَّا قَضَيْتَ وَيُسَلِّمُوا تَسْلِيمًا ﴿٦٥﴾ ﴾ النساء.

لێرەدا خوا عز وجل پێغەمبەری خۆی دەدوێنێ و، هۆی هاتنە خوارەوەی ئەم ئایەتەشمان لە وانەی پێشووتر دا باسکرد و کورتەکەی ئەوەیە، کە دوو نەفەر پێکەوە دەمەقاڵێیەکیان بووە و، یەکێکیان ئامادە نەبووە، کە ئەو کێشەیەی خۆی بەرێتە لای پێغەمبەر علیە الصلاة والسلام و گوتوویەتی: دەیبەین بۆ لای یەکێکی دیکە، ئیدی خوای پەروەردگار ئەو چەند ئایەتانەی ناردوونەتە خوار، کە لە ئایەتی کۆتاییاندا فەرموویەتی:

﴿ فَلَا وَرَبِّكَ لَا يُؤْمِنُونَ حَتَّىٰ يُحَكِّمُوكَ ... ﴾

واتە: نەخێر هەرچەند ئیددیعای ئیمان دەکەن، بەڵام سوێند بە پەروەردگارت ئیمان ناهێنن، هەتا نەتکەنە دادوەریان..

کەواتە: هەر کەسێك بە حوکمێکی خوا ڕازی نەبێ، هەرچەندە لافی ئیمان و ئیسلام لێ بدات، بڕوادار و مسوڵمان نیە، بەڵێ، نوێژێ دەکات و ڕۆژوو دەگرێ، بەڵام مادام یەك حوکمی خوا ڕەت دەکاتەوە، بڕوادار نیە، چونکە ئەو کەسەی، کە ئایەتەکەی دەربارە هاتۆتە خوارێ، نەچووە بڵێ: بە هیچ شتێکی ئایین و بەرنامەی



خوا ڕازی نیم! بەڵكو مەسەلەكە هەر ئەوە بووە، كە كێشەیەك و گرفتێك لە بەیندا بووە، لایەنێك گوتوویەتی: با بچین بۆ لای پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام، ئەوەی دیكە گوتوویەتی: نەخێر، با بچین بۆ لای (كەعبی كوڕی ئەشرەف)، كە سەرۆكی جوولەكەكانی خەیبەر بووە!

كەواتە: كەسێك بەهیچ لە شەریعەتی خوا ڕازی نەبێ، هەر بە هیچ ڕازی نەبێ، بە هیچ كام لە حوكمەكان، دیارە ئەوە كافری حەوت جار كافرە، كوفرەكەی هێندا تۆخە و هێندە زەقە، هەر كۆتایی نیە، بۆچی؟ چونكە ئەگەر خوا جل شأنە سوێند بخوات بە پەروەردگارێتیی خۆی، كە هەركەسێك بە یەكێك لە حوكمەكانی من ڕازی نەبێ و، لە یەكێك لە كێشەكانی دا ئامادە نەبێ، شەریعەتی من بكا بە دادوەر و، پێغەمبەری من علیه الصلاة والسلام بكات بە حەكەم، ئەوە ئیماندار نیە، ئەدی كەسێك، كە لە هیچ شتێكدا بە شەریعەتی خوا ڕازی نەبێ، حوكمی چۆنە؟ بە تەئكید وەك گوتمان: ئەوە هەر كافرێكی زۆر سەر سەختە، ئنجا با نوێژیش بكات و ڕۆژووش بگرێ، ئەوە هیچ لە مەسەلەكە ناگۆڕێ، چونكە نوێژ و ڕۆژووی وا هیچ نیە، ئاخر ئەگەر نوێژ و ڕۆژووی ڕاستەقینە بووایە و، كاتێك مرۆڤ سەر بۆ خوا دەخاتە سەر زەوی، بزانێ چی دەكات و كاتێك، كە دەڵێ: خوایە! هەر تۆ دەپەرستم! بزانێ چی دەڵێ؟ چۆن هەڵوێستی وای دەبێ؟ ئاخر ئەگەر بەس خوا دەپەرستێ، بۆچی بە شەریعەتەكەی ڕازی نیە؟

پەرستنی خوا، ئەوەیە كە مرۆڤ ئەوپەڕی ملكەچیی بۆ خوا هەبێ، جا ئەوە چ ملكەچییەكە بڵێ: ئەی خوایە! تۆ دەپەرستم، بەڵام بەشەریعەتەكەت ڕازی نیم؟! مسوڵمانم، بەڵام دینی تۆم ناوێ؟!

كەواتە: (تحكیم)ی كتێبی خوا، ئەوەیە كە بیكەیە حەكەم و حوكمڕان، واتە: هەر ئەو چارەسەركار و دادوەربێ، بۆ یەكلایی كردنەوەی كێشە و مشت و مڕەكان و بەس ئەویش بەرنامە بێ، چونكە خوای كاربەجێ لە قورئاندا، هەم خۆی بەحەكەم ناو بردوە و، هەم خۆیشی بە حوكمڕان ناوبردوە.

ئنجا هەندێك لە زانایان دەڵێن (حَكَمْ) و (حاكِم) هەر یەكن، بەڵام وا پێ ناچێ، چونكە (حاكم) واتە: ئەو كەسەی، كە بەرنامە دادەنێ، یان حوكمڕانیی

دەکات، دیارە خوای بێ وێنە، بۆ خۆی حوکمڕانیی ناکات، بەڵام بەرنامەی داناوە و پێغەمبەرەکەی علیه الصلاة والسلام حوکمڕانیی کردوە، لە دوای ئەویش جێ نشینەکانی، لە دوای وانیش هەرکەسێك دەسەڵاتی ئیسلامیی کەوتۆتە دەست، دەبێ حوکمڕانیی بکات، بە پێی بەرنامەی خوای پەروەردگار، بەڵام وەك چۆن خوا حاکمە بە مانای بەرنامەڕێژ (مُشَرِّع)، دیسان حەکەمیشە، خوای پەروەردگار هەردووکیانی فەرمووە، لەبارەی (حاکم) بوونیەوە، فەرموویەتی:

﴿ أَلَيْسَ ٱللَّهُ بِأَحْكَمِ ٱلْحَٰكِمِينَ ﴿٨﴾ ﴾ التين.

واتە: ئایا خوا کاربەجێترینی حوکمڕانەکان نیە؟! دیارە (حاکم) لێرەدا بە مانای بەرنامەڕێژو یاسا دانەرە.

هەروەها لە بارەی (حَکَمْ) بوونییەوە، فەرموویەتی:

﴿ أَفَغَيْرَ ٱللَّهِ أَبْتَغِي حَكَمًا وَهُوَ ٱلَّذِىٓ أَنزَلَ إِلَيْكُمُ ٱلْكِتَٰبَ مُفَصَّلًا ﴾ الأنعام: ١١٤.

واتە: ئایا جگەلە خوا، دادوەرێکی دیکە بخوازم؟! بەڵێ، دەبێ بەس خوا دادوەربێ و هەر خوا بۆی هەیە دادوەریی بکا لەکاتی مشت و مڕی نێوان خەڵکیدا: ئەوە هەقیەتی، ئەوە نا هەقیەتی.

کەواتە: (تحکیم)ی کتێبی خوا، بریتیە لەوەی شەریعەتی خوا بکەی بە (حاکیم)، وە بیشیکەی بە (حەکەم)، واتە: بیکەی بە بەرنامەدانەر بۆ ژیانی خەڵك و، بیشی کەی بە دادوەر، بۆ چارەسەرکردنی ئەو کێشە و مشت و مڕانەی، کە لە نێوانیاندا ڕوودەدەن.

ئنجا با سەیری ئەو سێ ئایەتە بە پێزەی سووڕەتی (المائدة) بکەین، واتە: ئایەتەکانی (٤٨ و ٤٩ و ٥٠)، خوا عز وجل فەرموویەتی:

﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَٰبَ بِٱلْحَقِّ مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ مِنَ ٱلْكِتَٰبِ وَمُهَيْمِنًا عَلَيْهِ ۖ فَٱحْكُم بَيْنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ ۖ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلْحَقِّ ۚ لِكُلٍّ جَعَلْنَا مِنكُمْ شِرْعَةً وَمِنْهَاجًا ۚ وَلَوْ شَآءَ ٱللَّهُ لَجَعَلَكُمْ أُمَّةً وَٰحِدَةً وَلَٰكِن لِّيَبْلُوَكُمْ فِى مَآ ءَاتَىٰكُمْ ۖ فَٱسْتَبِقُوا۟ ٱلْخَيْرَٰتِ ۚ إِلَى ٱللَّهِ مَرْجِعُكُمْ جَمِيعًا فَيُنَبِّئُكُم بِمَا كُنتُمْ فِيهِ تَخْتَلِفُونَ ﴿٤٨﴾ ﴾ المائدة.



واته: وه کتێب (قورئان)یشمان بۆ تۆ نارده‌خوار، که کتێبه‌کانی پێش خۆی به‌ڕاست داده‌نێ و، به‌سه‌ریشیانه‌وه چاودێره، ده‌جا به پێی ئه‌وه که خوا ناردوویه‌ته خوارێ، دادوه‌ریبیان له نێوان دا بکه و، مه‌که‌وه شوێن ئاره‌زووه‌کانیان و، له‌و هه‌قه لامه‌ده که بۆت هاتوه، بۆ هه‌ر کامێکتان - له ئۆممه‌تان - به‌رنامه و ڕێبازێکمان داناوه، وه ئه‌گه‌ر خوا ویستبای هه‌مووتانی ده‌کرده یه‌ك ئۆممه‌ت، به‌ڵام - بۆیه ئاوا بۆ چه‌ند ئۆممه‌تێك دابه‌شی کردوون - تاکو له‌وه‌دا که پێی داون، تاقیتان بکاته‌وه، ئنجا پێشبڕکه بکه‌ن له چاکه‌کان دا، تێکڕاتان گێڕانه‌وه‌تان بۆ لای خوایه، جا هه‌واڵتان پێده‌دا، به‌وه که تێیدا که‌وتبوونه ڕاجیاییه‌وه.

**هه‌ندێ که‌س ده‌ڵێن:** کوا خۆ خوا باسی ئه‌وه‌ی نه‌کردوه، که ده‌بێ قورئان حه‌که‌م بێ و، قورئان به‌رنامه‌ی ژیان بێت و، شه‌ریعه‌ت حاکم بێ؟! به‌ڵام ئه‌و مه‌سه‌له‌یه یه‌کێکه له مه‌سه‌له هه‌ره ڕۆشن و به‌ڵگه نه‌ویسته‌کان له شه‌ریعه‌تی ئیسلامیی دا، بۆ وێنه: با تۆزێك سه‌یری ئه‌م ئایه‌ته بکه‌ین، که ئێستا هێنامانه‌وه: خوا جل شأنه ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾ هه‌ڵبه‌ته ئه‌م ئایه‌ته دوای ئه‌و ئایه‌تانه هاتوه، که خوا تێیاندا باسی ته‌وڕات و ئینجیل ده‌کات، وه باسی ئه‌وه ده‌کات، که ته‌وڕاتی ناردوه و، ئینجیلیشی ناردوه بۆ ئه‌وه‌ی هه‌ردووکیان به‌رنامه بن بۆ ژیان، ته‌وڕات بۆ ژیانی به‌نی ئیسڕائیل، له‌سه‌رده‌می (مووسا) دا علیه الصلاة والسلام، ئینجیلیش بۆ ژیانی به‌نی ئیسرائیل له سه‌رده‌می (عیسا) دا علیه الصلاة والسلام، دوای ئه‌وه ده‌فه‌رموێ: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾، واته وه‌ك چۆن ته‌وڕاتمان بۆ مووسا نارد، {وشه‌ی ته‌وڕات واته: شه‌ریعه‌ت، به‌رنامه، وه وشه‌یه‌کی عیبریی یه، ئینجیلیش واته: موژده}، به هه‌مان شێوه‌ش: ﴿ وَأَنزَلْنَآ إِلَيْكَ ٱلْكِتَـٰبَ بِٱلْحَقِّ ﴾ بۆ تۆش (ئه‌ی موحه‌ممه‌د!)، که پێغه‌مبه‌ری ئۆممه‌تی کۆتایی، پێغه‌مبه‌ری مرۆڤایه‌تیی تا کۆتایی ژیانی، بۆ تۆش کتێبمان ناردوه به هه‌ق، (مُصَدِّقًا لِّمَا بَيْنَ يَدَيْهِ )، ئه‌وه‌ی له‌پێش خۆی دا بووه، هه‌مووی به‌ڕاست ده‌زانێ، واته قورئان پشتگیریی ئه‌وه ده‌کات که: (صحف)ی إبراهیم، ته‌وڕاتی مووسا، زه‌بووری داوود، ئینجیلی عیسا و هه‌موو کتێبه‌کانی دیکه‌ی خوا، که خوا ناوی نه‌هێناون، وه هه‌موو په‌یامه‌کانی خوا، که بۆ پێغه‌مبه‌رانی ناردوون،



هەموویان هەقن، لە ئەسڵ دا هەموویان هەقن، بەڵام ئێستا تەورات و ئینجیل و زەبوور دەسکاریی کراون و پڕکراون لە بیروڕای ئەفسانەیی.

دیارە قورئان پشتگیریی ئێستایان ناکات، بەڵکو پشتگیریی ئەصڵەکەیان دەکات، کە خوا بە هەق ناردوونی، (وَمُهَيۡمِنًا عَلَيۡهِ )، وە بە سەریشیانەوە چاودێرە، چۆن بە سەریانەوە چاودێرە؟ واتە: ئێستا ئێمە بەهۆی قورئانەوە، دەزانین تەورات چەندی دەستکاریی کراوە، یان نەکراوە؟ ئینجیل چەندی ڕاستە و چەندی ڕاست نیە؟ ئەو ئینجیلانەی ئێستا هەن، چەندەیان دەگونجێ بڵێی: خوا ناردوویەتی؟ چەندەشی ناگونجێ بڵێی: خوا ناردوویەتی، ئەوە قورئان حەکەمە و چاودێرە بەسەریانەوە.

پاشان فەرموویەتی: (فَٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُۖ ) واتە: دەجا تۆ حوکمیان لە بەین دا بکە، بەوەی کە خوا ناردوویەتی، خوا چی ناردۆتە خوار ؟ دیارە قورئان، کەواتە: پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام، خوای بێ هاوەڵ مولزەمی کردوە بەوە، کە حوکم بە قورئان بکات، لە نێو خەڵکی دا، وە لە دوای خۆیشی، دیارە ئۆممەتەکەشی دەبێ حوکم بە قورئان بکات، مادام خۆی بە ئۆممەتی ئەو پێغەمبەرە علیه الصلاة والسلام دەزانێ، (وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ عَمَّا جَآءَكَ مِنَ ٱلۡحَقِّۚ ) واتە: دوای ئارەزووەکانیان مەکەوە و، لەو حەقە لانەدەی کە خوا بۆی ناردووی، کەواتە: لە بەرامبەر هەقێك دا کە قورئانە، کە خوا بۆی ناردوە، چی هەیە؟ بێگومان هەوا و ئارەزوو!!

(لِكُلّٖ جَعَلۡنَا مِنكُمۡ شِرۡعَةٗ وَمِنۡهَاجٗاۚ ) واتە: بۆ هەر کامێکتان ڕێباز و بەرنامەیەکمان داناوە، (شرعة)، کە بە مانای شەریعەت دێ، واتە: ئەو ڕێبازگەیەی خەڵك ئاوی لێوە دێنێ، لێیەوە دەچێتە سەر کانی و ئاوی لێ هەڵدەهێنجێ و لێوەی دێنێ[1]، (منهاج)یش واتە: بەرنامە و ڕێیەکی ڕۆشن[2]، یانی: بۆ هەر کامێك لە ئێوە، واتە: بۆ ئۆممەتی تۆو هەر کامێك لە ئۆممەتانی پێش تۆ (ئەی

---

(١) مختار الصحاح، ص ٢٩٩.

(٢) مختار الصحاح، ص ٥٨٥، ٥٨٦.



موحەممەد! علیه الصلاة والسلام) ڕێبازێك و بەرنامەیەكمان داناوە و، ئەم قورئانەش ڕێباز و بەرنامەی تۆ و ئۆممەتەكەتە، ئنجا ئەگەر دەتەوێ: خوا بەبەندەی خۆیت لە قەڵەم بدات و، ئەگەر دەتەوێ: بە ئیماندار لە قەڵەم بدرێی، شوێن ئەو شەریعەت و بەرنامەیە بكەوە، كە قورئانە.

هەروەها لە ئایەتی ژمارە (٤٩)دا خوای بەرز هەمان ڕاستی دووبارە دەكاتەوە و دەفەرموێ:

﴿ وَأَنِ ٱحۡكُم بَيۡنَهُم بِمَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ وَلَا تَتَّبِعۡ أَهۡوَآءَهُمۡ وَٱحۡذَرۡهُمۡ أَن يَفۡتِنُوكَ عَنۢ بَعۡضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيۡكَۖ فَإِن تَوَلَّوۡاْ فَٱعۡلَمۡ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعۡضِ ذُنُوبِهِمۡۗ وَإِنَّ كَثِيرٗا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ ﴿٤٩﴾ ﴾

واتە: وە بەوە كە خوا ناردوویەتە خوار، حوكمیان لە نێواندا بكە و، شوێن ئارەزووەكانیان مەكەوە، وە وریایان بە كە لە هەندێك لەوەی خوا بۆی ناردوویە خوار، لات نەدەن، ئنجا ئەگەر هەر پشتیان كردەوە، ئەوە بزانە، كە خوا دەیەوێ، بەهۆی هەندێك لە گوناهەكانیانەوە سزایان بدات، وە بەڕاستیی زۆرێك لە خەڵكی لادەرن.

ئێستاكە لەم ڕۆژگارەدا لەلایەن تەوژمی عەلمانیییەوە، چەند مەسەلەیەك باس دەكرێن و دەورووژێنرێن، وەك ڕەخنەگرتن لە ئیسلام و پێڕازینەبوونی، بەتایبەت لە بواری ئافرەت و خێزان دا، وەك: شایەدیی ئافرەت و، میراتی ئافرەت و، مەسەلەی چەند ژنیی (تعدد الزوجات) و ...هتد، كە ئەگەر هەر كام لەم مەسەلانە بەشێوەیەكی بابەتییانە و، بە ویژدانەوە سەیر بكرێن و، بە شێوەیەكی بابەتییانە: سروشتی ئافرەت و پیاو و، پەیوەندیی نێوانیان و، بەرژەوەندیی خێزان و ...هتد، ڕەچاو بكرێن، بەدڵنیاییەوە مسۆرگەر دەبین و، دەزانین ئەوەی كە شەریعەت فەرموویەتی، هەمووی لە جێی خۆی دایە و، پێچەوانەی شەریعەت هەمووی زوڵم و نا دادگەرییە.

بەڵێ، ئێستاكە باسی ئەوە دەكرێ: چۆن دەبێ پیاوێك بۆی هەبێ چوار ژنان بێنێ؟! هەڵبەتە ئەگەر مرۆڤ كافر بێ، ئاساییە ئەو قسەیە بكات، بەڵام كێشەكە ئەوەیە بابایەك خۆی بە مسوڵمان بزانێ و، ڕەخنەشی لە حوكمی خوا



هەبێ! ئێمە کێشەمان لەگەڵ بابای عەلمانیی نیە، کە دەڵێ: بڕوام بە دین نیە و، دینەکەی بریتیە لە (بێ دینیی)! بەڵکو کێشەمان لەگەڵ کەسێکە خۆی بە مسوڵمان بزانێ و، ڕەخنەشی لە دینی خوا هەبێ!

شایانی باسیشە من لە کتێبی (ئافرەت و خێزان) دا بەدرێژی ئەو مەسەلانەم باس کردوە و ڕوونم کردۆتەوە، کە هەر کامێکیان بەڵگە و هۆکاری خۆی هەیە، هۆکاری عیلمیی و مەنتیقیی و سروشتیی[1]، بەڵام مەبەست لێرەدا ئەوەیە، کە خوای زانا و توانا دەفەرمویێ:

(وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَآءَهُمْ وَٱحْذَرْهُمْ أَن يَفْتِنُوكَ عَنۢ بَعْضِ مَآ أَنزَلَ ٱللَّهُ إِلَيْكَ): ئاگات لێبێ (ئەی موحەممەد! علیه الصلاة والسلام) وە وریابە لات نەدەن، لە هەندێ لەوەی خوا بۆی ناردووی، چونکە یەك حوکمی خوا ڕەت بکرێتەوە و تۆ ڕازی بی، بەڕەت کردنەوەی کافر دەبی! کە دیارە ئەمە فەرزی مەحاڵە، ئەگەرنا نەك پێغەمبەری خوا، بەڵکو هیچ بڕوادارێکی باشیش، هیچ شتێکی خوای پەروەردگاری پێ ڕەت ناکرێتەوە:

﴿وَمَا كَانَ لِمُؤْمِنٍ وَلَا مُؤْمِنَةٍ إِذَا قَضَى ٱللَّهُ وَرَسُولُهُۥٓ أَمْرًا أَن يَكُونَ لَهُمُ ٱلْخِيَرَةُ مِنْ أَمْرِهِمْ ۗ وَمَن يَعْصِ ٱللَّهَ وَرَسُولَهُۥ فَقَدْ ضَلَّ ضَلَٰلًا مُّبِينًا ﴿٣٦﴾﴾ الأحزاب.

واتە: هیچ پیاوێکی ئیماندار و ئافرەتێکی ئیماندار کاتێك، کە خوا و پێغەمبەرەکەی بڕیارێك دەدەن وحوکمێك دەر دەکەن، بۆیان نیە، مافی سەر پشك بوون و هەڵبژاردن بە خۆیان بدەن، وە هەر کەسێك سەرپێچیی لە خوا و پێغەمبەرەکەی بکات، ئەوە بە گومڕابوونێکی ئاشکرا گومڕا بووە.

پاشان خوا فەرموویەتی: (فَإِن تَوَلَّوْا فَٱعْلَمْ أَنَّمَا يُرِيدُ ٱللَّهُ أَن يُصِيبَهُم بِبَعْضِ ذُنُوبِهِمْ ۗ وَإِنَّ كَثِيرًا مِّنَ ٱلنَّاسِ لَفَٰسِقُونَ) واتە: ئنجا ئەگەر پشتیان هەڵکرد لە شەریعەت، ئەوە بزانە، کە خوا دەیەوێ بە هۆی هەندێك لە گوناحەکانیانەوە (هەر لە دنیادا) سزایان

---

(١) هەروەها لە نامیلکەی (سروشت و پایەکانی خێزان ومەسەلەی چەند ژنیی لە تەرازووی عەقڵ وشەرع دا) بەهەمان شێوە.
وە لە بەرگی حەوتەمی کتێبی (الاسلام کما یتجلی في کتاب الله)دا تا ڕادەیەکی باش ئەو مەسەلانە توێژاونەوە.

بدات - واتە: سزای زۆربەی گوناحەکانیان هەڵدەگرێ بۆ قیامەت، بەڵام هی هەندێکیان هەر لە دنیا دا پێیان سزا دەدات - وە زۆرێك لە خەڵکی لارێن.

وە سەرەنجام لە ئایەتی ژمارە (٥٠) دا دەفەرموێ:

﴿ أَفَحُكْمَ ٱلْجَٰهِلِيَّةِ يَبْغُونَ ۚ وَمَنْ أَحْسَنُ مِنَ ٱللَّهِ حُكْمًا لِّقَوْمٍ يُوقِنُونَ ﴾ .

واتە: ئایا ئەوانە حوکمی نەفامیی داوا دەکەن، ئنجا حوکمی کێ لە هی خوا چاکترە، بۆ کەسانێك کە دڵنیاییان هەبێ؟! کەواتە: حوکم و بەرنامە دوو جۆرە:

١- حوکمی خوا جل شأنە، کە بیناکراوە، لەسەر عیلمی بێ سنووری خوا.

٢- حوکمی نەفامیی، کە بیناکراوە لە سەر نەزانیی ئینسان و، لەسەر هەوا و ئارەزووی ئینسان.

تۆ سەیربکە! هەر بەرنامەیەکی ئینسان بێنە: مارکسیزم و کۆمۆنیزم دێنی، تەنیا بەرژەوەندیی چینی پرۆلیتار و کرێکاری تێدا ڕەچاو کراوە، لەسەر حیسابی خەڵکی دیکە و، لەسەر حیسابی چینەکانی دیکەی کۆمەڵگا.

سەرمایەداریی دێنی، بەرژەوەندیی دەوڵەمەندەکانی تێدا ڕەچاو کراوە، لەسەر حیسابی خەڵکی ڕەش و ڕووت و جەماوەر.

فیکرەی ناسیۆنالیزم دێنی، تەنیا بەرژەوەندیی ئەو گەلەی تێدا ڕەچاو کراوە، کە بیرۆکەکەی بۆ دامەزراوە، بۆ نموونە: قەومایەتی عەرەبیی، کوردیی، فارسیی، تورکیی، ئەگەر کرابێ بە بەرنامە، ئەوە تەنیا بەرژەوەندیی ئەو گەلەی تێدا ڕەچاو کراوە، لەسەر حیسابی گەلەکانی دیکە و، گەلی خۆی بەپلە یەك دەزانێ و گەلەکانی دیکە بە پلە دوو، یان پلە سێ!

هەروەها هەموو فیکرە و بەرنامەکانی دیکەش هەر وان، بۆچی؟ چونکە هەر فیکرە و بەرنامەیەك، کە ئینسان دای دەنێ: یان ئینسانێك دای دەنێ، یان چین و توێژێك دای دەنێ، یان حیزبێك دای دەنێ، یان میللەتێك دای دەنێ.

ئنجا ئەگەر ئینسانێك دای بنێ، ئەوە بەرژەوەندیی خۆی تێدا ڕەچاو دەکات، وەك حوکمە دیکتاتۆرییەکان، کە تەنیا بەرژەوەندیی خۆی و بنەماڵەکەی و دەوروبەری لەسەر حیسابی خەڵکی دیکە، لەبەرچاو دەگرێ.





وە ئەگەر حیزب دای بنێ، ئەوە بەرژەوەندیی حیزبەکەی خۆی تێدا ڕەچاو دەکات، لەسەر حیسابی خەڵکی دیکە.

وە ئەگەر میللەتێك دای بنێ، بە هەمان شێوە و، ئەگەر چینێك بێ، بەهەمان شێوە و...هتد.

بەڵام حوکمی خوا جل شأنە، چونکە خوای خەڵکییە، خوای کافر ومسوڵمانانە و، خوای ڕەش و سپییانە، خوای عەرەب و عەجەمە، خوای هەژار و دەوڵەمەندانە و، خوای هەمووانە، بۆیە حوکمەکەی بۆ هەمووان وەك یەکە، تەنانەت حوکمی خوای پەروەردگار جیاوازیی کافر و مسوڵمانیش ناکات، لە بواری قەزاوەت و دادوەریی دا، جیاوازیی بەکەس ناکات و کێ هەقی بە دەستەوە بێ، شەریعەتی خوا، هەقەکەی دەداتێ.

ئنجا بۆیەش حوکمی جگەلە خوا، هەموو جۆرەکانی، بە حوکمی نەفامیی (جاهلي) لە قەڵەم دەدرێن، چونکە هەموویان لە ئارەزووەوە و لە بەرژەوەندیی تایبەتیی و تاك و چینایەتیی و حیزبایەتیی و.. هتدەوە هەڵدەقوڵن، بەڵام حوکمی خوا سبحانە وتعالی وا نیە، چونکە خوا هیچ پێویستیی بە خەڵکی نیە و، هیچ بەرژەوەندییەکی لە هیچ شتێکدا نیە، تەنها سۆز و بەزەیی بەرانبەر بەخەڵك هەیە و، میهرەبانە و بەخششی بۆ خەڵك هەیە و، بەندەکانیش لە بەرانبەر خوادا هەموویان وەك یەکن، بۆیە ئەو شەریعەتەی کە دای دەنێ، بۆ هەمووان وەك یەکە.

هەروەها خوای بەرز و مەزن لە ئایەتی (٥١)ی سوورەتی (النور)دا فەرموویەتی:

﴿إِنَّمَا كَانَ قَوْلَ ٱلْمُؤْمِنِينَ إِذَا دُعُوٓاْ إِلَى ٱللَّهِ وَرَسُولِهِۦ لِيَحْكُمَ بَيْنَهُمْ أَن يَقُولُواْ سَمِعْنَا وَأَطَعْنَاۚ وَأُوْلَٰٓئِكَ هُمُ ٱلْمُفْلِحُونَ ﴿٥١﴾﴾

واتە: بێگومان قسەی ئیمانداران لە کاتێکدا، کە بانگدەکرێن بۆ لای خوا و پێغەمبەرەکەی بۆ ئەوەی حوکمیان لە نێواندا بکات (دادوەرییان لە نێواندا بکات)، قسەیان تەنیا ئەوەیە، کە بڵێن: بیستمان و فەرمانبەرین، (واتە: بیستمان و قبووڵمانە، وە فەرمانبەریشین و جێ بەجێشی دەکەین)، وە تەنیا ئەوانەش سەرفرازن.



## پیادەکردنی شەریعەت: پلەپلەیی و نەخشەدانان و واقیع بینیی پێویستە

**لە کۆتایی ئەم وانەیەشمان دا دەڵێین:** بێگومان پیادەکردنی شەریعەتی خوای پەروەردگار و، حاکم کردنی شەریعەتی خوا جل شأنە، ئەو شەریعەتەی لە قورئان دا خۆی دەبینێتەوە، بە تەئکید شتێکی ئاسان نیە، بە نووکە قەڵەمێك جێ بەجێ بکرێ، هەروەها شتێك نیە، کە بە ڕۆژێك و دوو ڕۆژان و بە صەبرێك و دوو فوان بێتە دی، بە بەڵگەی ئەوە کە:

**یەکەم:** پلە پلەیی (تدرّج) سوننەت و یاسایەکی خوایە لە هەموو بوونەوەردا، بۆ نموونە: خوا بۆمان باس دەکات و دەفەرموێ:

﴿ هُوَ ٱلَّذِي خَلَقَ ٱلسَّمَٰوَٰتِ وَٱلْأَرْضَ فِي سِتَّةِ أَيَّامٍ ... ﴿٤﴾ ﴾ الحديد.

واتە: خوا کەسێکە: ئاسمانەکان و زەوی بە شەش ڕۆژان دروست کردوون، واتە: شەش قۆناغ، جا هەندێك لە زانایان دەڵێن: خوای پەروەردگار بۆیە وا باس دەکات، یانی: ئێوەش ئیشەکانی خۆتان پلە پلە بکەن، قۆناغ بە قۆناغ، تەماشا دەکەی ڕووەکێك، کە دەڕوێ، لە پێشدا چەکەرەیە و، دوایی سەوز دەبێ و، دواتر گەورە دەبێ و دێتە بەر، هەروەها کۆرپەیەك و هەرشتێکی دیکە لە دروستکراوەکانی خوا، خوای زانا و توانا هەموو کارەکانی قۆناغ قۆناغن، کەواتە: ڕۆیشتن بە چەند قۆناغێك دا و پلەپلەیی، سوننەت و یاسای خوایە لە هەموو بوونەوەر دا.

**دووەم:** شەریعەتەکەیشی هەروایە و پێغەمبەری ئێمە علیه الصلاة والسلام لە ماوەی (٢٣) ساڵدا هەموو قورئانی بۆ هاتۆتە خوار، واتە: لە ماوەی بیست و سێ (٢٣) ساڵ دا ئەوجار قورئان هەمووی بە خەڵکی گوتراوە و، لە خەڵکی حاڵی کراوە و، ژیانی خەڵکی پێ چاك کراوە و ڕێکخراوە، بە تایبەتی لایەنی شەریعەتەکەی، دوای ئەوەی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام لە (مەدینە) نیشتەجێ بوو و دەوڵەت و قەوارەیەکی ئیسلامیی دامەزراند، لە ماوەی زیاتر

له ده (١٠) ساڵ دا، ئەوجار خوای کاربەجێ ئەو یاسا و حوکمانەی ناردوونە خوار، کە شەریعەتی کۆتایی پێك دێنن.

کەواتە: پێغەمبەری خوا علیه الصلاة والسلام هەرچەندە ئەو هاوەڵە بەرێزانەی لە بەردەست دا بوون، کە باشترین جیلی مسوڵمانان بوون، پێغەمبەریش علیه الصلاة والسلام سەروەری مرۆڤایەتیی و چاکترین بەندەی خوایە و، سەرقافڵەی پێغەمبەران بووە، ئنجا ئەگەر ئەو نەیتوانی بێ، بە کەمتر لە دە (١٠) ساڵ، ئەو شەریعەتە پیادە بکا و، ئەو یاساو حوکمانە جێ بەجێ بکات، ئەدی ئێمە چۆن دەتوانین؟! بۆیە: هەر کەسێك، کە باسی جێ بەجێ کردنی کتێبی خوا دەکات، باسی تەحکیم کردنی شەریعەتی خوا دەکات، لە ژیانی ئەو کۆمەڵگا و دەوروبەرەدا، کە تێیدا دەژی، ئەگەر بەرنامەیەکی واقیعیی و پلەپلەیی و قۆناغ بە قۆناغی نەبێ، مانای وایە قسەکەی هەر خەیاڵ پڵاوە و هیچ نیە، چونکە ئەگەر سەیری ژیانی پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام بکەی و دیقەت بدەی، دەبینی هێدی هێدی، بەڵام بە چەسپاویی، هەنگاو بە هەنگاو چۆتە پێش، چ لە بواری بانگەوازدا، چ لە بواری جەنگ و جیهاددا، چ لە بواری سیاسەتی شەرعیی و هەڵس و کەوتی لەگەڵ ئەو خەڵکەدا، کە لە مەدینە بوون، وەك مونافیقەکان و موشریکەکان و جوولەکەکان و، ئەوانەی لە دەوروبەری مەدینە بوون.

هەروەها لە ڕووی پەروەردەییشەوە، پێغەمبەر علیه الصلاة والسلام دیسان پلەپلەیی و قۆناغ قۆناغیی ڕەچاو کردوە، نەك هەرئەوەندە، بگرە لە بواری جێ بەجێ کردنی دروشمەکانی عیبادەتیش دا، دیسان پلەپلەیی ڕەچاو کراوە، بۆ نموونە: ڕۆژوو لە ساڵی دووەمی کۆچی دا پێویست بووە و، زەکاتیش دوای ئەو پێویست بووە، تەنانەت پێنج نوێژە فەرزەکانیش لە ساڵی: ١١-١٣ی پێغەمبەرایەتیی دا، واتە: ئەو شەوەی پێغەمبەر علیه الصلاة وسلام چووە بۆ میعراج، پێنج نوێژە فەرزەکان پێویست کران، وە حەجیش لە دوادوای تەمەنی پێغەمبەردا، پێویست کرا.

بەڵێ شەریعەتی خوای کاربەجێی بەرجەستە لە قورئان و سوننەت دا، لە عیبادەتەوە بگرە، هەتا جیهاد وجێبەجێ کردنی سزا شەرعییەکان و، مەسەلەکانی



سیاسەتی نێوخۆ و دەرەکیی (السياسه الداخلية والخارجية) هەمووی قۆناغ قۆناغ و پلە بە پلە بۆ پێغەمبەر عليه الصلاة والسلام هاتۆتە خوارەوە و، پێغەمبەریش عليه الصلاة والسلام ئەو کۆمەڵگایەی خۆی پێ پەروەردەکردوە و چاك کردوە و، پێی چاکسازیی (إصلاح) کردوە، بەو شێوەیەی خوای پەروەردگار فەرمانی پێ کردوە.

ئنجا دیارە ئەو کۆمەڵگا و دەوروبەرانەش، کە ئێمە دەمانەوێ کتێب و شەریعەتی خوایان تێدا حاکم بکەین، تاکو لە دنیا و دوارۆژدا بەختەوەربن، ئەو کۆمەڵگایانەش، کۆمەڵگایەك بۆ کۆمەڵگایەکی دیکە جیاوازیی هەیە، بگرە یەك کۆمەڵگاش لە قۆناغێك بۆ قۆناغێك جیاوازیی هەیە، بۆیە دەبێ بزانین، کە هەر کۆمەڵگا و هەر قۆناغە، جۆرە میکانیزمێکی تایبەتی پێویستە و، جۆرە شێوازێکی کارکردنی سەربەخۆی دەوێ، بۆ نموونە: وڵاتێکی وەك (مصر) شێوەی کارکردنی ئەوێ بە کەڵکی ئێرە نایەت و، هی ئێرەش بە کەڵکی شوێنێکی دیکە نایەت و، هی پاکستان بە کەڵکی تورکیا نایەت و...هتد.



**كورتەی قسان:**

شێوەی کارکردنمان بۆ ئیسلام و، شێوەی هەوڵدانمان بۆ ئەوەی کتێبی خوا بکەین بە حاکم و فەرمانڕەوا بەسەر ژیانی خەڵك دا و، بیکەین بە دادوەر بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان، بە تەئکید پێویستی بە چاك خوێندنەوەی ئەو واقیعە دەکا، کە تێیدا دەژین، دواییش بەرنامە ڕێژییەکی ورد و قووڵی پێویستە و پێویستیی بە ورد بینیی و دووربینیی دەکات و، پێویستیی بە وریایی دەکات.

خوای بەخشندە بە لوتف و کەڕەمی خۆی لەو کەسانەمان بگێڕێ، کە بەو شێوەیە لەگەڵ کتێبی خوادا، هەڵس وکەوت دەکەن، کە بۆخۆی پێی خۆشە، هەر لەبەر گەورە گرتنی قورئان و ئەدەب نواندن لە بەرانبەری دا و، خۆشویستنی و ڕێزلێ گرتنی و، و خوێندنەوە و گوێ لێ گرتنی، و بیر لێکردنەوەی و پێ کارتێکراو بوون و بەهرە لێ وەرگرتنی و، گەردن بۆ کەچ کردن و شوێنکەوتنی و، تەزکیە پێ کردنی خەڵك و کۆمەڵگا و فێرکردنی شەریعەتیانەوە بگرە، هەتا چاکسازیی و جێ بەجێ کردنی شەریعەت، لە هەموو بوارەکانی ژیان و گوزەرانیاندا.

سبحان ربك العزة عما يصفون

وسلام على المرسلين، و الحمدلله رب العالمين

دوا پێداچوونەوە:

١٨ ذي الحجـــة ١٤٣٦ کۆچـی

٢ تشرینی یەکەم ٢٠١٥ زاینی

هـــەولـێر

# نێوەڕۆك



## بەشی دووەم





## ئەم كتێبە

باسی چۆنیەتی : { لە خزمەت قورئان دا بوون } دەكات،

### چ وەك:

ناسین و پێ ئاشنابوونی زیاتری :
ناو و سیفەتەكانی
ئامانجی نێررانی
چۆنیەتی دابەزێنرانی
ڕیزبەندیی سووڕەت و ئایەتەكانی
چۆنیەتی نووسینەوە و كۆكردنەوەی
پێگەی قورئان لە ئیسلام دا
ئیمان پێهێنان و متمانە پێكردنی

### وە چ وەك:

باشتر لێ بەهرەمەند بوونی بە هۆی:
ئەدەب نواندن و بە گەورەگرتنی و
خوێندنەوە و گوێ بۆ گرتنی و
بیر لێكردنەوە و تێوەڕامانی و
پێ كارتێكرانی و پەند لێ وەرگرتنی و
شوێنكەوتنی و مل بۆ كەچكردنی و
تەزكیە پێكردنی و فێركردنی و
چاكسازیی پێكردنی و حكومڕان كردنییەوە.



نوسینگەی تەفسیر
بۆ بڵاوكردنەوەو ڕاگەیاندن
هەولێر - شەقامی دادگا - ژێر هوتێلی شیرین پالاس
+964 750 818 08 66
www.al-tafseer.com
tafseeroffice@yahoo.com

COVER DESIGN

    /TafseerOffice

4000 دینار